# تەفسیری زمناکۆیی

بەقەڵەمی

مەلا سعیدی زمناکۆیی

جزمی ﴿٣ ، بەشێك لە ٤﴾

بەرگی سێهەم



**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

**سوپاس بۆ خوای هەموو بونەوەران**

**درودی خودا لەسەرسەرداری هەموو پێغەمبەران وە لەسەر یارو یاوەرانی هەتا کۆتایی دەوران، لە دووای سوپاس بۆ خوا.**

خوای گەورە لە ئایەتی (٢٥٢) دا ڕووی کردە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بە فەرمودەی خۆی. کە بە ڕاستی تۆ لە فروستادەکانی، دووابەدووای ئەوە کوتوپڕ ئەفەرموێ:﴿ تِلْكَ الرّسُلُ ﴾ یانێ ئەو فروستادا نەکە هەموو پێغەمەرانی، موحەمەد یەکێکە لەوان، نەك مەبەست کۆمەڵێ بێ لەوان. هەموو پێغەمەران لە بارەی ڕووانگەو لەڕەوا نەکردندا یەکسانن. بەڵام لە هەڵبژاردنی خوادا بۆ گەیاندنی پەیام و ڕانموبی ئادەمیزادا جیاوازی لە نێوانیا هەیە. ئەوەی ڕاستی بێ کۆمەڵێ لە پێغەمەران ناوبانگیان دەرکردووە بە هەندێ ناز ناو بە تایبەتی جگە لەوانی تر، بۆ وێنە ئیبراهیم بە دۆستی خوا. موسا بەهاو وێژەی خوا. عیسا بە گیان بەرکراوی خوا. موحومەد بە مۆری خوا و کۆتایی پێغەمەران. ئەو فروستادانە هەمویان تووشی گیرگرفتی زۆربوون و ئارامیان گرتووە. کەواتە ئەی موحەمەد تۆیش ئارام بگرە وەك ئەوان، چۆن ئەوان سەرکەوتن تۆیش سەر ئەکەویی، بۆیە دوبارە ڕوئەکاتەوە پێغەمەر و ئەفەرموێ:

تِلْكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَٰتٍ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ

وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ۗ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلَ ٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ وَلَٰكِنِ ٱخْتَلَفُوا۟ فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلُوا۟ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿٢٥٣﴾

﴿ تِلْكَ الرّسُلُ ﴾ ئەو فروستادانە ناویـان بـرا لـەم سـورەتەداو لـە قورئـاندا، تۆیـش موحەمەد یەکێکی لەوان، هەمووتان خاوەنی ڕێـزن و نـێردراوی خـوان و هـەمووتان بـێ گوناهن، هەرشتێ بلێن سروشەو لەلایەن خواوە بۆتان هاتووە.

﴿ فَضّلنا بَعْضَهُمْ عَلى بَعْضٍ ﴾ ئێمە ڕێزی هەندێکیانمان داوە بەسەر هـەندێ تریانـا لـە هەندێ کاری تایبەتیدا، هەندێکیان خۆڕاگرو بە کۆشش ترن لەوانی تر لەو کارەدا بـەوان سپێردراوە و بە ئارامترن.

﴿ مِنْهُمْ مَنْ كَلّمَ الله ﴾ لەو فروسـتادانەیەك کەسـێ خـوا گفتوگـۆی لەگـەڵ کـردوە ڕاستەو خۆبەبێ هۆیە لەنێو خواو ئەواندا، وەك ئادەم لە بەهەشـتاو، موسـا لەسـەر کێـوی قوڕو، موحەمەد لەشەوی میعراجدا، هەر چەندە واباوە گفتوگۆ لەگەڵ کراو هەر موسایە.

﴿ وَرَفَـعَ بَعْضَـهُمْ دَرَجـاتٍ ﴾ وە خـوا هـەندێ لـەو فروسـتادانەی بەرزکردوەتـــەوە بەچەندین پلەیە، وەك ئەو فروستادانە خاوەنی کۆششی زۆری بەردەوامن و ناویان بە ئـارام گرتن دەرچوە. ئەوانەیش بریتین لە نوح و ئیبراهیم و موساو عیسا و موحەمەد.

گەلی ئیسلام بە گشـتی پێـك هـاتوون لەسـەر ئـەوەی فروسـتادەکان هـەندێکیان لـە هەندێکیان گەورەترن و، لەسەر ئەوەیش موحەمەد لە هەموویان گەورەترە، بۆیـە زۆربـەی

زانایان ئەڵێن: مەبەست لە ناوەڕۆکی ئەو ڕستەیە پێغەمەری ئیسلامە بە تەنها، هەروەها پێشەوا فەخری ڕازی (١٩) نۆزدە بەڵگەی لەسەر گەورەیی پێغەمەر هێناوەتەوە ماناکردنی ئەو ڕستەیە بەو جۆرە بیروبۆچوونی زوربەی زانایان مانای ئەو ڕستە بۆ ئەوەیە مەبەست پێغەمەری ئیسلامێ بە تەنها.

﴿ وآتَيْنا عِيسى أبْنَ مريم الْبَيْنات ﴾ وە ئێمە بەخشیومانە بە عیسا کوڕی مریەم چەندین بەڵگەو نیشانەی ئاشکرا لەسەر فروستادەیی ئەو، وەك زیندووکردنەوەی مردووان و چاك کردنەوەی لاڵ و بەڵەکاوی زۆرترین کاری بەهەموو کەس نەکراوی تر.

﴿ وأَيَدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ ﴾ وە ئێمە عیسامان بەهێز کردو پشتیوانیمان کرد بە هۆی گیانێکی پاك و پیرۆزەوە. خوا بەبێ باوك ئەو گیانەی کرد بەبەری عیسادا لە منالّدانی مریەمدا، بە جۆرێ بتوانێ سەرۆکایەتی گەلی ئیسرائیل بکاو ڕانومووییان بۆلای چاکە، لە ئایەتی (٨٧) هەشتاو حەوتی سورەتی ئەلبەقەرە بە درێژی باسی مانای ﴿ رُوحُ الْقُدُس ﴾ کراوە، خوای گەورە ئەو ڕێزە گەورەیەی بەخشی بە عیسا هەتا بۆ جولەکەکان دەربکەوێ ئەو عیسایە ئەوان بەبێ نرخ تەماشایان ئەکرد ئەو پلە گەورەیەی دراوەتێ.

لەو کاتەدا ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە چەن بیروباوەڕێکی پڕوپوچ و ئەفسانە ئەسوڕانەوە بە دەوری عیسادا، ئەبێژرا عیسا پەیدابوە، لە جوتبوونی خوا لەگەڵ ئادەمیزاد، یا عیسا جوێ بوەتەوە لە سروشتی خوا بە جۆرێ تووا وەتەوە کە ئادەمیزادیەکەی نەماوە، بە وێنەی توانەوەی دڵۆپە ئاوێ لە پەرداخێکا، هەروەها شتی تریش ، بەو بۆنەوە لە نێو ڕۆمانیەکاندا ڕوباری خوێنی جەنگ پەیدابوو، هەر لەبەر ئەوانەیشە خوای گەورە، باسی عیسا ئەفەرموێ و ناوی ئەبا بە ئادەمیزادو بە کوڕی مەریەم بۆتارو مارکردنی ئەو بیروباوەڕە خراپە.

لە کاتێکا کە پێغەمەران درودی خوایان لێبێ هەندێکیان لە هەندێ تریان بەرێز ترن بەڵام سەرچاوەی هەموویان هەریەکەو هەموویان فروستادەی خوان ئەبوایە نەتەوەکانیان

دژی یەکتری نەوەستانایە، کەچی پاش پێغەمەرەکانیان بیرو باوەڕی دژی یەکتریان دروستکرد، بەو بۆنەوە هەندێکیان باوەڕیان هێناو هەندێکیان بێ باوەڕ بوون. لە ئەنجامدا دەستیان دایە جەنگ و ناکۆکی لە نێوان خۆیانا، وە ئەو جەنگ و دژی یەکتری وەستانە بەبێ ویستی خوا نەبووە، هەموو شتێ لەنێو بونەوەران پەیدا ببێ بە گوێرەی ویستی خوایە. ئادەمیزاد ڕێگەی ڕانمویان و یاخی بوونیان بۆ ڕوون کراوەتەوە لەلایەن خوای گەورەوە بە هۆی ئەقڵ و هێزێ بەوان دراوە، ئەتوانن یەکێ لە ڕانمویی و یاخی بوون هەڵبژێرن بۆخۆیان و بیکەن بەرێ ڕەو، ئەوە لەلایەکەوە، لە لایێ ترەوە هەموو شتێ بەویستی خوا پەیدا ئەبێ، بۆیە خوا ئەفەرموێ.

﴿ وَلَوْ شاءَ اللهُ ما أقْتَتلَ الْذينَ من بَعْدِهِمْ مِنْ بَعْدما جاءَ تُهُمُ الْبَيْناتُ ﴾ وە ئەگەر خودا ئارەزووی هەبوایە جەنگیان نەکردایە جەنگیان نەئەکرد. یانێ ئەگەر خوا بیویستایە ڕانمویی هەموو ئادەمیزادی ئەکردو باوەڕیان ئەهێنا بە پێغەمەران. کەواتە ناکۆکیان لێی پەیدا نەئەبوو جەنگیان لەگەڵ یەکتری نەئەکرد کەسانێکی ئەوتۆ لە دوای پێغەمەرەکانیان کە موسا و عیسا بوون، لە پاش ئەوەی هاتبوو بۆلایان چەندین بەڵگەو نیشانەی ڕوون لەسەر فروستادەیی پێغەمەرەکانیان.

﴿ وَلكِن أخْتَلَفُوا ﴾ وە بەڵام نەی ویست جەنگیان نەبێ، چونکە گەلەکانیان ناکۆك بوون لە نێو خۆیانا بە ناکۆکی زۆر خراپ. یانێ پێغەمەران پاش ئەوەی هاتن بۆلایان و هەمو شتی بۆ ڕوون کردنەوە بە بەڵگەو نیشانەی زۆر، گەلەکانیان دەستیان دایە ناکۆکی لە دووای پێغەمەرەکانیان، بە ئارەزۆی خۆیان.

﴿ فَمِنْهُمْ مَنْ أمَنَ وَمِنْهُمْ مَنْ كَفَرَ ﴾ دوایی هەندێ لەوان باوەڕیان هێناو لەسەر باوەڕی خۆیان مانەوە، لە ئایین و لە پێغەمەرەکانیان وازیان نەهێنا، وە هەندێکیان باوەڕیان نەهێنا وازیان هێنا لە ئایینی پێغەمەرەکانیان، وە ڕێگەی ڕاستیان وون کرد، وەك جولەکەو گاورەکانی پاش موسا و عیسا، وەنامەکانی خۆیانیان گۆڕی و دەست کاریان کردن.

﴿ وَلَوْ شاءَ اللهُ ما أقْتَلُوا وَلكِنّ اللهَ يَفْعَلُ ما يُريدُ ﴾ وە ئەگەر خوا بیویستایە ڕانموییان بکا، ناکۆکیان نەئەبوو، جەنگیان نەئەکرد، خوای مەزن هەر شتێ ویستی بیکا ئەیکا لە

گومڕای و سەر لێی شێوان و خۆ پاراستن و ڕانموییی، بە جۆرێ شیاویی کردەوەی ئادەمیزادبێ خوای گەورە ڕستەی ﴿ وَلَوْ شاءَ اللهُ ما أقْتَتَلُوا ﴾ دووپات کردوەتەوە، بۆ ئەوی ئەو گومانە بنەبڕبکرێ کە ئادەمیزاد خۆیان جەنگ و ناکۆکی دروست ئەکەن بەبێ ویستی خوای گەورە ، بەکورتی ئادەمیزاد لە بیروباوەڕی ڕاستیدا هەموویان یەکبوون، لە دواییدا یەك لە دووای یەك پێغەمەرانی نارد، موژدەیان ئەدا بە ئادەمیزاد بە کردنی چاکەو ترسانیان لە کردنی کاری خراپ، خوای گەورەیش خراپەو چاکەی بۆ ڕوون کردنەوە، بۆ جۆرێ ئەیفەرموو: ئەو شتە قەدەغەیە لەسەرتان، ئەوەیان ڕەوایە بۆتان. لە پاشا ئادەمیزاد بە ئارەزۆی هەڵبژاردەی خۆیان هەندێکیان ڕێگەی دۆستایەتی و خۆشەویستیان گرتە پێش خۆیان وازیان لە ناکۆکی و جەنگ هێنا، هەندێ تریان ڕێگەی چەوت و ئاژاوەو جەنگیان بۆخۆیان هەڵبژارد وازیان لە خواپرستی هێنا. کەواتە هەموو شتێ بە ویستی خوایە. بەڵام بە دەستی ئادەمیزادە هەڵبژاردن و دیاری کردنی یەکێك لە ڕێگەی چاکەو خراپە.

پا ش ئەوە خوا ڕوونی کردەوە کە پێغەمەرانی ناردووە، هەندێکیان بەڕێزترن لە هەندێ تریان، ڕونیشی کردەوە نەتەوەکانیان توشی دووبەرەکی ئەبن، تاقمێکیان باوەڕدارو تاقمێ تریان بێ باوەڕ، بەو بۆنەوە دەست ئەدەنە جەنگ کردن، لەو کاتەدا باوەڕداران پێویستە لەسەریان لەبیرو باوەڕی ئاینی خۆیان بەرگری بکەن و، ئەوەیش بەبێ چەك و ئازوقە ناکرێ، بۆیە خوای گەورە فەرمان ئەدا بە موسڵمانان و هانیان ئەدا کە دارایی و سامانی خۆیان ببەخشن بەکار بەدەستان بۆ ئەو مەبەستەو، ئەفەرموێ:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا شَفَٰعَةٌ ۗ وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٥٤﴾

﴿ يا أيُها الْذينَ أمنُوا أنْفِقُوا مِمّا رَزَقْناكُمْ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە بە خواو بە قورئان و بە پێغەمەرو بە ڕۆژی دووایی: ئێوە ببەخشن لەشتێ ئێمە بەخشیومانە بە ئێوە، بیکەن بە یارمەتی و یاریدەی جەنگاوەرانیباوەڕدار، بۆیە بەر هەڵستی لەستەم و لە دەست درێژی بێ باوەڕان بۆ سەرتان. ئەو بەخشراوە لێرەدا زەکات و چاکەی تریش ئەگرێتەوە.

﴿ مِنْ قَبْلِ أن يأْتي يَوْمٌ ﴾ لە پێش ئەوەی بێت بۆلاتان ڕۆژێکی سامناك و ترسێنەر کە ڕۆژی دوای و ڕۆژی یاداشت و سزایە.

﴿ لا بَيْعٌ فيهِ وَلا خُلَّةٌ وَلا شَفاعَةٌ ﴾ نە کڕین و فرۆشتن هەیە لەو ڕۆژەداو نە دۆستایەتی هەیەو، نەپاڕانەوە هەیە لەلایەن هیچ کەسێکەوە، هەتا ئەوانە بتان پارێزن لەسزاو تۆڵەی کردەوەکانتان لەو ڕۆژەدا.

﴿ وَالْكافِرُون هُم الظالِمون ﴾ وەبێ باوەڕان هەر ئەو کەسانەن ستەمیان لە خۆیان کردوە کە دارایی خۆیان نابەخشن بە جەنگاوەرانی باوەڕدار.

بەو ئایەتە پیرۆزە بۆمان دەرکەوت ئەو نەخۆشیە نالەبارەو ئەو پەنجە شێرەی بوەتە هۆی لاوزای موسڵمانان و پشت کردنیان لە یاسای ئیسلام و نایکەن بە یاسای خۆیان بۆ ژیانی ڕۆژانەیان، هەر ئەوانەیە بێ باوەڕان و داگیرکەران بە هەلیان زانی، خۆیانیان کێشایە نێو نیشتمانی موسڵمانان. ئەو کەسانەی بە خوێنی خۆیان یاسای ئیسلامیان ئەپاراست، ئێمە بە ئاسانی دامانە دەستی بێ باوەڕان و هەوڵیان خستەکار چاکترین یاسای ئیسلامیان لەبیر بردینەوە، خراپترین یاسا دەست کردی خۆیان خستە جێگەی یاسای قورئان، بۆ ئەوەی موسڵمانان لە ئایینی خۆیان دوورخەنەوە، قورئان و فەرمودەکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لە تاقا دابنرێن و نەیان خەنەکار.

کاتێ لە ئایەتەکانی پێشوودا زانیمان خوا ڕێزی هەندێ لە پێغەمەرانی داوە بەسەر هەندێکیانا، هەندێ کیانی کردوە بە هاوویژەی خۆی و، پلەی هەندێ کیانی

بەرزکردوەتەوە، بەخشی بە عیسای کوڕی مەریەم چەندین بەڵگــەی ئاشـکرا لــە دواییـدا جولـەکەکان و گاورەکان پاش پێغەمەرەکانیان بـیرو بـاوەڕی پیسـی زۆریـان پـەیدا کـرد، دانیانە پاڵ خوای گەورە کاری ناشایستە، بت پەرستی لەنێو ئادەمیزاد پەرەی سـەند. لـەو کاتەدا خوا بە میهرەبانی خۆی پێغەمەری موسـڵمانانی نـارد بـۆ سـەر هـەموو ئـادەمیزاد، قورئانی پیرۆزی پێ بەخشی، هەتا بۆ ئادەمیزادی ڕوون بکاتەوە کە خوا تاك و تەنها بە، بـۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆلای ڕاستی و ڕێگەی ڕاست فەرمووی:

ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَاۚ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾

﴿ اللهُ لا إلهَ ﴾ خوایێ شایانی پەرستنێ، هیچ خوای تر نیــە شـایانی پەرسـتنێ، تـاك و تەنهایەو بێ وێنەیە و بێ هاوبەشە. خوایێ تر نیە،

﴿ إلا هُوَ الْحَيُّ القَيُّومْ ﴾ مەگەر هەر ئەو خوایە، زیندوە بەر لـە هــەموو شـتێ و، دوای هەموو شتێ ئەوپەڕی پایەدارو ڕاوەستاوە بۆ هەڵسوڕانی بونەوەران لـەیەکـەم کاتـەوە هـەتا

هەتایە، هەروا بوەو هەروایش ئەبێ. یانێ پێویستە ئێمە بڕوامان وابێ هەموو شتێ لە خواوەیە، هەندێکیان بەبێ هۆو ڕاستەوخۆ، وەك دروستكردنی بونەوەران یەكەم جارو زیندوكردنەوەی مردووان لەمەوپاش، و هەندێ تریان بە بۆنەی هۆیەكی بینراو، وەك ڕۆژگیران و باران و بومەلەرزەو منالبون و شتی تریش، ئەوانەیش هۆیە سەرەكیەكانن ڕاستەوخۆ دروست كراوی خوان.

ووشەی ﴿ الله ﴾ هەرخۆی بەلگەیە لەسەر یەكێتی خوا، چونكە ئەو ناوە كەسی تری پێ ناو نەبراوە، بەلگەیشە لەسەر ئەوە ئەو ووشەیە هەموو جۆرەكانی تواناو زانینی تێدایە، هەموو شتی چاك ئەگرێتەوە، وە ماناكەی بریتیە لە كەسێ هەموو شتی چاكی تێدابێ.

﴿ لا تأخُذُهُ سِنَةٌ ﴾ خوا وەنەوزنای گرێ و خەوەنوچكە نابا، یانی ئەو كەسەی وابێ پێویستە هەر زیندوبێ و ئاگای لە خۆی بێ هەموو كاتێ، ئەگینا ناتوانێ كاروباری بونەوەران بۆ هەموو كاتێ ببابەڕێوە. وە نەوز بریتیە لە خاوبوونەوەی دەمارەكان و قورسبوونی مێشك و پەیدا بوونی بێ هۆشی.

﴿ وَلا نَوْمٌ ﴾ وە خەویش نایگرێ بەو لاترەوە، خەو خاوبونەوەی دەمارەكانی لەش بە تەواویی. یانێ خوا بۆ هەموو كاتێ ئاگادارە، بێ ئاگایی بەسەردا نایە، بە پێچەوانەوە، هەلسوڕاندنی بونەوەران توشی لەناوچونی یەك جاری ئەبن، بۆ ئەوەی بە باشی بزانرێ هەر خوا شایانی پەرستنە و زیندوو ڕاوەستاوە بۆ بەڕێوەبردنی بونەوەران.بۆ ئەوەی بزانرێ خوا وەنەوزو خەو ناگرێ ، خوا ئەفەرموێ:

﴿ لَهُ ما فِي الْسَماواتِ وَما فِي ألأرْضِ ﴾ هەر بۆ خوایە هەلسوڕاندن و دروستكردن و بەخاوەن كردن و بەڕێوەبردنی ئەو شتەی لەنێو ئاسمانەكاندایەو، ئەو شتەی لە نێو زەویدایە، ئیتر چۆن ئەبێ خوا زیندوو ڕاوەستاو نەبێ، وەخەووو وەنەوز بیگرێ.

﴿ مَنْ ذَا الْذي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إلاّ بأذْنِهِ ﴾ چ كەسێكە ئەو كەسەی ئەوتۆ بپاڕێتەوە لە خزمەت خودا لە ڕۆژی دووایدا لە پێغەمەران و فریشتەكان و كەسانی تر؟ هیچ كەسێ نیە

مەگەر بە هۆی دەستورو ویستی خوا. یانێ بەبێ دەستوری خوا کەس ناتوانێ بۆ کەسێ تـر بپاڕێتەوە بەو ڕستەیە گفتوگۆی بت پەرستان پوچ ئەبێ کەبتـەکان و فریشـتەکان نزیکیـان ئەخەنەوە لەخوا، یانی لە جێگەیەك پێغەمەران و فریشتەکان توانای پاڕانەوەیان نەبێ بتەکان ئەتوانن چ شتێ بکەن؟.

لە مانای ئایەتی (٤٨)ی سورەتی ئەلبەقەرەدا باسی پاڕانەوە لە خزمەت خوادا کراوە بە درێژی: بۆ ئەوە باش تێ بگەن تەماشای ئەو جێگەیە بکـەن، گرنگـترین شـتێ ببێتـە هـۆی ڕزگاری ئادەمیزاد کردەوەی خۆییتی.

﴿ يَعْلَمُ ما بَيْنَ أَيْدِهِمْ ﴾ خوا ئـەزانێ بەشـتێ دروسـتی کـردووە بـەر لـە دانیشـتوانی ئاسمانەکان و زەوی پەیدابوونیان لە خۆیان و هەموو کارو کردەوەیان.

﴿ وَما خَلْفَهُمْ ﴾ وە ئەزانێ بەشتێ پا ش ئەوان پەیدا بوەو پەیدا ئەبێ لە جیـهاندا، ئیـتر ئێوە بیان بینن یا نە؟ لە کاروبارو بەڕێوەبردنیان و بەسەرهاتیان لە ئەمڕۆو لەمـەو دوایـش، ئەزانێ چ شتێ بوەو چ شتێ ئەبێ لە چاکەو لە خراپە، و چ کەسێ شـایانی پاڕانەوەیـە، چ کەسێ شایان نیە؟ لە چ کەسێ خۆ ش ئەبێ؟ لەوانە ڕێگەو شـوێنی پاڕانـەوە بەسـتراوە بـە ویستی خواو فەرمانی خواوە بە ویستی ئەو ئەکرێتەوە.

﴿ وَلا يُحيطُونَ بشيءٍ مِنْ عِلْمِهِ ﴾ وە بەندەکانی خوا لە پێغەمەران و لە فریشتەو پیـاو چاکان و زانایان نازانن بە هیچ شتێ لە زانراوەکانی خواو ئاگایان لەوان نیە.

﴿ إلا بِما شاء ﴾ مەگەر بەهۆی شتی خوا ئارەزووی بکاو ئاگاداریان بکـا لەسـەر ئـەو شتە کە بیزانن کەواتە هەر خوا هەمووشتێ ئەزانێ. ئەگەر کەسـێ تـر لـە ئـادەمیزاد شـتێ بزانێ پێویستە بەویستی خوابێ، بۆیە هەر خوایە شایانی پەرستن و کوڕنوش بۆ بردنـە. نـەك بونەوەران، بە تایبەتی بتەکان و گاودارو فریشتەو ئادەمیزاد.

﴿ وَسِعَ كُرسِيّه السّماواتِ وَالأَرْضَ ﴾ دەسـتەڵات و توانـاو زانیـاری و بـەخێوکردنی فراوانی خوا ئاسمان و زەویی و دانیشـتوانی ناویـان و سـەریان ئەگرێتـەوە، لـە تاریکـترین

جێگەو لوسترین شوێندا بچوکترین جانەوەر ئەبینێ و چرکەی ئەبیستێ و خواردەمەنی ئەداتێ، لە گرنگترین جێگەو سامناکترین شوێندا بە دەستەلاَت ترین مرۆڤ لە دەستی دەرناچێ و لەسەر تەوقی سەر ئەیدا بە زەویدا لەهەر کاتێکا بیەوێ.

زانایان لە ماناکردنی ووشەی (کورسی) بیریان جیاوازە، وە چاکترین مانایان ئەوەیە کە کورسی هێمایە لە توانای خواو، هێمایە لە زانستی خوا یانێ زانستی خوا هەمووشتێ ئەگرێتەوە.

﴿ وَلا يَؤُودُهُ حِفْظُهُما ﴾ وەخوا ماندو ناکاو گران نیە لەسەری ئاگاداری و پاراستنی ئاسمانەکان و زەویی و ئەو شتانە لەنێو ئەواندان.

﴿ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ ﴾ وەهەر خوا بەرزترو بالاَترە لەهەموو بونەوەران، بەسەر هەموویانەوە بەبێ ژمارەو بەبێ ئەندازە، لەبەرزی تواناادا لەسەر هەموو شتێ وێنەی بۆنیە، گەورەترە لە هەموو کەسێ، هەموو شتێ بەرانبەر بە گەورەیی خوا نرخی بۆ دانانرێ.

مانای ئەو ئایەتە بەو جۆرەی کرا چاکترین مانایە. یانێ کورسی بە مانا توانایە یا بەمانا زانستە. بە وێنەی ئەوەی ئەبێژێ پاشا کورسیەکەی جێگەی خۆی گرت دەستەلاَت و زانستی خوایش جێگەی خۆی گرتووە.

ئەو ئایەتە پێی ئەوترێ ئایەتەل کورسی گەورەترین ئایەتی قورئانی پیرۆزە، چونکە یەکێتی خوا لەو ئایەتەدا بە زۆری دەرئەکەوێ لەوەی لە ئایەتەکانی تردایە، مەبەست لە قورئان زانین و زانیاریە، گەورەترین زانین ناسینی خواو کارو کردەوەی خوایە، ئەو ئایەتە هەموو ئەوانەی تێدایەو، بەبێ ناسینی خوا هیچ شتێ سودی لێ وەرناگیرێ کە لە ئایەتەکانی تردا، باسی ئەکرێ، بۆیە فەرماندراوە بە موسڵمانان پاش هەموو نوێژێ و بۆ هەموو ڕوداوێ بخوێنرێ ئایەتەل کورسی، وەوا چاکە نەك پێویستە.

کاتێ خوای گەورە ڕوونی کردەوە بۆ ئادەمیزاد بەڵگەکان لەسەر یەکێتی خۆی و هەموو کاروکردەوەو توانای خۆی، ڕوونی ئەکاتەوە بەم ئایەتەی دووایی نابێ توندو تیژی

و زۆر و دارو کۆت و بەند کـردن بەکاربـهێنرێ لەگـەڵ هیـچ کەسـێ بـۆ باوەڕهێنـان، ئەگێڕنەوە سالمی کوڕی عەوفی دانیشتوویی مەدینە دوو کوڕی هەبوون و بـوون بـە گـاور بەر لە هاتنی ئاینی ئیسلام، باوکەکەیان ووتـی: وازیـان لێ نـاهێنم هـەتا موسـڵمان ئـەبن. کوڕەکانی نەیان ئەویست موسڵمان بن، ڕوداوەکەیان بـردە خزمـەت پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ وە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە فەرمووی:

لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾ ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخۡرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِۗ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٥٧﴾

﴿ لا إكراهَ في الدين ﴾ هیچ جۆرە زۆررو تەوزمێ نیە لە ئاییندا بۆ باوەڕهێنان. کەواتـە ئـەمڕۆ نابێ زۆر لـە هیـچ کەسـێ بکـرێ بـۆ وەرگرتنـی ئـایینی ئیسـلام کـە ڕۆژی تاقیکردنەوەیە، ئادەمیزاد بە ئەقڵی خۆیان ڕێگە بۆخۆیان دیاری ئەکەن. واتە بـیرو بـاوەڕو

ئایین پێویستە ئادەمیزاد خۆیان بۆ خۆیان بە گوێرەی ئەقڵی خۆیان بیسەلمێنن وورەی بگرن هەتا بێتە جێگەی باوەڕو خۆیانی بۆ بدەن بە کوشت بێ زۆر لێ کردن. نەك وەك کار بەدەستانی ڕۆمانیەکان دارو ئاگرو ئاسنیان بەکار ئەهێنا لەگەڵ گاورەکان بەر لەوەی قوستەنتین ببێ بە گاور، ئەویش هەمان کارو کردەوە، بەکار ئەهێنا لە دژی ئەو کەسانە نەئەبون بە گاور، هەروەك ئەم سەردەمە ئەو کەسەی نەبێ بە ئەندامی پارتێ ئەبێ خۆی دابنێ بۆ کوشتن و بەندو تازیانەو تێ هەڵدان و شوشەتێ بڕین و ئابڕوبردن. بە تایبەتی ئەگەر ئەو پارتە کار بەدەستی ئەو جێگەیە بێ.

بەڵام ئیسلام و ئایینەکەی باڵی میهرەبانی و سەربەستی کێشا بەسەر ئادەمیزادا، یەکەمین جاری خۆی بڵاوکردەوە فەرمووی: زۆرینە بۆ وەرگرتنی بیروباوەڕ، بەو فەرمودەیە ڕێزی ئادەمیزادی بەرزکردەوە، وەرگرتنی ئایینی دا بەدەست ویست و هەستی خۆیان، وازی لێ هێنا هەتا خۆی یەکێ لە ڕاێموویی یا یاخی بوون بۆ خۆیان هەڵبژێرن، بە ئارەزوی خۆیان چاکە بدەن بە کۆڵی خۆیانا، وەیا خراپە هەڵبژێرن.

ئەو ئازادی و سەربەستی‌یە کە ئیسلام داوای ئەکا کاربەدەست و پارتە خوێن مژەکانی گەل لەم خولەی بیستەمەدا لە دژی هەڵساون بە هەموو هێزیانەوە، نایەڵن ئادەمیزاد خۆیان بۆخۆیان بژین بەو شێوەیە خوا بۆی داناون، یا ئەبێ بێ باوەڕ بە بیروباوەڕی خراپ و ڕەگەز پەرستی و خوێن مژینەکەیان بهێنن، یان ئەبێ خۆیان دابنێنن بۆ کوشتن لە سەدا هەشتا، بۆ بەندیخانەو تێ هەڵدان و داخ و هەڵواسین و دەست درێژی بۆسەر ئابڕویان بێگومان سەربەستی یەکەمین بڕوایە بۆمافی ئادەمیزاد کە بەو مافەوە ئادەمیزاد پێی ئەوترێ ئادەمیزادو جوێ ئەبێتەوە لە ئاژەڵ، هەر کەسێ بیروباوەڕ لە ئادەمیزاد و زەوت بکا واتە ڕووتی کردوەتەوە لە ئادەمیزادی. لە ئەنجامی زەوت کردنی سەربەستی ئاسایش لەناو ئەچێ و باوی نامێنێ، سەربەستی جگە لەناو ناوەڕۆکی نابێ. لەم سەردەمەدا هەموو کاربەدەستانی هەموو شوێنێ ناوی بیروباوەڕی خۆیان ئەبەن بە دیموکراتی و سەربەستی و

شۆڕش گێڕ، جگە لە شۆڕشی ئەوانی تریان پوچن. بەڵام شۆڕشەکەیان ئەخەنە کار بۆ نەمانی بیروباوەڕی گەلان، هەر بۆ خزمەتی ڕەگەز پەرستی و بیروباوەڕی خۆیان بێ ئەوەی ئاورێ بدەنەوە. کەواتە ئیسلام بەرزترین هۆیە بۆ بوونی مرۆڤ و بۆپایەداری سەربەستی، ڕاست ترین پەیڕەو بۆ ئادەمیزاد، هەر ئەویشە وەك بانگەواز ئەکاو ئەفەرموێ: زۆر لە ئایینیدا نیە، ئەفەرموێ: قەدەغەیە لەسەر موسڵمانان بەکارهێنانی زۆر لەسەر سەپاندنی ئاییندا. بەڵام ڕێبازو دەستوری دەست کردی کار بەدەستان و خوێن مژان و ڕەگەز پەرستان لەم ڕۆژەدا بە زۆر ئەی سەپێنن بەسەر ئادەمیزادا بیروباوەڕی خۆیان، هەرکەسێ دژیانبێ و بیەوێ لەسەر بیروباوەڕی خۆی بێ مافی ژیانی نیە.

زۆربەی زانایان ئەڵێن: ئەو ئایەتە هاتوە خوارەوە دەربارەی هەموو بێ باوەڕان کە نابێ زۆر لە هیچ کەسێ بکرێ بۆ وەرگرتنی ئایین. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: هاتوەتە خوارەوە دەربارەی جولەکەو گاورو بت پەرستەکان ئەوانە زۆریان لێ ناکرێ بۆ وەرگرتنی ئایینی ئیسلام. بەڵام بت پەرستانی عەرەب پێویستە باوەڕ بهێنن بە ئاینی ئیسلام یا بکوژرێن. هەروەها ئەوانەیش لە ئایینی وەر ئەگەڕێن یا ئەبێ بگەڕێنەوە بۆلای ئیسلام یا ئەبێ بکوژرێن. با ئەمەیشمان لەبیر نەچێ هەرچەندە لێرەدا خوا ئەفەرموێ: نابێ زۆر لە هیچ کەسێ بکرێ بۆ وەرگرتنی ئایین. بەڵام لە جێگەیە تردا جەنگ بەڕەوا فەرمانی پێ دراوە، یانێ بۆ بەرگری لە خۆیان و کاتی پەلاماردانیان و بنەبڕکردنی ستەم و گێرە شێوێنیەکەیان. وەك لە ئایەتی (١٩٣) لە سورەتی ئەلبەقەرەدا باسی کراوە.

﴿ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَىِّ ﴾ بەڕاستی ڕوون بوەتەوە ڕێگەی ڕاست و ڕانموییی و بەختیاری لەبێ باوڕی و گومڕایی، هەموو کارو گفتوگۆی چاك و شێوەی باوەڕهێنان بەبێ گومان و، بەڵگە ڕون کراوەتەوە لەلایەن خوای گەورەوە بە جۆری بیانوی بێ باوەڕان نەمێنێ، ئیتر بۆ ئەبێ زۆریان لێ بکرێ بۆ باوەڕهێنان.

﴿ فَمَنْ يَكْفُرْ بالطاغُوتِ وَيُؤمِنُ بِاللهِ ﴾ دووایی هەر کەسێ باوەڕ نەیەرێ بە تاغوتی یاخی بوو.

زانایان لە مانای تاغوتا زۆریان نوسیوە. بەلاّم ئەوەی شایانی باسێ بریتیە لـە هەرشتێ ببێتە هۆی یاخی بوون و دەرچوون لە ڕێگەی ڕاست، ئیتر شەیتانێ بابت، جیهانبێ یاکـار بەدەستان فالّ گرەوەبێ یا جادوگەرو خوێنەری دەست و شتی ترو، باوەڕ بە خوا بهێنێ لە هەموو ڕوێکەوە هەموو شتێ لە خواو بزانێ و کەس نەکا بە هاوبەشی خوا.

﴿ فَقَدْ اسْتَمْسَكَ بِالْعروةِ الْوثقى ﴾ دوایی بە ڕاستی ئەو کەسە خۆی نوساندوەو دەستی گرتووە بە بازنەی گورسێکی زۆر بەهێزو توند وا هەر کەسێ دەست پێ بگرێ ڕێگـە وون ناکا وەك بیرو باوەڕی بێگومان کە هەرکەسێ بیکـا بـە ئـایین بـۆ خـۆی ڕێگـەی چاکـەو بەختیاری و سەرکەوتنی هەردوو جیهانی وەرگرتوە.

﴿ لا أنْفِصامَ لَها ﴾ هیچ بچڕانێ بۆ ئەو گوریسە نیە. یانێ چۆن دەست گرتن بە بازنەی گوریس مرۆڤ ئەگەیەنێ بە ئاواتی خۆی، هەر کەسێکیش ئایینی ئیسلام بکا بـە بیروبـاوەڕ بۆخۆی بێگومان لە هەردوو جیهاندا بە ئاواتی خۆی ئەگا، مەگـەر ئـەو کەسـە خـۆی لـە خۆی تێك بداو واز لە ئایین و یاسای قورئان بهێنێ. وەك ئەم سەردەمەی ئێسـتا قورئانیـان ناوەتە تاقەوە، و بوون بە تۆپی بـێ بـاوەڕان، دەسـتیان گرتـووە بـە یاسـای ڕۆژهـەلاّت و ڕۆژئاواوە بە تایبەتی ئەمەریکای خوێن مژی گەلان و ڕوسیای بێ ئاین، وە بەریان داونەتـە خۆیان و خوێنی یەکتری ئەڕێژن بەناڕەوا، بۆ ئەوەی گەورە بێ باوەڕەکانیان بلێن: ئافـەرین شێری خۆمان بۆمان دەرکەوت وازتان هێناوە لـە یاسـای قورئانەکـەتان و شارسـتانیەتیان وەرگرتوە، کام شارستانی، ئارەق خواردنەوەو کوشتنی یەکتری و داوێن پیسی.

﴿ واللهُ سَمِيعٌ عَلِيمْ ﴾ وەخوا گفتوگۆی باوەڕدارانو بێ باوەڕان ئەبیسـتێ ئـەزانێ بـەو شتانە لە دلّی هەردوو لایاندایە، هەریەکەیان بە گوێرەی کارو کردەوەی خۆیان پاداشت و تۆلّە وەرئەگرن.

پاش ئەوەی خـوای گـەورە باسـی بـاوەڕدالران و بـێ بـاوەڕانی کـرد، بۆمـانی ڕوون ئەکاتەوە چ کەسێ دۆستی هەردولایانە وە ئەفەرموێ:

﴿ اللهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنوا ﴾ خوا دۆستی کەسانێکی ئەوتۆیە باوەڕیان هێناوە، وە سـەردارو سەرپەرشتی کەریانەو یاریدەیان ئەدا لە هەموو ڕوداوێکا لـە هـەردوو جیـهاندا، هـەروەها باوەڕدارانیش خوای گەورە بە سەرداری خۆیان دائەنێن، بۆیە خوا ئەفەرموێ:

﴿ يُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلْمَاتِ إِلى النّوُر ﴾ خوا باوەڕداران دەر ئەهێنێ لە تاریکیـەکانی بـێ باوەڕی و گومڕایی بۆلای ڕونـاکی و بـاوەڕو ڕانموویـی. یانـێ خـوا ڕانموویـی بـاوەڕدارانی کردووە بە بەڵگەو نیشانەی زۆر ئاشکرا. هانیان ئەدا بۆ ڕانموویی، وە بـە میـهرەبانی خـۆی کاری وای لەگەڵ کردوون کە کاری چاك و سوود بەخش بکەن بە هـۆی ئـەو شـتانەوە خوا لە بێ باوەڕی دەری هێناون بۆلای باوەڕ، چونکە گومڕایی و بێ باوەڕی ڕێگە ئەگرن لە زانین و ڕێگەی ڕاست، هەر وەك تاریکی ڕێگەی ئەگرن لە زانین و بینین.

ئەو زانایانە مانای ئەو ڕستانەی پێشویان کردوە لەم ئایەتەدا نـاکۆکی زۆریـان لێ پـەیدا بووە، هەندێکیان واتێ گەیشتوون خوا دۆست و سەرپەرشتی کەری باوەڕ دارانـە جگـەی بێ باوەڕان کەچی سەرپەرشتی و یاریدەی خوای گەورە هەموو بونەوەران ئەگرێتەوە، نـەك باوەڕداران بە تەنها، جا بۆیە ئەوکەسانە لە مانای ئەو ڕستانە نەگەیشتوون بە باشی. هەندێ لە زانایانی تر کە بەباشی لە ماناکان گەیشتوون فەرمویانـە: بێگومـان بـاوەڕداران جگـەی خوا کەسی تر ناکەن بە دۆست و سەرداری خۆیان، بەنامـەو فـەرمووە پێغەمـەر ڕانومـایی وەرئەگرن لە بیروباوەڕو کردەوەی خۆیانا، پشـت بـە یـاخی بـوون و گومڕانـی نابەسـتن ئەوپەڕی پلەیان بەرزبێ.

بە پێچەوانەی بێ باوەڕان ئەو کەسانەن تاغوت ئەکەن بە دۆست و سـەرداری خۆیـان. بێگومان ئەو کەسانە باوەڕیان بەخوا هێناوەو بە جیزن لەسەر پەرستنی خـواو ڕانومـایی بـە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بە دڵی پاك و بێ گەردەوە ئەو کەسانە بەبێوەیی و بە دڵ خۆشی

ئەژین بە کۆمەکی خواو یاریدەی خوا، ڕزگاریان ئەبێ لە تاریکی بێ باوەڕی و گومڕایی و نەزانین و هەوەس کاری، بە ڕوناکی خوا ناسینی ڕاستی و باوەڕی پاك ڕێگەی خۆیان ئەدۆزنەوە، وە ئەو مانایە بگرن و بەری مەدەن.

﴿ والّذِينَ كَفَرُوا أَوْلياؤُهُمُ الطّاغُوتُ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوەو ڕاستی ئەشارنەوە، بە تایبەتی جولەکەکان و دوور ڕوەکان و وەرگەڕاوان لە ئاینی ئیسلام، دۆستەکانیان و سەرپەرشتی‌کەریان و یاریدەریان تاغوتە، مانای تاغوت لە ئایەتی پێشوودا ڕابورد، بە کورتی مانای کەسێکە یاخی بووبێ لە خودا.

﴿ يَخْرِجُونَهُمْ مِنَ النّور إلى الظّلُماتِ ﴾ دۆستەکانیان کە تاغوتە دەریان ئەکەن لە ڕوناکی ئاینی ئیسلام بۆلای تاریکیەکانی بێ باوەڕی. یانێ بێ باوەڕان و کومڕاکان و یاخیەکان بە دۆستی خۆیان ئەزانن جگە لە خوا، هەر فەرمانێ ئەوان دەری کەن ئەمان بە گەرمی وەوری ئەگرن چاکبێ یا خراپ خۆ ڕونیشە دۆستە تاغوتەکەیان کاری نالەباریان بۆ ئەڕازێننەوە، بە ڕێگەی هەڵ دێرا ئەیانبن، فێری بێ باوەڕی و ستەم و داوێن پیسی و یاخی بونیان ئەکەن، زۆر شتی تریش.

﴿ أُولئِكَ أَصْحابُ النّاهُمْ فِيها خالِدُونَ ﴾ ئەو بێ باوەڕانە خۆیان و دۆستەکانیان دانیشتوی ئاگری دۆزەخن بەهۆی تاوانەکانیاەوە. ئەو کەسانە لە نێو ئاگردا بەردەوامن هەتا هەتایە نەك خاوەن باوەڕان.

خوای گەورە لە ئایەتی پێشودا ڕونی کردەوە کە بە ڕاستی باوەڕداران دۆستیان خوایە. وە ئەو کەسانە لە تاریکی بێ باوەڕی ئەچنە دەرەوە بۆلای ڕانومایی و باوەڕ. وەبێ باوەڕان دۆستەکانیان تاغونە، لە ڕوناکی ئەچنە دەرەوە بۆلای تاریکیەکان بێ باوەڕی.

لە پاش ئەو فەرمودەیە خوا بۆ پێغەمەری خۆی ئەگێڕێتەوە چیرۆکی باوەڕدارێکی وەك ئیبراهیم کە لە تاریکی گومان دەرچو بۆلای ڕوناکی باوەڕهێنان بەبێ گومان لەگەڵ

چیرۆکی بێ باوەڕێکی وا کە گفتوگۆ و دەمەدەمەی ئەکرد لەگەڵ ئیبراهیم، پاش ئەوەی ئەو بێ باوەڕە لە ڕوناکی باوەڕ دەرچوبو بۆلای تاریکی بێ باوەڕی، وەك خوا ئەفەرموێ:

أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِى حَآجَّ إِبْرَٰهِـۧمَ فِى رَبِّهِۦٓ أَنْ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّىَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحْىِۦ وَأُمِيتُ ۖ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأْتِى بِٱلشَّمْسِ مِنَ ٱلْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ ٱلْمَغْرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِى كَفَرَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٢٥٨﴾

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلى الْذي حاجَ إِبْراهِيمَ في رَبِّهِ ﴾ ئایا تۆ موحەمەد نەتزانیوەو نەتڕوانیوە بۆلای کەسێ ئەو تۆ دوژمنایەتی و چەنەبازی ئەکرد لە بارەی پەروەردەکەری ئیبراهیمەوەو لە بارەی بونیەوە ﴿ أنْ أتاهُ الله الْمُلْكَ ﴾ کە خوا بەخشیبوی بەو کەسە پاشایێتی و دارایی، بەو بۆنەوە لە خۆی بایی بوبو، لە بریتی ئەوەی سوپاسی خوا بکا کە پاشایێتی و سامانی پێداوە کەچی دوژمنایێتی خوای ئەکرد. دروستە گەڕانەوەی ڕاناوی ﴿ في ربّه ﴾ بۆلای ئەو کەسە یاخیەکەتانەی لە ئیبراهیم ئەدا. ئەو کەسەی جەنەبازی لەگەڵ ئیبراهیم ئەکرد خوای گەورە ناوی نەبردووە. بەڵام زانایان ئەڵێن: نەمرودی کوڕی کەنعانە کە ئیبراهیم بتەکانی شکاند ئەویش بانگی ئیبراهی کرد پێی ووت: تۆ خواکانی ئێمە بە پوچ دائەنێ، ئەی خوا تۆ چ کەسێکە؟ ﴿ وإذ قال إبْراهِيمَ رَبّيَ الذي يُحيْي ويُميتُ ﴾ ئەو کاتە ئیبراهیم ووتی لەوەڵامدا پەروەردەکەری من کەسێکی ئەوتۆیە بە توانای خۆی کەلە لەشی بونەوەراندا

زیندویێتی پێ بەخشیون، لە نەبونەوە هێناونیەتە بونەوە، ئەیشیان مرێنێ، لە بوونەوە نەبونیان ئەداتێ. یانێ ئیبراهیم داوای کرد لە دانیشتوان واز لە بێ باوەڕی بهێنن و لە یـاخی بـون دابەزن، باوەڕ بەداد پەروەری و یەکسانی ئادەمیزاد بکەن. کار بەدەسـتان و پایـە بلـندان چوون بە گژیاو، بەرەنگاریان کرد. نەك لەبەر ئەوەی داواکەی بە خـراپ بزانـن و بـەس. بەڵکو لەترسـی ئـەوەی لەناونـەچێ دەسـت کـەوتو سـودی تایبـەتی خۆیـان و مانـەوەی پلەکانیان، بۆیە یەکەم جار بـە جـۆری ئاسـایی لەگـەڵ ئیـبراهیم کەوتنـە وتووویـژی بـێ شەرمانە کە بۆیان دەرکەوت چاری ناکەن و بوریان خوارد، دەستیان دایە جەنگ لەگـەڵ ئیبراهیم، وە بڕیاریاندا کە بە ئاگر بسوتێنن.

بە تەواوی ئەو کارە نالـەبارەی ئـەوان وێنـەی داگیرکـەرانی ئـەمڕۆن، ئـەمانیش لـەم سەردەمەدا لە دژی گەلانی بێ تاوان یەکەم جار پڕوپاگەندە بلاو ئەکەنەوەە بـە ڕۆژنامـە و بەراگەیاندنی تر بۆ خەڵتاندنی دانیشتوان و، بـەکرێ گیراوەکانیـان دەهۆڵـی خراپیـان بـۆ ئەکوتن کە لەوانەدا شکستیان خوارد بە هەر چۆنێ بۆیان بلوێ ئـەو ڕژێمـەی کـە ئـەوان دژینی بیگۆڕن بە باری خۆیانا بە جەنگ و ئاژاوەنانەوە لە نێوانیانا بە هەزاران فێڵ و فڕ لـە ژێرەوە وەك ماری ژێری کاکە لەو کارە خراپانەیانا سەرنەکەوتن بە ئاشکرا پەلاماری ئـەو تاقمە بێ تاوانانە ئەدەن و جەنگیان لەگەڵ ئەکەن بە بۆنبای ناپاڵم و گازی خنکێنـەر، جا بۆیە موسڵمانان پێویستە لە خەویی مەرگ بێدار ببنەوە، ڕێزی خۆیان بە سـەپاندنی یاسـای قورئان بگێڕنەوە، بەو سامانە زۆرە هەیانە فێری زانین بن، دەرخـوارد دوژمنـانی خۆیانیـان نەدەن، بڕوا بە دۆستایەتی مار نەکەن، چونکە هەر کاتێ بۆیان هەڵکەوێ بە ڕوونی خۆیـان ئەیان برژێنن. چەوریەکەیان ئەگرن و ئەیکەن بە بۆن و خۆیانی پێ بـۆن خـۆش ئەکـەن بـۆ نمونـە لـە ڕۆژی ١٩٨٦/١/١٤ زایینـی کـار بـە دەسـتە مارکسـی پەرستەکانی یەمـەنی باشوربوون بە دوو تـاقم، دەسـتە و یەخـەی یـەکتری وەسـتان، پـەلاماری یـەکتریان داوە جەنگێکی خوێناوی لە ناو یەکتریدا پـەیدا کـرد، هـەتا ڕۆژی ١٩٨٦/١/٢٣ زۆرتـر لـە

یازدە هەزار کوژراویان هەیە، بە گوێرەی هەواڵدەری ناوخۆو دەرەوە لە جگە لـــە بریـنـدا ریان و ڕوخاندنی شارو دێهاتەکانیان، چەك و ئازوقەی جەنگیان کۆتایی پێ هات، هـــەموو ئەوانەیش بە هۆی هاندانی کار بەدەستە خوێن مژەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بـووە، ئـەوە لـە لایەکەوە لـە لایێ ترەوە بە هۆی واز هێنانیان لـە یاسای ئایینی ئیسلام، پشت کردنیان لـە شارستانێتی خۆیان و لاسایی و خزمەتکاری بێگانەوە، ئـــەبێ بۆچـی ئـەو جەنگـە بکـەن و دەست نەگرن بە فەرمودەی خوا، بۆ ئـــەبێ بـۆ چەسـپاندنی بیروبـاوەڕی خۆیـان جـەنگی قەدەغە بەکار بهێنن.

بۆ زانین: تەنها ئەوانـە باسـکران ئـەو کارانـە بەکارنایـەن، زۆر تـاقم هـەن ئـەو کـارە ناڕەوایانە بەکار ئەهێنن. بۆ وێنە: پارتی دیمکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان چوار جەنگ لـە نێوان هەردوولایانا پەیدا بـووە، بـە هـەزاران کـوژراو لـــە هـەردوویان و بەدەیان ئاوارە لـە هەردوولایان ڕوی داوە. بە داخەوە، لـە دوای ئەو جەنگانە تازە بـە تـازە دانیشتوون بۆ ئاشت بونەوەیان هەتا ئێسـتا زۆر لـــە (٥٠) دانیشـتنیان کـردووە ئـەوەی جێگەی دڵخۆشی بێ پەیدا نەبووە هەتا ئەم کاتە ١٩٩٥/١٠/١٧ زایینە.

ئەوەی جێگەی نەگبەتیە بزووتنەوەی ئیسلامی و یـــەك گرتـووی ئیسـلامی و ڕاپـەڕینی ئیسلامی کارێکیان نەکردووە بۆ نەهێشتنی ئەو جەنگە جگە لــــەوەی ئـەڵێن: ئـەو تاقمانـە عیلـمانین ﴿ قالَ أنا أحْيِ وَأمِيتُ ﴾ ئەو کەسە پلەو سامان یاخی کردبوو ووتی: من زیندوو ئەکەمەوەو ئەیش مرێنم. دوو پیاوی بانگ کرد یەکێکیانی کوشت و ئەوتری بەرەڵا کـرد. کاتێ ئیبراهیم ببینی ئەو ستەم کارە زۆر گێل و گەوجـــە، یـاخۆی کـەوج ئـەکا، دەسـتی داوەتە فێل و فڕی پڕو پوچ ئەیەوێ خۆی ڕزگار بکا ئیبراهیم وێنەیە تری بـــۆ هێنایـەوە بـە جۆرێ نەتوانێ خۆی ڕزگار بکا، فەرمووی:

﴿ قالَ إبراهِيمُ فأنَ اللهَ يأتِ بِالشَمْسِ مِنَ الْمشرَقِ فأتِ بِها مِنَ المَغْرب ﴾ ئیبراهیم ووتی خوا بە ڕاستی خۆر ئەهێنێ لە ڕۆژهەڵاتەوە، دوایی تۆ خۆر بهێنە لـە خۆرئـاواوە، هەڵی سوڕێنە بە جۆرێ یاسایی خۆی.

﴿ فَبُهِتَ الّذي كَفَرَ ﴾ دوایی سەرگەردان بوو هەناسەی لێی بڕا ئـەو کەسـەی ئـەوتۆ باوەڕی نەهێنابوو، هیچ شتێکی بەدەستەوە نەما هەروەها ئەو کەسانەی ئەیانەوێ ئـادەمیزاد بەتاغوتی خۆیان بخەڵەتێن بە پڕوپاگەندە پاشەڕۆژ یان هەر بۆڕ خواردنە، بۆیـە بـۆ ووشـك کردنەوەی ئارەقی شەرمەزاری خۆیان پەلاماری ئاگرو ئاسن و چەکی ڕوخێنەر ئـەدەن لـە دژی بێ تاوانانی بێ هێز.

زانایان ئەڵێن: ئیبراهیم لە یەکەم وەڵامی خـۆی لایـداو، پـەلاماری ووڵام و پرسـیاری تری‌دا بۆ ئەوە بوو گفتوگۆکەیان درێژە نەکێشێ و کۆتایی پێ بێ. هەندێ تـر لـە زانایـان ئەڵێن: ووڵامەکەی ئیبراهیم یەك ووڵامە بـە دوو وێنەیـە، هـەتا بەباشـی بەڵگـەی بـۆ ڕون بکاتەوە یانێ مانای ئایەتەکە بەلایانەوە بەم جۆرەیە: بە ڕاستی ئەو خوایە کە گیان بەخشە بە بونەوەران هەر ئەویشە خۆر لـە خۆر هەڵاتەوە دێنـێ کـە تـۆی بـێ بـاوەڕ یەکـەمیانت بـۆ ئەکرێ بە جۆرێ دانیشتوان بخەڵەتێنێ چاکتر ناتوانی دووهەمیان بکەی بۆ مەبەستی خۆت.

هەرچۆنێ مانای بکرێ. واتە دوو وەڵامێ یا وەڵامێ بێ بەدوو وێنـە، ئـەو کەسـە بـێ باوەڕە بۆڕی خوارد، ناڕەوایی کردو، ناڕەواکەریش بێ باوەڕی بوو.

﴿ واللهُ لا يَهْدي الْقومَ الظّالِين ﴾ وە خوا ڕانومایی گەڵێ ناکا ستەمکاربن بە چەنـەبازی و دەمەدەمە. وەك نەختێ لەمەوبەر باسمان کرد ناوی ئەوستەمکارە نەبراوە، ئەوەی گرنگبێ لەو چیرۆکەدا ئەوە یەکە ئەم چیرۆکە پەندو تـەمێ کردنـەو ئامۆژگـاری زۆری تێدایـە بـۆ موسڵمانان، ئیتر پاڵەوانی ئەو چیرۆکە هەر کەسێ بێ گرنگ نیە.

ئەو ئایەتە پێشوە وێنەیە بۆ مرۆڤێ باوەڕی بەخوا نـەبێ، تـاغوتی کردبـێ بـە سـەرداری خۆی لـە ڕوناکی دەرچوبێ بۆلای تاریکی بـێ بـاوەڕی، وەك نـەمرودی کـوڕی کـەنعانی کوڕی سامی کوڕی نوح کە یەکەمین کەسە خۆی دانابێ بە خواو تاجی پاشایێتی بۆ یەکـەم

جار نرابێتە سەری، ئەم ئایەتەی دوایش وێنەیەکە بۆ مرۆڤـی خـوای گـەورەی کردبێ بـە سەرداری خۆی، لـە تاریکی بێ باوەڕی چوبێتە دەرەوە بـۆلای ڕونـاکی ئـایین، وەك خـوا ئەفەرموێ:

أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحْيِي هَٰذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا ۖ فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِائَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ ۖ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ ۖ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۖ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِائَةَ عَامٍ فَانظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ ۖ وَانظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ آيَةً لِّلنَّاسِ ۖ وَانظُرْ إِلَى الْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا ۚ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٥٩﴾

﴿ أَوْكا الّذي مَرّ على قَرْيَةٍ ﴾ ئەم ئایەتە پەیوەستە بە ئایەتی پێشەوە. یانێ موحەمەد تـۆ نەتزانیوەو نەتڕوانیوە بۆلای چیرۆکی جەنەبازی کـردن لـەگـەڵ ئیـبراهیم، یـا نـەتزانیوە و نەتڕوانیوە بۆلای بەسەرهاتی کەسێکی ئەوتۆ تێپەڕی بەسەر دێیەکاو بەسەر کەلەپوریانا.

﴿ وَهِيَ خاوِيَةٌ على عُرُشِها ﴾ وەئەو گوندە ڕوخابوو کەوتبو بەسەریە کابان و درەخت و پەردوی، بە جۆرێ دارو بەردی تێکەڵاوی خۆڵ و خاك بوبونو، ئاوەدانی تێدا نەمابو.

﴿ قالَ أنيّ يُحْيِي هذه الله بَعْدَ مَوْتِها ﴾ ووتی ئەو کەسە تێپەڕی بەسەر دێکەدا، بیری کردەوە لە دڵی خۆیا: بە چ جۆرێ و چۆن زیندو ئەکاتەوە خوا بونەوەرانی مردوی ئەم دێیە چۆنی ئاوەدان ئەکاتەوە پاش مردنیان و کاولبونی جێگەکانیان؟.

﴿ فَأماتَهُ الله مِئَةَ عامٍ ثُمَ بَعَثَه ﴾ دوایی خوای گەورە ئەو کەسەی مراند بە مردنی ڕاستەقینە لە کاتی بیرکردنەوەیدا، هەر لەو جێگەدا بۆ ماوەی سەد ساڵ لە پاشا دوای سەد ساڵ خوا زیندوی کردەوە هەروەك خۆیی و پێشووی.

﴿ قالَ كَمْ لَبِثْتَ ﴾ لە پاش زیندوکردنەوەی و چاکبونەوەی خوا پێی فەرمو: یا فریشتەیە بەو کەسەی ووت: چەند ماوەیە، لێرەدا ماویتەوە؟ برسیارکەر هەر کەسێ بێ مەبەستەکە ناگۆڕێ.

﴿ قالَ لَبِثْتُ يَوْماً أو بَعْضَ يَوْم ﴾ لە وەڵامدا ئەو کەسە ووتی: لێرەدا ماومەتەوە ڕۆژێ. کە تەماشای کرد هێشتا خۆرئاوا نەبوەو ووتی: یا هەندێ لە ڕۆژ لێرە ماومەتەوە.

﴿ قالَ بَلْ لَبِثْتَ مِئةَ عامٍ ﴾ خوا فەرموی: یا فریشتەیە ووتی: لێرە تۆ ماویتەوە ماوەی سەد ساڵ بە مردوی. ئەو کەسە ڕابردبو بەسەر دێکەدا گوێ درێژێك و هەندێ خواردەمەنی و خوراوەی تری پێ بوو، گوێ درێژەکەی بەستەوە، خواردەمەنی و خوراوەکەی لای خۆی دانا خوا وەك خۆی مراند بۆ گوێ درێژەکەی لەگەڵدا مراند، خواردەمەنی و خوراوەکەی وەك خۆی مابونەوە کە خوای گەورە ئەو کەسەی زیندو کردەوە گوێ درێژەکەیش زیندو کردەوە، بۆ ئەوەی باش تەمێ خوار ببێ، خوای گەورە فەرموی:

﴿ فانْظُر إلى طَعامِكَ وَشَرابِكَ لَمْ يَتَسَنَهُ ﴾ دوای تۆ بنوارە بۆلای خواردەمەنی و خوراوەکەت نەگۆڕاوە لەو ماوە دوورو زۆرە وەك خۆیان ماونەتەوە. ئەو کارە بە کەس

نەکراوە بەکەس ناکرێ جگەی خوای گەورە، چونکە خواردەمەنی و گوشراو لە ماوەیەکی کەمدا لە ناو ئەچن با ئەمەیشمان لەبیر نەچێ خواردەمەنی و گوشراو بەیەك تەرز دائەنرێن، بۆیە خوای گەورە فەرموی: نەگۆڕا. وەنەی فەرموو نەگۆڕان.

﴿ وَانْظُر إلى حِمارِكَ ﴾ وەتۆ بنوارە بۆلای گوێ درێژەکەت چۆن هەر ئێسکەکانی ماونەتەوە، هەمو ئەندامەکانی لەیەك بچڕاون، سەیرکە لە زیندوبونەوەی خۆت و گوێ درێژەکەت چ توانایەکی خوا ئەبینێ؟ چونکە ئەبوایە خواردەمەنی و گوشراوەکەت بەر لە گوێ درێژەکەت لە ناو بچونایە کەچی ئەوان ماونەتەوەو، گوێ درێژەکەت ڕزاڵ ڕزال بووە، ئێمەی پەروەردگارت ئەو کارە بەکەس نەکراوەمان کردو، تۆمان زیندو کردەوە هەتا بە باشی تێگەیی ئەو شتەی تۆ بە دوری ئەزانی لە زیندووکردنەوەی دانیشتوانی ئەو دێیە لای ئێمە زۆر ئاسانە.

﴿ ولِنَجْعَلَكَ آيَةً لِلنّاسِ ﴾ وە بۆ ئەوەیش ئێمە تۆ بگێڕین بە نیشانەو تەمێ دان بۆ ئادەمیزاد. بە تایبەتی ئەو کەسانە گومانیان لە زیندوکردنەوەو پاشە ڕۆژدا هەیە.

﴿ وَأنْظُر إلى الْعِظامِ كَيْفَ نُنْشِزُها ﴾ وەتۆ بنوارە بۆلای ئێسکەکانی گوێ درێژەکەت هەتا ببینی توانای بێ هۆی ئێمە، چۆن ئێمە ئەخەینە جوڵەو ئەو ئێسکانە و بەرزی ئەکەینەوە هەندێکیان بۆلای هەندێ تریان و ئەیان نوسێنین بەیەکەوە، وەك جاری پێشوو.

زانایان لە مەبەست لەو ئێسکانە هەریەکەیان بیرێکیان هەیە، ئایا ئەو ئێسکانە هی عوزەیرن یا هی گوێ درێژەکەیە، ئەوەی شایانی باسبێ بۆ هەر کامیانبێ مەبەستە کە ناگۆڕێ لە توانای خوا. بەڵام خوا لە پێشەوە عوزەیری زیندوکردوەتەوە، لە پاشا گوێ درێژەکە هەتا بە چاوی خۆی ببینێ چۆن بە توانای خۆی زیندوی ئەکاتەوە، بۆیە زۆری زانایان ئەڵێن: ئێسکی گوێ درێژەکە مەبەستە.

﴿ ثُمَّ نَكْسُها لَحْماً ﴾ لە پاشا ئێمە دائەپۆشین ئەو ئێسکانە بە گۆشت. عوزەیر بە چاوی خۆی بینی ئێسکەکان یەکیان گرت و گۆشت دای پۆشی و گیانی کرا بە بەرداو هەڵسایە سەرپێ.

﴿ فَلَما تَبَيَنَ لَهُ قالَ أعْلَمُ أنَ اللهَ على كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ دوایی کاتێ ڕون بویەوە بۆ عوزەیر نیشانەی توانای خواو، بە چاوی خۆی بینی چۆن گوێ درێژەکەی زیندو بویەوە، عوزەیر ووتی: من ئەزانم لەمەو بەرو ئێستاو لەمەو پاش بە هۆی بەڵگەی بێگومانەوە بە ڕاستی خوا بەسەر هەموو شتێکا توانای هەیە، بە تایبەتی زیندوکردنەوەی مردووان، دڵم ئاوی بڕوای بێگومانی خواردەوە کە زیندوکردنەوەی دانیشتوانی ئەو دێیە زۆر ئاسانە بۆخوا.

خوای گەورە ناوی ئەو دێیەی نەبردووە لەگەڵ ئەو کەسەی تێپەڕی بەسەریا، باسی نەفەرموە ئەو کەسە باوەڕ داربوە یابێ باوەڕ. پێغەمەر بوە یا دۆستی تری خوا، ئەو کەسە عوزەیر بووە یا ئەرمیا، یاخدر؟ ئەو دێیە بەیتول موقەدەس بوە یائیلیا؟ ئەوەی پرسیاری کرد خوای گەورەیە یا کەسێ تر؟ ئەوانە هەموویان خوای گەورە ناوی نەبردون، ئەوەی گرنگبێ ئادەمیزاد بە ناوەڕۆکی ئەو ڕووداوە پێویستە تەمێ خوار بن، وە گومان لەوەدا نەمێنێ کەخوا ئەوپەڕی توانای هەیە.

بەڵام زۆربەی زانایان مانای ئەو چیرۆکەیان بەم جۆرەی خوارەوە کردووە ئەڵێن: ئەو دێیە بەیتول موقەدەسە، ئەو کەسەی تێپەڕی بەسەریا عوزەیر بووە، پرسیارکەر کە فریشتەیە بووە، ئەمەیش دەقی پوختەی ماناکەیانە:

کاتێ کوڕانی ئیسرائیل دەستیان دایە خراپە کردن و گێرە شێوێنی، بەبێ ژمارە ستەم و گوناهو یاخی بونیان کرد بە ڕەوشتی خۆیان، ئایینی ڕاستی خۆیانیان لەبیر چویەوە خوای گەورە بەختە نەسری پاشای بابولی بەسەریانا زاڵ کرد بە لە شکرێکی چڕەوە دای بە سەریانا بەیتول موقەدەسی ڕوخاند لە ساڵی (١٧٠٩) ی بەر لە دایکبونی عیسا زۆری لێ

کوشتن و زۆریشی بەدیل گرتن و دەربــەدەری کـردن. یـەکێ لـەو دەرکراوانـە عوزەیـر پێغەمەر بو کە گەڕایەوە بۆ بەیتول موقەدەس پاش کاولبونی، بە سواری گــوێ درێژەکـەی دای بەلای بەیتول موقەدەسا، هەندێ هەنجیرو ترێ و گوشراوی ترێ پێ بوو کە ئەوانـەیش بە ماوەیەکی زۆر کەم لە ناو ئەچن.

عوزەیـر کـە چـاوی کـەوت بـەو خـانوە ڕوخاوانـە، دارو بـەردو دیـوارو پــەردوی بەسـەریەکدا درابـو، زۆر بـەدوری زانـی جـارێ تـر ئـاوەدان بکرێتــەوە، دانیشـتوە دەربەدەرەکانی بگەڕێنەوە بۆ ئەو جێگەیە، بۆیە لە ڕوی داخ و خەفەتەوە ووتی: خــوا ئـەم مردووانە چۆن زیندو ئەکاتەوە؟ ئەم خـانوە ڕوخاوانـە چـۆن ئـاوەدان ئەکرێنـەوە. خـوای گەورە ویستی بەوی نیشان بدا ئەو شتەی ئەو بە دوری ئەزانێ بەلای خواوە دورنیە، خــوا لەوەی ئەو بیری لێ کردەوە گەورە تری پێ نیشاندا کە بۆ ماوەی سەد ساڵ خۆی و گوێ درێژەکەی مراند، هەنجیرو ترێ گوشراوەکەی وەك خۆیان مانەوە بێ تێك چون لەو کاتەی مردنی عوزەیردا خوا پاشایێکی گەورەی لە پاشاکانی فارس نــارد بـۆ بـەیتول موقـەدەس و ئاوەدانی کردەوە پاش مردنی بە حەفتا ســاڵ، هـاتوچۆی ئـابوری و بازرگـانی لــە جـاران چاکتر پەرەی سەند، لە پاش سەد ساڵ خو ا عوزەیری زیندوکردەوە، وەك خۆی و جـاری پێشووی کە زیندوبویەوە خوای گەورە فریشتەیەکی نارد بۆلای هەتا بۆی دەرکــەوێ ئـەو شتانەی نایزانێ لە توانای خوای گەورە، بۆ ئەو مەبەستە فریشتەکە پرســیاری لــە عوزەیـر کرد چەند ماوەیەکە لێرە ماویتەوە ووتی: لەوانەیە ڕۆژێ بێ. بەڵام کــە تەماشـای خـۆری کرد ئاوا نەبووە ووتی: لەوانەیە هەندێ لە ڕۆژبـێ، فریشـتەکە بـەوی ووت: بـەڵکو ئـەم مردنەی تۆ سەد ساڵی پێ چوە کەواتە تەماشای دوو بەڵگـەی تـر لــە توانـای خـوا بکـە، بنوارە بۆ خواردەمەنی و گوشراوەکەت کە لەم ماوە زۆرەدا بەبێ تێك چوون وەك خۆیـان ماونەتەوە، ئــەوەیش گـوێ درێژەکـەت بـۆی بنـوارە کـە ئەندامـەڕ زاواکـانی و ئێسـکە ڕزیوەکانی چۆن کۆ ئەبنەوەو زیندو ئەکرێتــەوە وە هـەتا تـەمێ خواربـی، بـت کـەین بـە

نیشانەو تەمێ بۆ ئادەمیزادەکانی خزمەت کە ئەچیتەوە بۆلایان لەو شارەدا ئاوەدان کراوەتەوە کە لەوەو بەر ڕوخابو، بە چاوی خۆت تەماشای توانای خوا بکە لە زیندوکردنەوەی خۆت و گوێ درێژەکەت و ئاوەدان کردنەوەی شارەکە. عوزەیر کە ئەوانەی بۆ دەرکەوت ووتی: من ئەزانم و گومانم نەبووەو نایشبێ خوا دەستەلاتی بەسەر هەموو شتا هەیە، هیچ شتی لێ وون نابێ.. ئەگێڕنەوە عوزەیر پاش زیندوبونەوەی خۆی و گوێ درێژەکەی، سواری گوێ درێژەکەی بوو، بەرەو شارو کۆلان و خانوەکەی خۆی کەوتە ڕێگەکە گەیشتە ئەوێ. نە ئەو کەسی ئەناسی و، نەکەس ئەوی ئەناسی، نەی ئەزانی خانوەکەیان لە چ جێگەیەکە، پاش سەرگەردانی بەهەر چۆنێ بوو دۆزیەوە، تەماشای کرد پیرەژنێکی کوێری پەك کەوتە دانیشتوە، لەو کەسانەی سەردەمی عوزەیر بوو بەر لەسەد ساڵ کە نەمرد بوو. پێی ووت: پیرەژن ئەمە بە خانەوەکەی عوزەیر، پیرەژن ووتی: بەڵێ. بەلاّم عوزەیر لە چ جێگەیەکە؟ من منالّبووم دیومە، دەستی کرد بە گریان، عوزەیر ووتی: من عوزەیرم، پیرەژن بڕوای نەکرد ووتی: عوزەیر پاڕانەوەی گیرابوە لای خوا ئەگەر ڕاست ئەکەی بۆم بپاڕێوە با خوا چاوەکانم بداتەوە، عوزەیر بۆی پاڕایەوە چاوەکانی چاکبونەوە، پیرژەن چاوی بە عوزەیر کەوت وەك جارانی پێش سەد ساڵ بووە عوزەیر دەستی ژنی گرت و ووتی: هەڵسە بە ویستی خوا، هەڵسایە سەرپێ و ڕای کردو ووتی: خەڵکینە ئەمە عوزەیرە. خەڵکی ئاوەدانی بەسەریادا بارین، ئەویش لەبەر تەوراتی بەسەردا خوێندنەوە، گومڕابوون و ووتیان: کەواتە عوزەیر کوڕی خوایە، ڕێگەی خوا پەرستیان وون کرد. ئەو ڕوداوە بەڵگەیەکی بینراوی بێگومانە لەسەر زیندوکردنەوەی مردووان بۆ هەموو ئادەمیزاد، بە تایبەتی بۆ عوزەیر لە زیندوبوونەوەی خۆیی و گوێ درێژەکەی پاش مردنیان، مانەوەی خواردەمەنی و گوشراوەکەی و ئاوەدان کردنەوەی شارەکە.

بە تەمێ خواری ئەو چیرۆکە بۆمان دەرئەکەوێ مرۆڤی ژیر نابێ پەکی بکەوێ بە هۆی ئەو شتانە نایزانێ و ڕێگەی پێ نابا، بەلای ڕۆژنامەو هەندێ لە نامەکانەوە ناچێتە ئەقڵەوە،

مامۆستاکانیان بە نەزانینەوە بۆمان باس ئەکەن. بەڵکو پێویستە خۆی ڕاگرێ و تێك نەچێ و پەکی نەکەوێ، بگرە لە هەندێ شتا کە دژی یاسای سروشتین، چونکە زانین و تاقی کردنەوە سەلماندویانە هەتا هەتایە یاسایەکی تایبەتی بۆ سروشت دانانرێ. بەڵکو دێن و ئەچن و ئەگۆڕرێن، ئەو شتانەی لەمەو پێش کە لە یاسای سروشت زۆر دوربوون ئێستا بە جۆرێ تری جیاواز ئەبینرێن.

خوای گەورە بەڵگەیە تر ڕوون ئەکاتەوە بۆ ئادەمیزاد کە خوا دۆست و سەرداری باوەڕدارانە، بەڵگەیە تریشە لەسەر توانای خوای گەورە بۆ زیندوکردنەوەی بونەوەران بە گشتی سەر لەنوێ پاش مردنیان لە ڕۆژی دوایدا. بگرە ئەو کەسەی فڕۆکەیە دروست بکا یەکەم جار، پاش هەڵوەشانەوەی چاك کردنەوەی زۆر ئاسان ترە لای بۆ جاری دووهەم، بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێ:

وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِى كَيْفَ تُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن ۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَـٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِى ۖ قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ ٱلطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ ٱجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ٱدْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا ۚ وَٱعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦٠﴾

﴿ وإذْ قالَ إبْراهيمُ رَبِّ أرِني كَيْفَ يَحْيِ الْمَوْتى ﴾ وە موحەمەد تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە ئیبراهیم ووتی: ئەی پەروەردەکەری من پێم نیشان بدە توانای تەواوی خۆت چۆن زیندوو ئەکەیتەوە مردووان.

زانایان دەربارەی ئەو پرسیارەی ئیبراهیم مانای زۆریان لێ داوەتەوە هەر یەکەیان بە جۆرێ، بۆ ئەوەی گومان و دوو دڵی لە پێغەمەران دور بخەینەوە، بە تایبەتی پێغەمەرێکی وەك ئیبراهیم. ئەوەی هەڵبژاردەی ماناکردنی زۆربەی زانایانبێ و شایانی ڕێزی پێغەمەرانبێ ئەمەیە: بە ڕاستی ئیبراهیم دڵی پڕکراوە بە باوەڕ بە پەروەردەکەری بونەوەران، بەبێ گومان پشتی بە خوای خۆی بەهێزبووە، بڕوای تەواوی بە توانای خوا هەبووە، بڕوا لە دڵیا ڕیشەی داکوتابوو بە هۆی ئەو سروشەوە خوا بۆی ناردبوو لە زیندوبونەوەی ئادەمیزاد پاش مردنیان، پرسیارو وەلام لە کارو کردەوەیان لە پاشە ڕۆژدا. بەلام هەروەك مرۆڤێ کە ئارەزۆی دەرکەوتنی هەمو شتی هەیە ویستی چاوی دڵی بڕوای بێگومانی زۆرتر ببێ بە چاوی خۆی ببینێ بەلگەی ئاشکرا لەسەر زیندووبوونەوە، بۆیە ئەو پرسیارەی کرد لە خوای گەورە. نەك بە گومان و دوو دڵییەوە، چونکە ئەوانە لە پێغەمەران ناوەشێتەوە.

﴿ قَالَ أَوَلَمْ تُؤمِنُ قَالَ بَلى ﴾ پەروەردگاری فەرموی: ئایا تۆ باوەڕت نەهێناوە کە من بە توانای خۆم مردوو زیندوو دەکەمەوە؟ ئیبراهیم ووتی: بەلێ بڕوام هێناوەو ئەوپەڕی توانای تۆم بۆ دەرکەوتووە بە هۆی سروشەوە کە بۆت ناردووم.

﴿ وَلَكِنْ لِيَطْمَئِنَ قَلْبی ﴾ وە بەلام ئەو پرسیارەم بۆ ئەوەیە هەتا دڵم ئارام بگرێ، وە چۆنیەتی زیندووکردنەوە بە چاوی سەری خۆم ببینم. کاتێ مەبەستەکەی خۆی ڕوون کردەوە، خوای گەورەیش ئاگای لە هەموو شاراوەی دڵان هەیە کە ئیبراهیم بە گومانەوە ئەو پرسیارە ناکا. وولامی داواکەی دایەوەو فەرمانی پێدا.

﴿ قَالَ فَخُذ أَرْبَعَةً مِنَ الطَّيْرِ ﴾ پەروەردگار فەرموی: ئەگەر ئارەزوت هەیە بە چاوی خۆت ئەو کارە ببینی، دوایی تۆ چوار لە باڵندەکان بگرە، ئەو باڵندانە هەر باڵندەیە هەن گرنگ نیە، بەهەر چوار باڵندەیە هەبێ مەبەستەکە دێتەدی. بەلام ئەلێن: بریتی بوون لە یەك تاووس کەلەبابێك و قەلەرەش و کوترێ.

﴿ فَصُرْهُنَ إِلَيْكَ ﴾ دووایی کۆیان بکەرەوە بۆلای خۆت چاك چاك لەوان وردببەرەوە، ڕەنگ و شێوازی هەموویان بە باشی بزانەو بیان ناسە، بە جۆرێ لێت تێك نەچێ، ئەندامەکانیان دیاری بکە.

﴿ ثُمَ أجْعَلْ عَلى كُلّ جَبَلٍ مِنْهُنَ جُزْءاً ﴾ لە پاشا دابنێ لەسەر هەر کێوی بە هەر چوار لاتا لەو تەیرانە پارچەیە. یانێ هەر چوار باڵندەکان سەربڕە، پارچە پارچەیان بکە، ئەندامەکانیان بلاوبکەرەوە بەسەر ئەو کێوانەدا لە دەوروبەری تۆن، ئیبراهیم فەرمانەکەی بەجێ هێنا.

﴿ ثُمَ أدْعُهُنَ يأتينَكَ سَعْياً ﴾ لە پاشا تۆ ئەو باڵندانە بانگ بکەو بڵێ: وەرن بە هۆی دەستوری خواوە، وە هەریەکەیان بە ناوی خۆیانەوە بانکەو وەڵامت ئەدەنەوە، باڵندەکان دێن بۆلای تۆ بە پەلە ئەفڕن و بە پێ دێن، ئیبراهیم بەو جۆرە فەرمانی پێ درابو کارەکانی بەجێ هێنا، بە چاوی خۆی بینی هەر پارچەیە هاتەوە بۆلای وێنەو شوێنی شیاوی خۆیان، ئەندامەکان یەکیان گرت و نوسانەوە بە یەکەوە، گیانیان سەر لەنوێ کرایەوە بە بەریانا، دوای ئەوە هەموویان ڕایان کرد بۆلای ئیبراهیم بە توانای خواو هاتنەوە بۆ جێگەی خۆیان. ئیبراهیم بە چاوی خۆی ئەو بەڵگانەی بینی لە تواناو کارە بەکەس نەکراوانە کە هەمو بونەوەران لە ئاسمانەکان و زەویدا دەست شکاوو پەك کەوتوون لەو بارەیەوە.

﴿ وأعْلَمْ أنَ اللهَ عَزيزٌ حَكِيمٌ ﴾ وە تۆ بزانە لەڕووی بڕوای تەواوە کە بە ڕاستی خوا زۆر دەستەڵات دارە، هیچ شتێ لەو یاخی نابێ، هەموو کارەکانی بەهێزن، هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ بە گوێرەی زانین و ویستی خۆی.

پێویستە ئادەمیزاد لە هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتانە بۆسەر پێغەمەران دڵیان نەکەوێتە چرکەو گومان، وا نەزانن چیرۆکی عوزەیرو گوێ درێژەکەی، چیرۆکی ئیبراهیم، هەتا دێ، هەر بۆ ئەوەیە ئەوانە ببیسن وابزانن ناوەڕۆکیان مەبەست نیە، ڕوداوێکی مێژووین و

بەسن بەڵکو پێویستە زۆر بە وردی بیریان لیٚ بکەنەوە هەتا بیان کەن بە ئامۆژگاری بۆ خۆیان، بەوان تەمیٚ خواربن.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا کە باسی ڕوداوێکی فەرموو، پێویستە لەسەر باوەڕداران بیکەن بە یاساو دەستورو تەمیٚ و ئامۆژگاری بۆخۆیان، ئەگینا باسەکە بەبیٚ هودە دەرئەچیٚ، ئەوەیش لە فەرمودەی خوای گەورەوە دورە. هەروەها ئەم چیرۆکانە، بەڵگەن لەسەر ڕێزی ئیبراهیم و پایەی بلّندی لای خوا لە وەرگرتنی داوکەی و شیرینی جۆری پرسیارەکەی، بۆیە خوای گەورەیش وولاٚمی دایەوە بە ئاسان ترین وولاٚم. نیشانی عوزەیری دا ئەو شتانەی نیشانی داو باسکران.

خوای گەورە بەرزی ئیسلام و موسلّمانان و پەرەسەندنی ئایینی ئیسلام و ژیانی باوەڕدارانی بەستوە بە دو شتەوە:

١- کۆشش و خۆدانان و جەنگ کردن لەگەڵ بیٚ باوەڕان هەتاوەکو ووشەی خوا بەرزبکرێتەوە. بە تایبەتی کاتیٚ بیٚ باوەڕان پەلاماری نیشتمانی موسلّمانیاندا و مافیان زەوت کردن پێویستە وولاٚمیان بدرێتەوەە سەریان بکوتنەوە.

٢- دارایی و سامانی خۆیان دابنێن لە ڕێگەی خوادا بە دەست گیرۆیی کردنی هەژاران و ئامەشۆی خزمان و دروست کردنی زانکۆ و پەیمانگاو کڕینی دەرمان و دروست کردنی خەستەخانە. وە کڕینی چەك و ئازوقە بۆ جەنگاوەران.

لەبەر ئەوەی سروشتی ئادەمیزاد بە جیزە لەسەر مانەوەی خۆیان و سامانیان و دارییان و زۆر خۆشەویستن لایان، بە خۆڕایی و بەبیٚ پاداشت و بەبیٚ نرخ ئاسان نیە لایان وازیان لیٚ بهێنن و دایان بنێن، بۆیە خوای گەورە لە پێشەوە چیرۆکی زۆری خاوەن تەمێیان بۆ باس ئەکاو ئەیکا بە بەڵگەو نیشانە بۆیان، بۆیان ڕوون ئەکاتەوە بۆیە گەلانی پێشوو بە کزۆڵی و داماوی لەناوچون، چونکە وازیان لە جەنگی دوژمنانیان هێنا، هەر خەریکی زۆر کردن و پەیداکردنی سامانبوون، ڕزگاری نەکردن لە مردن و هەژاری و ترس و

ڕژدی، خوای گەورەبەو چیرۆکانە بۆی سەلماندن مان و نەمان بە دەستی خوان. بێ گومان خوا هەموو بونەوەران زیندوو ئەکاتەوە، لە ڕۆژی دووایدا نــە خـێزان و نەسـامان ناگەنـە فریایان، هەتا دارایی و خۆیان لە ڕێگەی چاکەدا دانـەنێن و نـەیان کـەن بـەهۆی پاڕانـەوە بۆخۆیان لە خزمەت خوای گەورەودا. ئەفەرموێ:

مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِى كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّا۟ئَةُ حَبَّةٍ ۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦١﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ لَا يُتْبِعُونَ مَآ أَنفَقُوا۟ مَنًّا وَلَآ أَذًى ۙ لَّهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٦٢﴾ قَوْلٌ مَّعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِّن صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَآ أَذًى ۗ وَٱللَّهُ غَنِىٌّ حَلِيمٌ ﴿٢٦٣﴾

﴿ مَثَلُ الذينَ يُنْفَقُونَ أمْوالَـهُمْ في سَبيل اللهِ ﴾ وێنـەی کەسـانێکی ئـەوتۆ ئەبەخشـن و دائەنێن دارایيەکانیان لـە ڕێگەی خوادا، وەك سازکردنی لەشکر بۆ بەرزی ئایینی ئیسـلام، وەدەست گیرۆی کردنی هەژاران و لێ قەوماوان و ڕزگارکردنی دەردەداران و نەخۆشـان و فێرکردنی خوێندن بە نەزانان و هەڵسوڕاندنی کار بۆ بێ کاران.

هەندێ لە زانایان ئەڵێن: ئەو ئایەتانە هاتونە خوارەوە دەربارەی عوسمانی کوڕی عەفان و عەبدول ڕەحمانی کوڕی عەوف لە کاتێکا پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ویستی بچێ بۆ جەنگی تەبوك، موسڵمانانی هان ئەدا لەسەر بەخشینی دارایی خۆیان لە ڕێگەی خوادا. لەو کاتەدا عەبدول ڕەحمانی کوڕی عەوف وتی: ئەی فروستادەی خوا هەشت هەزار درەمم هەیە چوار هەزارم ئەوا بەخشی بەخوا، چوار هەزاریشم بۆخۆم و خێزانم. پێغەمەر فەرموی: خوا پیت و فەڕ بخاتە ئەوی هێشتوتەوە بۆ خۆت و خێزانت... عوسمانی کوڕی عەفان هەزار هوشتری بە هەموو کەرەسە و هەزار دیناریشی هێناو کردیە کۆشی پێغەمەرەوە ﴿ﷺ﴾ ئەو جەنگەی تەبوك نێونراوە بە ﴿ جیش العسرة﴾ یانی لەشکری تەنگانە و ناخۆشی.

هەرچۆنێ بێ ئەو ئایەتە بۆ هەر هۆیە هاتبێتە خوارەوە هەر کەسێ تەماشای مانای ئایەتەکانی قورئان بکاو بە باشی لە ماناکانیان وردبێتەوە بۆی دەرئەکەوێ قورئان گرنگی زۆری داوە بەسێ شتی بنچینەو سەرەکی: بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلام. کۆشش و جەنگ و خۆدانان بۆخوا. بەخشینی دارایی لە ڕێگەی خوادا، ئەو سێ شتە گەورەترین هۆن بۆ چەسپاندنی ئایینی ئیسلام و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی ئیسلام، هەر لەبەر ئەوانەیشە قورئان جارێ بە هەڕەشەو جارێ تر بە هاندان داوای ئەوسێ شتانە ئەکا لە موسڵمانان.

ئایەتەکانی لەمەوبەرو لەمەو دووایش ئەو باسانەمان بۆ ئەکەن، بە تایبەتی ئەم ئایەتەو ئایەتی تری دوایی ئەم ئایەتانە فەرمان ئەدەن بە موسڵمانان بۆ ئەو سێ شتە سەرەکیانە، هەندێ لەو ئایەتانە بەڵێنمان پێ ئەدەن بە پاداشتی حەوت سەد چەندانە یا زۆرتر، هەندێکیان قەدەغە ئەکەن لە موسڵمانان ئازاردانی هەژاران لە بەخشیندا بە خۆ هەڵکێشانە بەسەریانا، هەندێ تر لەو ئایەتانە فەرمانمان پێ ئەدەن ئەو بەخشینە هەر لە بەر خوابێ و لە دارایی پاکبێ. نەك بە دزی دەست برین پەیدا کرابێ. کەواتە هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە بۆ هاندانی موسڵمانە بە گشتی با هۆیەکی تایبەتیشی هەبێ.

﴿ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنْبَتَتْ سَبْعَ سَنابِلَ ﴾ وەك وێنەی دەنكە دانەوێڵەیە كە بچێنرێ لە زەوێكی بێ دڕك و داڵ و نەخت سەوز بكا حەوت گوڵ لەیەك بنجا لە هەموو گوڵێكا سەد دانەی تێدابێ كە هەموویان ئەكەنە حەوت سەددانە.

﴿ واللهُ يُضاعِفُ لِمَنْ يَشاءُ ﴾ وە خوا دوپاتی زۆری ئەكا بۆ هەر كەسێ ئارەزۆی هەبێ یانێ ئەو بەخششە وەك وێنەی چێنراوێ وایە تۆوی چاكبێ وزەویەكەی نەخت و بە پتبێ بەرهەمەكەی زۆرتر ئەبێ. بەخشندەیش خۆیی خاوێنبێ و داریەكەی پاكبێ و لە شوێنی شیاوی خۆیا دای بنێ پاداشتەكەی لە حەوت چەندانە زۆرتر ئەبێ هەتا ئەگاتە حەوت سەدو زۆرتریش.

﴿ واللهُ واسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ وە خوا بەخشندیەكەی زۆرترو فراوان ترە بۆ كەسێ لە حەوت سەد زۆرتریشی بداتێ و كەمی ناكاتەوە، دەرگای بەخشندەكانی نابەستێ، ئەزانێ بە بەخشندەكانی موسڵمانان و مەبەستی ئەوان و هیچ لە خواوون نابێ زانایان پرسیاری زۆریان لە یەكتری كردوە لە بارەی ئەو ئایەتە چۆن خوا ئەو وێنەیە لێ داوە؟ كەچی دەنكە دانەوێڵەیە بۆ ئەو هەموەبەر هەمە دەست ناكەوێ، هەر یەكە لەو زانایانە بۆخۆیان بە جۆرێ وولامیان داوەتەوە. بێگومان ئەو زانایانە بۆخۆیان بە جۆری وولامیان داوەتەوە. بێگومان ئەو زانایانە ئەو وێنەیانە بە گوێرەی بیری خۆیان بەدورزانیوە، هەموو سەردەمێكیان وەك سەردەمی خۆیان داناوە بە ئەوپەڕی ڕێزمەوە بۆیان. بەلام زانین و زانیاری لەم سەردەمەی ئێمەدا گەیشتوەتە ڕادەیە ئەو شتانەی ئەوان بە دوریان زانیوە زۆر نزیك و ئاسانە و بینراوە. زانایانی ئەم سەردەمە بە هۆی زانستی تازەوە لەسەر مانگ دابەزیون، لە هەوڵیشدان بۆ دابەزین لەسەر ئەستێرەكانی تر، بە هۆی كەشتی بۆشاییەوە زۆربەی ئەستێرەكانیان تاقی كردوەتەوە بە هۆی ئامێری ئەلەكترۆنیەوە زانراوی زۆریان بۆ هاتووە. هەر بە بۆنەی ئامێرو كەرەسەی كشت و كاڵی نوێ، بە جۆرێكی تایبەتی چاندنی تۆوی بە پیت و لە زەوی نەختا بەرهەمی دانەوێڵە گەیشتوەتە پلەیە كە ئەو وێنە خوالێ

داوە بە چاوی خۆمان ئەیبینین و لەوەیش زۆرتر، بەدەیان شتی تریش بە هۆی زانینەوە دەرئەکەوێ کە ببێتە هۆی باوەڕ بە ناوەڕۆکی مانای قورئان لە هەموو ڕویێکەوە.

﴿ الَّذِينَ يُنْفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللهِ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ ئەبەخشن دارایی خۆیان لە ڕێگەی خوادا بۆ پێك هێنانی لەشکرو هەموو چاکەکانی تر.

﴿ ثُمَ لا يُتْبِعونَ ما أنْفَقُوا منّاً ﴾ لە پاشا ئەو کەسانە نایەرن بە دووای شتێ بەخشیویانە خۆهەڵ کێشان بەسەر هەژاراندا و تەریق کردنەوەیان و سەرزەنشتیان وەك بڵێ: من نەبووم چاکەم لەگەڵ کردی؟ ئەوە من نەبووم شتم دایتێ.

﴿ ولا أذى ﴾ ونایش یەرن بە دووایا ئازاردانی هەژاران وەك بڵێ: خوا من ڕزگار نا لە دەستی تۆ، چۆنم گیر خواردوە بەدەستەوە، بڕۆ خوا بداتێ.

﴿ لَهُمْ أجْرُهُمْ عِنْدَ رَبِهِمْ وَلا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ بۆ ئەو کەسانە هەیە کە بەو جۆرە بن پاداشتی خۆیان لە خزمەت پەروەردگاری خۆیانەوە، هیچ ترسێ لەسەریان نیە بۆ کەم کردنەوەی پاداشتیان، ئەو کەسانە خەفەتبارو غەمبار نابن بۆ لە ناو چوونی پاداشتیان.

یانێ بەخشش و دەست گیرۆیی لە پاداشتەکەیا خەفەتباری تێدا نابێ کاتێ خوا پاداشتەکەیان ئەداتێ بەوجۆرە زۆرە کە هەر لەبەر خوابێ. نەك بۆ ناودەرکردن و ڕواڵەت لە ئەمڕۆدا.

پێویستە هەستی کەس بریندار نەکەن بەخۆ هەڵکێشان، چونکە بە پێچەوانەوە کارو پیشەی خۆیان تێك ئەدەن، ئەیشبنە هۆی کەم بونەوەی سامانیان لە ئەمڕۆدا و پاداشتی پاشەڕۆژیش پوچ ئەکاتەوە.

﴿ قَوْلٌ مَعْرُوفٌ وَمَغفِرَةٌ خَيْرٌ مِنْ صَدَقَةٍ يتبعها أذى ﴾ گفتوگۆیەکی خۆش بۆ وەڵامدانەوەی هەژاران بە جۆرێ دڵیان وەری بگرێ و لایان خۆشبێ و، لێ بوردن لە سواڵ کەران و هەژاران کاتێ داوای شتێ بکەن گرانبێ لەسەرتان، چاوپۆشی کردن لە

هەژاران و ڕوگرژنەکردن بەرانبەریان لە کاتی زۆر ویژی و کۆڵ نەدانیان و جنێونەدانیان چاکترە لە بەخشش و چاکەیە بە دووایا بێت ئازارو سەرزەنشت بۆ هەژاران.

﴿ والله غَنِيٌّ حَلِيمٌ ﴾ وە خوا ساماندارەو پێویستی بە چاکەکردن و بەخششی ئەو کەسانە نیە، خێزانی هەژاران بەخێو ئەکا لە لایەترەوە جگە لەوان، ئیتر بۆ ئازاری هەژاران ئەدەن و لەرێزیان کەم ئەکەنەوە؟ خوا زۆر بە ئارام و لەسەر خۆیە، پەلە ناکا لە سزادانی خۆ هەڵکێشان و ئازاردانی هەژاران لەم ڕۆژەدا. تۆڵەی گوناهباران دووا ئەخا بۆ ڕۆژی دووایی.

خوای گەورە بەو ئایەتانەی پێشوو ڕونی کردەوە کە وازهێنان لە خۆ هەڵکێشان و ئازاردان مەرجە بۆ وەرگرتنی پاداشت و مزە، نەبەخشین لەگەڵ گفتوگۆی شیرین و چاکدا چاکترە لە بەخشین لەگەڵ خۆ هەڵکێشان و ئازاردانی هەژاران، چاکەکردنی بێ ئازارو بێ خۆ هەڵکێشان پاداشتەکەی نایەتە ژمارە لە حەوت سەد بەرەو ژوورترە. پاش ئەوانە خوا وێنەی ترمان بۆ لێ ئەدا کە ئەو کەسانەی خۆیان هەڵئەکێشن و ئازاری هەژاران بدەن بە دوو ڕوی دائەنرێ لەلای خوای گەورە ئەفەرموێ:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ كَٱلَّذِي يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفۡوَانٍ عَلَيۡهِ تُرَابٞ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٞ فَتَرَكَهُۥ صَلۡدٗاۖ لَّا يَقۡدِرُونَ عَلَىٰ شَيۡءٖ مِّمَّا كَسَبُواْۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٦٤﴾

وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ وَتَثْبِيتًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ كَمَثَلِ جَنَّةٍۭ بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ فَـَٔاتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٦٥﴾

﴿ يا أيهُا الذيـنَ أمنـوا لاتُبطِلـوا صَدَقـاتُكُمْ بـالْمَنْ والأذى ﴾ ئـەی کەسـانێکی ئـەوتۆ باوەڕتان هێناوە بە خواو بە ڕۆژی دوایی ئێوە پوچ مەکەنەوە چاکەو بەخششەکانی خۆتـان بە خۆهەڵکێشان لەگەڵ هەژاران و ئازاردانیان، ئەو شـتەی هـەژاران وەری دەگـرن هـی خۆیانە، ئێوەی ساماندار کۆڵ هەڵگری هەژارانن، کۆڵ هەڵگر چۆن ئەبێ ئازاری خـاوەن ماڵ بدا.

﴿ كالْذي يُنْفِقُ مالَهُ رئاءَ الناسِ ﴾ وەك کەسێکی ئەوتۆ لـە ڕێگـای ڕاسـت لای داوەو دوو ڕووی بووبێ بە پیشەی دارایی خۆی ئەبەخشێ لەبەر چاوی ئادەمیزاد دا بـۆ ئـەوەی ناوی دەرچێ و تەماشای بکەن.

ناوەڕۆکی ئەو ڕستەیە باوەڕدارو بێ باوەڕان ئەگرێتەوە کە دارایـی خۆیـان بـەو جـۆرە ببەخشن.

﴿ وَلا يُؤمِنُ باللهِ وَالْيَمْ الأخر ﴾ وە باوەڕ نەهێنێ بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایـی، چونکـە ئەگەر بڕوای هەبێ ئەبوایە هەر لەبەر خودا دارایی خۆی بدایە بە هەژاران، ئەگەر بڕوایشی بە ڕۆژی دووایی ببوایە هەر بە تەمای پاداشتی ئەو ڕۆژە ئەبو.

خوای گەورە دوو وێنەی ترمان بۆلێ ئەدا بۆ هەر یەکە لـەو کەسـانە ئـازاری هـەژاران ئەدەن، بۆ ئەوانە ئازاریان نادەن. خوا بۆ وێنە لێدانی ئازاردەران ئەفەرموێ:

﴿ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ صَفْوانٍ عَلَيه تُراب ﴾ دوایی وێنەی ئەو چاكەو بەخشینە وەك وێنەی بەردێكی لوس و ڕەق وایە بەسەر ئەو بەردەوە هەبێ خۆڵێكی وشك و تەنك.

﴿ فَأَصابَهُ وابِلٌ فَتَرَكَهُ صَلْداً ﴾ دوایی بدا لەو بەردە بارانێكی زۆر سەخت و دڵۆپ گەورە بە خوڕی، دوای ئەو بارانە زۆرەو دڵۆپ گەورەیە بەردەكەی بەجێ هێلابێ بە لووسی بەبێ خۆڵ.

یانێ هەر یەكە لە خۆهەڵكێش و ئازاردەرو چاكەكەری بەرچاوی وەك ئەو بەردە لووسە وا كەمێ خۆڵی بەسەرەوە بێ و باران و ڕەهێڵە لێ بداو گڵەكە لابا، هەروەها چاكەی ئازار دەرانو بەر چاو ویستان بەبێ كەم و زۆری وەك ئەو نەختە خۆڵە وان بەسەر ئەو بەردەوەیە، ئازارو بەرچاو ویستیان وێنەی ئەو ڕەهێڵە بارانە وان پاداشتی چاكە لائەبەن.

﴿ لا يقدِرونَ عَلى شيءٍ مما كَسَبُوا ﴾ سوود وەرناگرن بەو شتەی كردویانە بۆ بەر چاوی ئادەمیزاد، هیچ پاداشتێكیان دەست ناكەوێ وە دەسەڵاتیان بەسەر گەڕانەوەی پاداشتی ئەو چاكانە نیە، یانێ چۆن هیچ كەسێ توانای ئەوەی نی‌یە بەسەر گەڕانەوەی ئەو بارانەو خۆڵەكەی سەری، هەروەها ئازاردەری هەژاران و چاكە كەرانی بەر چاوی كەس ناتوانێ چاكەو بەخششەكەیان بگێڕێتەوە، یانێ نە ئەمڕۆ نە دوارۆژ سوود لەو دارایی‌یە وەرناگرن. چونكە بەو ئازارو بەرچاو ویستنە پوچ بۆتەوە پاداشتیان.

﴿ واللهُ لا يُهْدِ القَومُ الْكافِرونْ ﴾ وەخوا ڕانوویی تاقمی بێ باوەڕان ناكا. یانێ پاداشتیان ناداتەوە لە ڕۆژی دوایدا، چونكە بۆ جگەی خوا كارو كردەوەیان كردوە بە خەفەت باری ئەمێننەوە. بۆ وێنەی بێ ئازاران ئەفەرموێ:

﴿ ومَثَلِ الذينَ يُنفِقونَ أموالَهِمُ أبْتِغاء مَرضاةِ الله ﴾ وە وێنەی كەسانێكی ئەوتۆ ئەبەخشن و دەر ئەكەن دارایی خۆیان لەبۆ داوای كردنی خۆشبوون وە ڕەزایەتی خوا.

﴿ وَتَثْبِيتاً مِنْ أنْفُسِهِمْ ﴾ وە لەبەر چەسپاندن و دایین كردنی باوەڕی تەواو لەلایەن خۆیانەوە نەك لەبەر لای تر لە دەرونی خۆیانا.

﴿ كَمَثَلِ جَنَة بِرَبْوَةٍ أصابَها وابِلٌ فآتَتْ اكُلَها ضِعْفَيْنِ ﴾وەك وێنەی بێستان و باخێ وایە بە جێگەیەكی بەرزو بلندەوە بێو لە دەشتاییدا بێ لەو باخ و بێستانەی دابێ بارانی زۆرو بەخورِ، دوایی ئەو بێستان و باخە بەخشیبی و پەیداكردبێ خواردەمەنی و بەرهەمەكەی بە دوو بەرانبە لە ساڵێكا بە ئەندازەی دوو ساڵی پەیدا كردبێ.

﴿ فَاْنْ لَمْ يُصِبْها وابِل فَطَلٌ ﴾ دووایی ئەگەر نەی دابێ لەو بێستان و باخە بارانی بەخورِ، دووایی بەو ئەگا بارانی سووك و شەونم هەر ئەویشی بەسە ، یانی بارانەكەی زۆر بێ یا كەم ئەو باخەمبووەی خۆی هەر ئەگرێ ، هەروەك ئەو كەسانە چاكەیان زۆربێ یان كەم ،بە گوێرەی بیروباوەڕی خۆیان پاداشتان ورئەگرن هەریەكەیان.

خوای گەورە وێنەیە تر لێ ئەدا بۆ هەموو كەسێ كاری چاكە بكا، و لە پاشا كارێكی تری وابكا پاداشت و كرێكەی لەناوبدا، وەك خۆی هەڵكێشێ بەسەر هەزاراندا، لەبەر چاوان چاكە بكا، یابێ باوەڕی و هاوبەشدانان توشی خۆی بكا. وەك ئەفەرموێ:

أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ لَهُۥ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَأَصَابَهُ ٱلْكِبَرُ وَلَهُۥ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَآءُ فَأَصَابَهَآ إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَٱحْتَرَقَتْ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٦٦﴾

﴿ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَنْ تَكُونَ لَهُ جَنَّةٌ مِنْ نَخِيلٍ وَأَعْنابٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِها الْأَنهارُ ﴾ ئایا پێی خۆشە یەکێ لە ئێوە کە هەبێ بێستانێ لە درەختەکانی خورما و ترێ بڕوا بەژێر درەختەکانیانا چەندین جۆگەو ڕوبار.

﴿ لَهُ فِيها مِنْ كُلِّ الثَّمَراتِ ﴾ بۆ خاوەنی بێستانەکە هەبێ لە نێو بێستانەکەدا لە هەموو بەرهەموو میوەکان لە جگەی خورماو تریش، وەك پرتەقاڵ و سێوو هەرمێ و مۆز، خورماو ترێ چاکترینی میوەکانە، لەو کاتەدا هەر ئەوانەیان هەبووە.

﴿ وأَصابَهُ الْكِبَرُ ﴾ وەتوشی خاوەنی بێستانەکە بووبێ پیری و لاوازیو بێ هێز بووبێ و نەتوانێ ئیشێ بکا، لە هەموو لایێکەوە پێویستی زۆر ڕووی تێ کردبێ و، دارایی تری نەبێ جگە لەو باخ و بێستانە.

﴿ وَلَهُ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفاء ﴾ وەببێ بۆ خاوەنی بێستانەکە لەو کاتی پیریەدا چەندین منالی لاوازو بێ هێز، وە باوکەکەیان جگە لەو باخ و بێستانە هیچ شتێ تری نەبێ ئا لەو کاتە ناسکەدا.

﴿ فَأَصابَها إِعْصارٌ فِيهِ نارٌ فَاحْتَرَقَتْ ﴾ دوایی تووشی ئەو بێستانە ببێ و پەلاماری بدا بایێکی گێژەلۆکەی گەرم و لول بخوا بەرەو ئاسمان بکشێ لە نێو ئەو بایەدا هەبێ ئاگرێکی بەتین و گڕدار لە دواییدا ئەو باخ و بێستانە بسوتێ و ببێ بە خەڵوز، وەخاوەنەکەی سەرگەردان و دەستە ئەژنۆ دانیشێ.

زۆر ڕوون و دیارە ئەو کەسەی ئەو جۆرە ڕووداوەی پێ ناخۆشە کە بەسەر خۆیی و بێستانەکەی هاتوە. هەروەك ئەو خاوەن بێستانەیە ئەو کەسەیش بۆبەر چاوی دانیشتوان و ناودەرکردن ئەمڕۆ دارایی خۆی بدا بە هەزاران هەتا بڵێن:

مرۆڤی چاکە، لە ڕۆژی دووایدا ئەو کەسەیە بەو پەڕی پێویستی بە پاداشت هەیە کەچی نەسەردارێك و نەیاریدەو پێشوازێکی هەیە بیگەیەنێ بەو پاداشتە لای خوا، دەستی لە هەموو شتێ بڕاوە لەو کاتە ناسکەدا.

﴿ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللهُ لَكُمُ الأيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَفَكَّرُونَ ﴾ هەروەك خوا باسی چاكركردنو كۆششی لە ڕێگەی خوادا كرد، خوا بۆ ئێوەی ڕوون ئەكاتەوە نیشانە ئاشكراو بەنرخەكانی و چاكەی خۆی لەگەڵتان بۆ ئەوەی ئێوە بیر بكەنەوە، لە پەرستندا هیچ كەس نەكەن بە هاوبەشی خواو تەمێ خواربن و بزانن ئەمڕۆتان بۆ نامێنێ، چاك وایە ڕووی خۆتان وەرگێڕن بۆلای پاشە ڕۆژ.

لە ئایەتە پێشوەكاندا خوای گەورە ڕوونی كردەوە بۆ موسڵمانان پێویستە لەسەریان خۆهەڵكێش نەبن و ئازاری هەژاران نەدەن، لەمەو دوایش فەرمانمان پێ ئەدا ئەو شتانەی ئەی بەخشین پێویستە هەتا ئەتوانین لە جۆرە چاكەكان و نەختینەی دراییتان بن. نەك لە خراپ و لە دەست ماوەكانبن.

هەندێ لە موسڵمانان لەو داراییە كە بە شێوەیەكی نارەوا پەیدایان كردبوو، وەك دزی و قومار بەر لە باوەڕ هێنان ئەیاندا بە هەژاران. یا لە خورمای و شكەڵ و خراپ ئەیاندا بە هەژاران نەك لە جۆرە جاكەكانیان، بۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە، فەرمووی:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبۡتُمۡ وَمِمَّآ أَخۡرَجۡنَا لَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِۖ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلۡخَبِيثَ مِنۡهُ تُنفِقُونَ وَلَسۡتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغۡمِضُواْ فِيهِۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴿٢٦٧﴾ ٱلشَّيۡطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلۡفَقۡرَ وَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡفَحۡشَآءِۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغۡفِرَةً مِّنۡهُ وَفَضۡلًاۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦٨﴾

﴿ يا أيُها الذينَ آمَنوا أنْفِقوا مِنْ طَيباتِ ما كَسَبْتُمْ ﴾ ئـەی کەسـانێکی ئـەوتۆ باوەڕتـان هێناوە ئێوە ببـەخش لـە دارایـەکانتان لـە شـتێ ئێـوە پـەیداتان کـردووە بـە بازرگـانی و پیشەسازی و هەر کارێ تربێ و، پاك و ڕەوابێ و چاکبێ و خراپ نەبێ.

﴿ ومِما أخْرَجْنا لَكُمْ مِنَ الأرْضِ ﴾ وە ببەخشن لە شتێ ئێمە دەرمان هێناوە بۆ ئێوە لـە زەویدا وەك دانەوێڵەو بەرهەمی درختەکان. کەواتە پێویستە لەسەرتان کە قازانجتـان کـرد لە بازرگانی و کارکردنتان و لە پیشەکانتان بە گشتی، لـەوەی خـوا بـۆی دەرهێنـان لـە زەویە ئیتر دانەوێڵە بێ یا میوە. زێڕبێ یا زیو. تەوتبێ یا ئەڵماس. لەوانە هەموو پێویستە ئەو ئەندازەیە خوا دیاری کردووە بیبەخشن بە هەژاران لە جۆرە چاك و بەنرخەکانیان.

﴿ولا تيمموا الخبيث منه تنفِقون ﴾ وەئێوە نیازی خراپەی ئەو دارایی‌یە و ئەوەی ئێمە بۆ ئێوەمان دەرهێناوە لەزەوی مەکەن ئێوە ئەیبەخشن بەهەژاران.

﴿ وَلَسْتُمْ بأخِذيه إلاّ أنْ تُغْمِضوا فِيهِ ﴾ وە ئێوە خۆتان ئەو شـتە وەرنـاگرن بـۆ خۆتـان ئەگەر کەسێ تربیدا بە ئێوە لەبەر خراپیەکەی مەگەر کە ئێوە چاو بپۆشـن بـۆ وەرگرتنـی. یانێ ئێوە شتێکتان لای مرۆڤێ بێ لە بریتی چاکـەی خۆتـان خرابتـان بدەنـێ ئێـوە وەری ناگرن مگەر چاوپۆشی بکەن لە وەرگرتنی، بلێن چارەمان نیە لەوانەیە ئەمەیشمان لەکیس بچێ، ئیتر ئێوە چۆن شتی خراپ ئەدەن بە هەژاران.

﴿ وأعْلَموا أنَ اللهَ غَنِيٌ حَميدٌ ﴾ وە ئێوە بزانن بـە ڕاسـتی خـوا پێویسـتی بەکـەس نیـە هەموو سامانێ هی ئەوە، نابێ شتی خراپ ببەخشن بە هەژاران، خوا هیچ شتێکی بۆخـۆی ناوێ هەمووی بۆخۆتان پاداشتەکەی ئەگەڕێتەوە. کەواتە هەر شتێ چاکـە ئـەوە بـدەن بـە هەژاران، خوا سوپاس بۆ کراوەو هەر ئەوشایستە سوپاسە بۆ ئەو هەمو چاکانە خوا لەگەڵ ئێوەی کردووە، وەشتی چاك وەرئەگرێ پاداشتی چاکی ئەداتەوە.

کاتێ بۆمان دەرکەوت خۆگرتن لە دەست گیرۆیی هەژاران و بەخشینی دارایی خـراپ لە دلێکی خراپ و نالەبارەوە پەیدا ئەبێ، وە بشزانێ بۆلای خوا ئەگەڕێتەوە. پاش ئەوانـە خوا ڕوونی ئەکاتەوە بۆ بـاوەڕداران کـە ئـەو جـۆرە کارانـە هۆکانیـان لـە شـەیتانەوەیە،

﴿ الشَّيْطانُ يَعِدُكُمْ الفَقْرَ ﴾ شەیتان بەڵێن ئەدا بە ئێوە بە هەژاری و بە هەژاری ئەتان ترسێنێ و ئەیخاتە دڵتانەوە کە دارایی خۆتانە مەبەخشن، یا لە جۆرە چاکەکان مەدەن بە هەژاران نەوەك تووشی هەژاری بن.

﴿ ويأمُرُكُمْ بِالْفَحْشاءِ ﴾ وە شەیتان فەرمان ئەدا بە ئێوە بە کردنی گوناە، هانتان ئەدا لە شەر ڕژدی و نەدانی چاکەی دارایتان، لە جۆرە خراپەکانیان بیدەن، واتان لێی ئەکا ڕژدومشت قوچاوبن لە ئاستی هەژاران.

﴿ واللهُ يَعِدُكُمْ مغفرةً مِنْهُ وَفَضْلاً ﴾ وە خوا بەڵێن ئەدا بە ئێوە بە لێ خۆشبوون لەسەر بەخشینی داراییتان بە هەژاران لەلایەن خۆییەوە، بەوەی سامانی زۆرتان بداتێ لەم ڕۆژەدا بە هۆی چاکە کردنیان لەگەڵ هەژاران، بەوەی چاکتر لەوەی ئەی بەخشن بێتە جێگەی، باشەیتان لووتی بسۆڵێتەوە کە بەڵێن ئەدا بە هەژاریتان.

﴿ واللهُ واسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ وەخوا بەخشندەیی زۆر فراوانە، بە تایبەتی بۆ ئەو کەسانە دارایی خۆیان ئەدەن بە هەژاران، بەڵێنی خۆی جێبەجێ ئەکا لە زۆرکردنی دارایتان و لێ خۆشبونتان، زۆر زانایە کامەتان شایانی لێ بوردن و دارایی زۆرتان بداتێ، هەر یەکەتان بە گوێرەی کارو کردەوەی خۆتان.

لە کاتێکا زانیمان لە ئایەتە پێشوەکانەوە شەیتان بەڵێن ئەدا بە هەژاری و فەرمان دان بە گوناە کردن، خوایش بەڵێن ئەدا بە لێ خۆشبوون و دارایی زۆرکردن. پاش ئەوانە خوا ئاگادارمان ئەفەموێ: هەر بەڵێنی خوا سەر ئەکەوێ، چونکە بەڵێنی خوا بە گوێرەی زانایی و دانانی هەمو شتێکە لە جێگەی شیاویی خۆیدا.

بەڵام بەڵێنی شەیتان پاش ئاواتی پڕوپوچ و گۆترەکاری کەوتووە. هیچ شتێ بەرانبەر ویستی خوا خۆی ناگرێ، وە باوەڕدان هەر ئەبێ سەربکەون بە مەرجێ دوای ڕانومایی بکەون و ژیری خۆیان بخەنە کارەوە، لە خوا پەرستی لا نەدەن، خوای گەورە میهرەبانی خۆیمان بۆ باس ئەکاو ئەفەرموێ:

يُؤْتِي ٱلْحِكْمَةَ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٦٩﴾

﴿ يؤتي الحكمة من يشاء ﴾ خوا ئەبەخشێ ڕانموویی بۆ لای ڕێگەی ڕاست و بەختیاری لەهەردوو جیهاندا بەکەسێ ئارەزوی هەبێ ، بەگوێرەی زانین و میهرەبانی خۆی و دانـانی هەموو شتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا ، ئەو شتانە ئەبەخشێ بەو کەسانە و یاریدەیان ئەدا بـۆ ئەوەی بەردەوامبن لە سەر پەرستنی خواو گوێ ڕایەڵبن بۆ ئامۆژگاری قورئانی پیرۆز ، بـۆ قورئان و فەرمودەی پێغەمەر و زانینی بەسوود ، ئادەمیزاد ئەگەیـەنن بـە ڕەزایـەتی خـوا و کارکردن بۆی ، حەکیم لای خوا زانایەکی کارکەرە بۆ سوودی هەردوو جیهان .

زانایان بۆ ووشەی (الحكمة) مانای زۆریان بۆ لێك داوەتـەوە : ئامۆژگـاری ، زانـین و تێگەیشتن ، فروستادەیی ، قورئان ، زانینە ئائینییەکان ، پەرستنی خـوا ، فـێربوونی یاسـای چۆنێتی پەرسـتن و مامەڵـەکردن و هەڵسـان و دانیشـتن لەگـەڵ یـەکتری ماناکـەی هـەر کامیانبێ جێگەی خۆیەتی ، لەوانەیە هەموویان بگرێتەوە ، هەروایشە ، بەڵام ئەوەی شایانی باس بێ هەرکەسێ کارێکی چاك بکا ، بەگوێرەی زانین و ژیری خۆی ئەو کـارە جێگـەی شیاوی خۆی گرتبێ ، ئەو کەسە پێی ئەوترێ خاوەن حیکمەت، کەواتە هەر پێغەمـەران یـا زانایان و دۆستانی خوا خاوەنی حیکمەت نین ، بگرە هەر کەسێ کارێکی بەچاکی کردبـێ پێی ئەبێژرێ خاوەن حیکمەت ، جوتیار بـێ یـا پیشەسـاز ، بازرگانبـێ یـا موچـە خـۆر ، ئامۆژگاری کەر بێ یا خوتبە خوێن، کاربەدەست بێ یا ژێردەستە ، سەرباز بێ یا قوتابی ... هەتا دێ .

﴿ ومن يؤت الحكمة فقد أوتي خيراً كثيراً ﴾ وەهەرکەسێ ببەخشرێ بەو زانین و کاری لە جێگەی شیاوی خۆیدا و ، ڕانموویی وەرگرت بەڕاستی بەخشـراوە بـەو کەسـە چاکـەی زۆر، بەشێوەیە جگە لەخوای گەورە کەسی تر نەیزانێ .

تەفسیری زمناکۆیی

﴿ وما يذكر إلا أولوا الألباب ﴾ وەئامۆژگاری وەرنگرێ بەئامۆژگاری خواو کاری پێ ناکا مەگەر خاوەن ئەقڵەکان ، ئەوان ئامۆژگاری قورئان بەهەموو چاکە زۆرەکانیەوە کاریان تێ ئەکا ، ئەبێتە هۆی پاداشتی هەردوو جیهانیان ، ئەوەی ڕاستی بێ مرۆڤی ژێر بەدڵێکی بێ گەردەوە باوەش بۆ چاکە ئەگرێتەوە ، خۆی گێل و گەوج ناکا و ناکەوێتە نێو گومڕایی . لەو چاکە زۆرانەیە دواکەوتنی ژێری بێ گەرد و ئاینی ڕاست و دانانی هەموو شتێ لەجێگەی بۆ دروست کراوی خۆی .

کەواتە ئەو کەسانەی بۆنبای هایدرۆجین و نیترۆن و ناپاڵم و کەشتی بۆشایی دروست ئەکەن بەوان ناوترێ خاوەن حیکمەت ، چونکە بۆ کاری چاکە و جێگەی چاك بەکاری ناهێنن ، ئەو کەسانە خاوەن ستەم و خوێن خۆر و خوێن ڕێژن . وەك زانراوە بۆنبای وایان دروست کردووە توانای سەد ملیۆن تەقەمەنی تێدایە ، ئەتوانێ لە یەك چرکەدا سەد ملیۆن کەس بکوژێ ، ئەو کەشتیە بەزۆری هەر بۆ ئەوەیە جێگەو شوێن بۆ فڕۆکە جەنگیەکان دیاری بکا کەهەرچی گیانلەبەر هەیە لەوجێگەدا بەیەك چرکە لەناوی ببەن . ئەو پڕوپاگەندەیەی ئەوان بلاوی ئەکەنەوە کەئەوانە بۆ بوژانەوەی ئادەمیزادە کردەوەی ئەوان و تاقی کردنەوەی دانیشتوان بەدرۆیان ئەخاتەوە . شاری هۆراشیما چاکترین بەڵگەیە بۆمان . هەروەها گازی کیمیاوی بەکارهێنرا لەهەڵەبجەی شەهیدا.

کەواتە ئەو کەسانە فڕیان بەحیکمەتەوە نیە بگرە خوێن مژ و خاوەن ستەم و دوژمنی ئاشتی و ئادەمیزادن .

جارێ تر خوای گەورە دێتەوە سەرباسی چاکەکردنی موسوڵمانان و هاندانیان . خوا ئەفەرموێ هەرچاکەبکەن ، ئەو کەسانەی خێزانەکانیان بەخێو ئەکەن وەیا پێویست ئەکەن لەسەر خۆیان چاکەیەبکەن خوای گەورە ئەزانێ بۆ چ شتێ ئەیکەن ، چاکەکان بشارنەوە یا نەیشارنەوە ، ئاگادارە کامیان ڕاست ئەکەن و کامەیان ستەمکارن . ئەفەرموێ :-

وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُهُۥ ۗ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٢٧٠﴾ إِن تُبْدُوا۟ ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ ۖ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّـَٔاتِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٧١﴾

﴿ وما أنفقتم من نفقةٍ ﴾ وەشتێ ئێوەی باوەڕدار بەخشیوتانە و دەرتـان کـردووە لـە ئازوخە بۆ ڕێگە خوابێ یا لـەڕێگەی شەیتانا بێ لـەئازوخە پێوست کراوەکانبێ یان پێویست نەکرابێ لـەسەرتان ، کەمبێ یا زۆر ، لـەڕێگەی چاکەدا داتان نابێ یا لـە گوناها ، بەئاشـکرا دابێتیان بەهەژاران یان بەنهێنی .

﴿ أو نذرتم من نذرٍ ﴾ یا پێویستان کردبێ لـەسەر خۆتان بەهـەر شـتێ بـێ لـەپەرستنی خوادا دوایی ئێوە ئەو شتەتان بەجێ هێنابێ .

(نذر) ئەوەیە ئادەمیزاد پێویست بکا لـەسەر خـۆی شـتێ کەپێویسـت نـەبوبێ ، (نـذر) بەگوێرەی یاسای ئیسلام ، بەوە ئەبێژرێ ئـادەمیزاد شـتێ پێویسـت بکـا لـەسـەر خـۆی ، بەئەندازەیەکی دیاری کراو لـەدارایی خۆی کەببەخشێ لـەڕێگەی خوادا بەهۆی ڕستەیەکی تایبەتی ناسراو ، نەك هەر بەتەنها لـەدڵدا بڕیاری پێ بـدا ، وەك بڵـێ : لـەسـەرم بـێ . یـا پێویستبێ لـەسەرم پێنج دینار یا زۆرتر یا کەمتر بەبەخشم لـەڕێگەی خـوادا ، پێویستە هـەر لـەبەر خوابێ و لـەڕێگەی ئەودابێ . کەواتە ئەگەر مرۆڤێ ووتی : لـەبەر پێغەمـەر یـا لـەبـەر

فلاَن دۆستی خوا ئەو وولاَخە سەر ئەبڕم ، یا ئەو ئەندازە پارەیە ببەخشم ئەو بەڵێنە پووچە و دانامەزرێ و قەدەغەیشە . بگرە بەهاوبەشدانان بۆ خوا دائەنرێ .

﴿ فإن الله يعلمه ﴾ دوایی بەڕاستی خوا ئەو شتەی ئێوە ئەیبەخشن یا پێویستی ئەکەن لەسەر خۆتان ئەیزانێ و پەنهان نیە لای ئەو ، پاداشت و تۆڵەی بەگوێرەی مەبەستی خۆتان وەرئەگرن ، ئیتر بۆ خواتان کردبێ یا بۆ شەیتان .

﴿ وما للظالمين من أنصار ﴾ وەنیە بۆ ستەمکاران هیچ پشتیوان و یاریدەدەرێ ، ستەمکاران ڕژدو خۆ هەڵکێشن ، یا ئازاردەری هەژارانن و هیچ شتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دانانێن ، یا لەبەر ناو دەرکردن ئەیبەخشن ، یا لەبەڵێنەکەی خۆی پەشیمان ئەبێتەوە ، ئەو کەسانەی بەو جۆرە بن بێ یاریدەدەرن و پاڕانەوەی هیچ کەسێ بۆیان وەرناگیرێ بۆ لابردنی سزای خوا لەسەریان .

لەمەو دوا باسی دامەزراندنی نەزر و مەرجەکانی ئەکەین بەکورتی :-

موسوڵمانان بەگشتی پێك هاتوون بەبەڵگەی ئەو ئایەتە لەسەر ئەوەن ئەگەر موسوڵمانێکی ژیر و باڵغ ، پیاوبێ یا ژن پێویستی کرد لەسەر خۆی کارێکی چاك بکا پێویست ئەبێ لەسەری ئەو کارە بکا . سەربەخۆ پێویستی بکا لەسەر خۆی یا ببەستێ بەشتی ترەوە ... پایە و ڕوکنەکانی نەزر ئەمانەی خوارەوەن ، بەبێ ئەوانە نەزر دانەمەزرێ:-

١- پێویست کەر (ناذر) مەرجە موسوڵمان بێ . بەئارەزوی خۆی بێ و زۆری لێنەکرابێ . بتوانێ دەست کاری دارایی خۆی بکا ، منالّ و شێت نەبێ .

٢- ڕستەیە بەکاربهێنێ بەڵگەبێ لەسەر پێویست کردن (الصيغة ) وەك بڵێ : پێویستبێ لەسەرم بۆ خوا ئەو کارە چاکە بکەم .

٣- پێویست کراو (المنذور) مەرجە ڕەوابێ . نەك قەدەغە بێ ، وەك بەخشینی دارایی پاك ، نوێژو ڕۆژوو حەج و خوێندنی قورئان .

نەزر لەسەر دوو بەشە :-

١- ( نذر لجاج ) یانی درێژە دان بەناکۆکی ، چونکە بەزۆری لەکاتی تورەیی و رقدا ئەبیژرێ ، بەو جۆرە مرۆڤێ خۆی یاکەسێ تر قەدەغە بکا لە کردنی کارێ یا هانیان بدا بۆ کردنی کارێ ، یا بیەوێ کارێ جێبەجێ بکا . بلێ ئەگەر لەگەلتا گفتوگۆم کرد ، یا ئەگەر ئەو کارە بەو جۆرە نەبوو سێ رۆژ بەرۆژوو بم ، یا پێنج دینار بدەم بە هەژاران ، ئەو جۆرە نەزرە پێویستە ئەو مرۆڤە یا ئەو شتانە بکا ، یاوەك سوێند بریتی بۆ بدا بەهەژاران .

٢- (نذر تبرر) یانی بەلێن دان بەکردنی چاکە بەبێ تورەیی ، بەجۆرێ بلێ : ئەگەر خوای گەورە نەخۆشیەکەی چاك کردمەوە پێویست بێ لەسەرم سێ رۆژ بەرۆژوو بگرم ، یا پێنج دینار ببەخشم ، لەو کاتەدا پێویستە ئەو کارانە بکا ، ئیتر هەرکاتێ بێ دروستە . یابلێ : ئەگەر کورەکەم هاتەوە لەبەغدا دیناری ببەخشم یا سێ رۆژ بەرۆژوو ببم ، هەر کاتێ کورەکەی هاتەوە پێویستە ئەو کارە دەست پێ بکا .

لەمەوبەر خوای گەورە باسی بەخشینی دارایی کرد بۆمان لەرێگەی خوادا .

لەمەوپاش بۆمان روون ئەکاتەوە کەبەئاشکرا ببەخشێ یا بەپەنهانی هەردوو لایان چاکە، ئەفەرموێ :-

﴿ إن تبدوا الصدقات فنعما هي ﴾ ئەگەر ئێوە ئاشکرای بکەن چاکە و بەخشینەکانتان لەکاتی دانیان بەهەژاران ، لەدووایدا ئاشکرا کردنی ئەو بەخشینە شتێکی چاکە . هەتا ببێتە هۆی هاندانی دانیشتوانی تر بۆ چاکە کردن و چاولێ کردنی ئێوە ، بۆ ئەوە ئێوە بیکەن بەبەلگە بەسەر پیاوانی رژدەوە ، دلی خاوەن سامانیش بەو ئاشکرا کردنەی ئێوە نەرم ببێ لەسەر بەخشین .

﴿ وإن تخفوها وتؤتوها الفقراء فهو خير لكم ﴾ وەئەگەر ئێوە ئەو چاکە و بەخشینەتان بشارنەوە وەبیان بەخشن بەهەژاران ، دوایی ئەو پەنهان کردنە چاکترە بۆ ئێوە لەئاشکرا کردنیان ، دوورە لەبەرچاویی ، هەژارانیش لەتانەی دوژمنان و بێ ئابرویی دوور ئەبن و

کەس بەوان نازانێ ، مرۆڤ بەگوێرەی سروشت وای پێ خۆشــە هیــچ کەســێ ئاگــای لێ نەبێ.

ئەو شتانەی باس کران مانای دەرکەوتووی ئەو ڕستانەیە ، بەڵام هەندێ لەزانایان ئەڵێن ئەگەر چاکەکانتان پێویست بوون بەئاشکرا بیان دەن بەهــەژاران هــەتا بــۆ هــەموو کەســێ پەرستنی خوا دەربکەوێ ، ئەگەر چاکەکانتان لەپێویستەکان نەبوو بەنهێنی ببەخشــن هــەتا لە ناوبردن و لەبەرچاوی دوور بن .

﴿ ویکفر عنکم من سیئاتکم ﴾ وەخوا بۆ ئێوەی لائەبا هەندێ لەخراپەکانی ئێــوە نــەك هەموویان بە چاکەکردنتان لەگەڵ هەژاران . بەمەرجێ ئەو خراپانە ستەمکردن لەئادەمیزاد نەبێ .

﴿ واللە بما تعملون خبیر ﴾ وەخــوا بەشــتێ ئێــوە بیکــەن لەچاکــەکردنتان بەئاشــکرا و بەنهێنی بە هەژاران ئاگادارە و ئەیزانێ .

موسوڵمانان چاکەیان لەگەڵ بێ باوەڕان نەئەکرد باوەکو خزمیشــیان بوونایــە ، ئەگــەر داوای بەخشینی شتێکیان بکردایــە ئــەیان ووت ، هــەتا موســوڵمان نــەبن هیــچ شــتێکتان نادەینێ ، بۆیە خوا فــەرمانی پێــدان بەچاکــەکردنی لەکــەڵیان بــاوەکو بــێ بــاوەڕبن خــوا ئەفەرموێ :

لَّيۡسَ عَلَيۡكَ هُدَىٰهُمۡ
وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُۗ وَمَا تُنفِقُواْ مِنۡ خَيۡرٖ
فَلِأَنفُسِكُمۡۚ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ ٱللَّهِۚ
وَمَا تُنفِقُواْ مِنۡ خَيۡرٖ يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ

﴿٢٧٢﴾ لِلْفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحْصِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِى ٱلْأَرْضِ يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَٰهُمْ لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا ۗ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢٧٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ سِرًّا وَعَلَانِيَةً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٧٤﴾

﴿ ليس عليك هداهم ﴾ لەسەر تۆنیە موحەمەد ڕانموویی ئادەمیزاد و لەسەر تۆ پێویست نەكراوە ، وەئەو شتەی لەسەر تۆیە شارەزایی كردنی ئەوانەو بانگ كردنیان بۆ لای ئاین، هیچ كەس نابێ ئازاری بدرێ بەنەبەخشینی دارایی لەم ڕۆژەدا بەهۆی باوەڕنەهێنانیەوە ، نابێ تەنگەتاویان بكەن بۆ باوەڕ هێنان باوەكو لەلایەن پێغەمەریشەوە بێت .

﴿ ولكن الله يهدي من يشاء ﴾ وەبەلام خوا ڕانموویی كەسێ ئەكا ئارەزوی هەبێ ، ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی چاكەكردن و دەست گیرۆیی بێ باوەڕان بەدارایی دروستە ، ئایا بەو داراییە كەپێویست كرابێ وەك زەكات دروستە یا نە ؟ بەگوێرەی فەرمودەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ زەكات دان بەبێ باوەڕان دروست نییە ، پێویستە لەجگەی پێویست كراو دەست گیرۆیی بكرێن بێ باوەڕان .

﴿ وما تنفقوا من خير فلأنفسكم ﴾ وەهەر شتێ ئێوە ببەخشن لەچاکەکردن بەدەرامەتی خۆتان دوایی پاداشتەکەی بۆ خۆتانە ، ئیتر بەموسوڵمانانی بدەن یا بەبێ باوەڕان یەکسانە لای خوا .

﴿ وما تنفقون إلا أبتغاء وجه الله ﴾ وەئێوەی موسوڵمانان نەبەخشن دەرامەتی خۆتان مەگەر بۆ داواکردنی پاداشتی خواو ڕەزایێتی خوا و مەبەستتان هەر خوابێ ، هەر خوایش لێتان وەرئەگرێ بەموسوڵمانانی ببەخشن یا بەبێ باوەڕان ، بەمەرجێ لەدارایی پاك بێ نەك خراپ ، ئازاری کەسیش مەدەن بەخۆ هەڵکێشان بەسەر هەژاراندا .

﴿ وما تنفقوا من خيرٍ يوف إليكم وأنتم لا تظلمون ﴾ وەهەر شتێ ئێوە ببەخشن لە چاکەی داراییتان ئەو چاکەیە پاداشتەکەی ئەدرێ بەئێوە بەچەندین چەندانە ئیتر بیانوتان نامێنێ کەنەیبەخشن لەداراییە چاکەکانتان ، ئێوە ستەمتان لێ ناکرێ بەکەم بوونەوەی پاداشتەکانتان ، ئیتر با ئەو کەسە ئەیدەنێ بێ باوەڕبێ ، بەمەرجێ هەژار بێ .

کۆمەڵێ لەموسوڵمانان کۆچیان کرد بۆ مەدینە ، وازیان لەنیشتمان و دارایی خۆیان هێنا بوو ، خۆیانیان بۆ بەرزی ئیسلام تەرخان کردبوو ، لەمەدینەدا نەخزم و نەدەرامەتیان هەبوو ، بۆیان نەئەکرا کارێ بکەن بۆ ژیانی خۆیان ئەو کەسانە ئەگەیشتنە (٣٠٠) هەتا (٤٠٠) کەس ، جێگەی ئاسایش و ئارام گرتنیان نەبوو . لەبەر بێ جێگەیی لەمزگەوتا دائەنیشتن بۆ خواردن و خەوتن . خوا پەرستیان ئەکرد و هەندێ جاریش پاسەوانی خانووەکانی پێغەمەریان ئەکرد ، فێری قورئان ئەبوون کە گەورەترین پەرستنە ، لەگەڵ پێغەمەریشدا ئەچوون بۆ جەنگ ، لەسێبەری مزگەوتا خۆیانیان ئەحەسانەوە . پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ زۆر جاران دڵخۆشی ئەدانەوە ، ئەیفەرموو هەرکەسێ وەك ئێوە وابێ و ڕازی بێ بەوەی تووشی بووە ، بەڕاستی لەهاوڕێکانی منە و موژدەتان ئەدەمێ . ئەوکەسانە بەوان ئەبێژرا (أهل الصفة ) ، ئەوان لەهەموو کەس زیاتر شایانی دەست گیرۆیین. ئەم ئایەتە دەربارەی ئەوان هاتە خوارەوە فەرمووی :

﴿ للفقراء الذين أحصروا في سبيل الله ﴾ ئەو چاكە و بەخشینە بۆ كەسانێكی ئـەو تۆیـە وڕێگەی لێی گرتون جەنگ كردن لەڕێگەی خوادا و قەدەغەی كردوون لـەكاركردن بـۆ گوزەرانی خۆیان .

﴿ لایستطیعون ضرباً في الأرض ﴾ ئەو هەژارانە توانایـان نیـە بـەهۆی خـەریك بونیـان بەجەنگەوە بڕۆن و هاتوچۆ بكەن بەزەویدا بـۆ بازرگـانی و كـاركردن بـۆ ژیـانی خۆیـان بەهۆی جەنگەوە .

﴿ یحسبهم الجاهل أغنیاء من التعفف ﴾ گومان ئەبەنە ئەو هەژارانە كەسێكی نەزان و بێ ئاگا لـەچونێتی ئەو هەژارانە كەساماندارن لـەبەر ئەوەی خۆیان ڕاگرتووە لەداواكردنیان لـە دانیشتوان و داوای هیچ شتێكیان لێ ناكەن .

﴿ تعرفهم بسیماهم لایسألون الناس إلحافاً ﴾ تـۆ ئـەو هەژارانـە ئەناسـی كـە هـەژارن بەهۆی نیشانەی شێوازیان كەلاواز و ڕەنگ زەردن ، داوای هیچ شتێ ناكەن لـــەئادەمیزاد بەقیرسچمەیی و یەخەیان بەرنەدەن هەتا شتێكیان ئەدەنێ .

﴿ وما تنفقوا من خیرٍ فإن الله به علیم ﴾ وەشتێ ئێـوە ئەیبەخشـن لەچاكـە و بەخشـین بەهەژاران دوایی بەڕاستی خوا بەو شتە ئەزانێ و لـەناوی نابا .

خوای گەورە لـەو ئایەتەدا باسی دانیشتوانی سێبەری مزگەوت بەچاكــە ئـەكا بەمانـەی خوارەوە :

١- ئەو كەسانە خۆیانیان تەرخان كردووە بۆ جەنگ و فێربوونی قورئان و پەرستن بـۆ خوا .

٢- ناتوانن هاتوچۆ بكەن بەسەر زەویدا بۆ بازرگـانی و كـاركردن لـەبـەر كـارێكگی گرنگتر .

٣- ئەو كەســانە خۆپـارێزن لەپاڕانـەوەیان لـەگـەڵ ئـادەمیزادا بـۆ بەدەســت هێنـانی دەرامەت .

٤- نیشانەی هەژاری بەئاسانی لەڕوومەت و شێوازیان دەرئەکەوێ بەهۆی لاوازی و ڕەنگی زەردیانەوە .

٥- بەو ئایەتە بۆمان دەرئەکەوێ داواکردنی هەر شتێ لەئادەمیزاد قەدەغەیە بەواز نەهێنان لەوان هەتا شتێ بەدەست ئەهێنن ، پێویستە باوەڕداران خویان لابەرز بێ و پشت بەخوا ببەستن .

خوای گەورە باسی ئەو کەسانە ئەکا کە دارایی خۆیان بە شەوو بەڕۆژ بەنهێنی و بەئاشکرا ئەبەخشن ، خوا بەڵێن بەوان ئەدا پاداشتی گەورەی بۆ داناون ، لەهەردوو جیهاندا خەفەتباریان ناکا ، چونکە هەموو کاتێ خۆیانیان داناوە لەڕێگەی هەژاراندا ؛ بۆیە خوا ئەفەرموێ :

﴿ الذين ينفقون أموالهم بالليل والنهار سراً أو علانية ﴾ کەسانێکی ئوتۆ ئەبەخشن دارایی خۆیان بەشەو و بەڕۆژ بەپەنهانی و بەئاشکرا .

﴿ فلهم أجرهم عند ربهم ﴾ دوایی بۆ ئەو کەسانە هەیە پاداشتی چاکەکانیان لەخزمەت پەروەردەکەری خۆیان کەبریتی‌یە لەبەهەشت و ڕابواردنی هەتاهەتایی .

﴿ ولا خوف عليهم ولا هم يحزنون ﴾ وەترسیان لەسەر نابێ و ، ئەوان خەفەتبار نابن.

ئەو ئایەتە هاتوەتەخوارەوەە دەربارەی ئەو کەسانە هەموو کاتێ خۆیان دائەنێن بۆ خزمەت کردنی هەژاران ، بەردەوامن بۆ بەخشینی دەرامەتی خۆیان بەوان هەرکاتێ ئادەمیزاد تووشی هەژاری و ناخۆشی بێن کوتوپڕ پێویستەکانیان جێ‌بەجێ ئەکەن شەو بێ نایخەنە ڕۆژ ، ڕۆژبێ نایخەنە شەو ، بەنهێنی و بەئاشکرا خەریکن بۆ خزمەتیان . کەواتە ئەو ئایەتە بۆ هۆیەکی تایبەتی نەهاتووەتە خوارەوە . هەرچەندە هەندێ لەزانایان ئەڵێن : هاتوەتە خوارەوە دەربارەی ئەبوبەکری کوڕی قوحافە کە هەزار دیناری بەخشی بەشەو ، هەزار دیناری بەخشی بەڕۆژ ، هەزار دیناری بەخشی بەنهێنی ، هەزار دیناری بەخشی بەئاشکرایی ، هەندێ لەزانایان ئەڵێن : دەربارەی عەلی کوڕی ئەبوتالیب کەتەنها چوار

درهەمی هەبوو ، درهەمێکی بەشەو و درهەمێکی بەڕۆژ ، درهەمێکی بەنهێنی و درهەمێکی بەئاشکرایی بەخشی .

خوای گەورە چوار ئایەتی یەك لەدوای یەك لەباسی هەمەجۆرەی ئەو کەسانەی دەرامەتی خۆیان ئەبەخشن بەهەژاران و لەڕێگەی خوادا ، یا لەڕێگەی شەیتانەو بەرچاوی و ناودەرکردن ناردوەتە خوارەوە ، بەو ئایەتە کۆتایی پێ هێناوە .

دەست گیرۆیی هەژاران بەدوو جۆرە دارایی ئەکرێ :

یەکەم : بەداراییە پێویست نەکراوە لەسەر موسوڵمانان لەلایەن خوای گەورەوە . بەڵام باوەڕبوون بەخوا پاڵیان پێوەئەنێ و بەچاکی ئەزانێ لەدەرامەتی خۆیان بەشی هەژاران بدەن با پێویستیش نەبێ لەسەریان .

دووهەمیان : بەدەرامەتێ کەلەلایەن خوای گەورەوە بەئەندازەیەکی دیاری کراو پێویست کراوە بۆ هەژاران و بۆ پێویستیە گشتیەکان ، ئەم جۆرە بەشەیان پێی ئەوترێ : **زەکات** ، زەکاتیش مافێکی دیارکراوە بۆ ئەو لایەنانە دانراوە لەسامانی ئادەمیزاد ، زەکات پایەی سێهەمی پێنج پایەکانی ئیسلامە کەبریتین لە (**شایەتمان ، نوێژ ، زەکات ، حەج ، ڕۆژوو**)

هەندێ لەزانایانی خاوەن خبرەت وایان داناوە کە زەکات یا پەیڕەوێکی ئابووری‌یە یا دەستوری ئابووری ئیسلامە ، هەندێ تریان وایان داناوە زەکات زەریبەیە و سەرانەیە کەخراوەتە سەر دەرامەتی ساماندااران ، ئەوپەڕی ڕێزم بۆیان ئەوەی ڕاستیبێ زەکات نەدەستوری ئابووری‌یە و نەزەریبەیشە ، زۆر دوورە لەوانەوە ، چونکە مەرجی بنچینەیی بۆ دروست بوونی زەکات وەرگرتنی لەخاوەن دەرامەت و لەهەژاران هەر بۆ ئەوەیە پەرستنبێ بۆ خوا ، بەبێ ئەو مەبەستە زەکات لەلایەن خوای گەورەوە وەرناگیرێ .

بائەمەیش بزانین دەستوری ئابووری بەمانای ئەم سەردەمە بریتیە لەپشت بەستن بەکەرەستە و هۆیەکانی بەرهەم ، وەك زەوی و زار و کانگای پیشەسازی کەدەرامەتی

چەند کەسێکی تایبەتیە کەدەستیان بەسەردا گرتووە لەسەرمایەدارانی ڕۆژئاوا ، یا بەدەرامەتی هەموو گەلی دائەنێن و ، کاربەدەستان سەرپەرشتی ئەکەن ، وەك سۆشیالیستەکان ئەیلێن ، ئەو یاسایە کەبۆ زەکات دانراوە زۆر زۆر لەوانەوە دوورە ، زەریبەیش کاربەدەستان وەری ئەگرن و بەس ، هەر ئەوانیش پێویستە ببیەخشن ، خاوەنەکەی ناتوانێ بەکەسی تری بدا ، نایشتوانێ نەیدا بەکار بەدەستان .

بەڵام هەمووزانایان پێك هاتوون لەسەر ئەمەی خاوەن دەرامەت خۆی ئەتوانێ بەبێ ئاگاداری کاربەدەستان زەکات ببەخشێ بەجێگەی دیاری کراوی خۆی ، بڕوایشی پێ ئەکرێ بەبێ سوێندخواردن و بەبێ شایەت .

کەواتە زەکات لەکوێ و زەریبە لەکوێ ؟ بگرە ئەو کەسە لەلایەن کاربەدەستانەوە دانراوە بۆ کۆکردنەوەی زەکات ئەتوانێ بەبێ پرسی ئەوان ببیەخشێ بەهەژاران .

لەوانەیە یەکێ بلێ : پێویست کردنی زەکات ئەوەمان بۆ دابین ئەکا کە هەژاری سروشتی‌یە و پێویست کراوە لەژیانا ، بۆیە ئیسلام ئەیەوێ چارەی بکا بەهۆی زەکات و پیتاکی ترەوە ، بۆمان دەرئەکەوێ لەئەنجامدا ئیسلام ئادەمیزاد ئەکا بەدوو چین ، یانی چینایەتی پەیدا ئەکا بەهەژاری و بەساماندارى و ئەو یش ڕەوا نی‌یە ، وەلامی ئەو جۆرە کەسانە بەمانەی خوارەوە ئەدرێتەوە :

١- ئەوە جێگانەی زەکاتیان بۆ دانراوە وەئەبێ هەر ئادەمیزاد بن هەتا ببێژرێ ئیسلام بەچینایەتی ڕازیە ، بەڵکو زەکات بۆ هەموو سوودە گشتی‌یەکان دانراوە ، وەك ئازوخەی جەنگاوەران و هەموو چاکە گشتیەکان لەو کاتەدا ئادەمیزادی هەژار دەست نەکەوێ ، کەواتە پێویست کردنی زەکات لەبەر ئەوە نیە ئیسلام بەچینایەتی قیناتە ، چونکە وائەبێ هەژار هەر نەبێ .

٢- بەڕاستی ببێژرێ ژیانی کۆمەلایەتی (الضمان الأجتماعي ) گرتویەتە ئەستۆی خۆی بۆ پەك کەوتووان و بێ دەرامەتان کەبیانپارێزێ لەهەژاری و ئاوارەیی ، ئەو جۆرە بەخێو

کردنە پەیدا بووە لەشارە سۆشیالیستەکانی ئـەوتۆ کـەبڕوای بـەجیاوازی چینایـەتی نیـە ، هەموو ئادەمیزاد ئەگرێتەوە بەبێ بیرکردنەوە ، بەزەکات و دەرامەتی تریش پێویستی ئـەوان جێبەجێ ئەکرێ .

٣- ئێمە چ شتێ بکەین بۆ نەخۆشێ خاوەنی پارەی دەرمان نەبێ ، بـەمرۆڤێکی برسـی ئەوتۆ دەستی نەکەوێ کارێ بۆ خواردەمەنی خۆی لەکۆمەڵگایـە بـاڵی کێشـابێ بەسـەریا گەندەڵی ژیانیان ، ئایا ئێمە واز لـەو کەسانە بهێنین هەتا ئەو کارە گەندەڵانە چـاك ئـەبن و نیشانەی هەژاری و خراپە نامێنێ و جیهان خـۆی بۆخـۆی چـاك ئـەبێ ، یـا ئێمـە یاسـایە دروست بکەین بگرێتە ئەستۆی خۆی ژیان بۆیان و ڕێگە بگرێ لەخراپەیان ؟ . لەپاشا ئایا ئەگونجێ گۆڕانی ئەو خراپانە ونەمانی هەژاری بەماوەیەکی کەم و بـەبێ ئـەوەی کۆمـەڵگا چەند تەوەر و پلەیەك ببڕێ ؟ بێگومان ناگونجێ ، پێویستە ئادەمیزاد خۆی مـاندو بکـا و ، بەهۆی زەکات و دەرامەتی ترەوە ئەو کارە خراپانە بنەبڕ بکەن ، بێ ئەوەی بیر لەچینایـەتی بکرێتەوە .

بەڕاستی ئیسلام هەڵساوە بەدژی لاوازی ئادەمیزاد بەهـەموو شێوەیە بـە بەتایبـەتی بـۆ قەلاچۆکردنی هەژاری . بەڕاستی پەیامی ئاسمـانی گرتویەتیـە ئەسـتۆی خـۆی ڕێزگرتـن و بەختیاری ئادەمیزاد ، هەژاری ئەو پەڕی کەم کردنەوەی ڕێز و بەختیاریە بۆیـان . ئیسـلام هەرگیز ئەوەی ناوێ ئادەمیزاد بێڕێز بێ ، ئیتر چـۆن چینایـەتی بەهـەژاری و سـامانداری پەیدا ئەکا کە ئەوپەڕی بێ ڕێزیە ، ئیسلام قەدەغەی ناکـا هـەندێ لـەئادەمیزاد دەرامـەتی لەهەندێ تریـان زۆرتربـێ بەبۆنـەی مـاندوو بـوون و زانیـاری هـەندێکیان لـەوی تریـان بەجۆرێکی وا لـەئـەندازەی گونجـاو دەرنـەچێ ، بـەلاّم ئیسـلام بـەرەوای دانانـێ هـەندێ لەئادەمیزاد هەژار بن و بێ هێز بن و ژێردەستەی ناڕەوا بن .

ئیسلام هەر بۆ هەژاران زەکاتی دانەناوە ، وەك هەندێ وای ئەزانن ، بەڵکو دانـراوە و کراوە بەیاسا بۆ لابردنی دەیان کوێرەوەری کۆمەڵایەتی کەیەکێ لەوانـەلابردنی هەژاریـە ،

ئەوانی تریش وەك بنەبڕكردنی كۆیلـەیی بـەگوێرەی توانـا بـەندەكان بكڕێـن بـەزەكات ڕزگاریان بێ لەبەندایەتی ، بۆ ڕێك خستنی لەشكری ئیسلام ، بۆ دروستكردنی مزگەوت و پرد و خەستەخانە و زانكۆ و پەیمانگا و سازكردنی شوێنی حەسانەوەی هـەتیوان و پـەك كەوتووان . ئەگەر كاتێ هات هەژاری لەنێو ئادەمیزادا نـەما ، پێویسـتیان بـە هیـچ شتێ نەبوو ، لەهەم و لایەكەوە كەم و كوڕیان نـەما ، لـەو كاتـەدا پێویسـتی زەكـات لەسـەر ئادەمیزاد هەڵئەگیرێ ، چونكە جێگەی بەخشینی دەستناكەوێ . كەوابو لـەكوێ زەكـات چینایـەتی دروسـت ئـەكا ، ئـەو كاتـە هـەردێت چونكـە پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ ئەفـەرموێ : (دەرامەتەكانتان ببەخشن بەر لەوەی كەلەمە و پاش كاتێ دێت خـاوەن زەكـات ئەگـەڕێ كەسی دەست ناكەوێ وەری بگرێ چونكە هـەمویان خـاوەن سـامانن ) بوخـاری (بـاب الفتن) .

ئیسلام پێویسـتی كـردوە لەسـەر خـاوەن دەرامـەت كـەزەكات ببەخشـێ بەهـەژاران لەرێزیان كەم نەكاتەوە و هەستیان بریندار نەكەن و وابزانێ پێویستی سەرشـانی خۆیـەتی و پێویستە لەسەری و ئەیداتەوە .

ئیسلام بەبێ گومان پێش هەموو ئاین و یاسای دەستكرد كەوتوەو لە بەخشین و دانانی زەكاتا ، ئەو یاسا مرۆڤایەتی‌یە هیچ كەسێ ڕێگەی پـێ نـەبردووە بـەر لەئیسـلام ، لـەپاش ئیسلام بەسەدان ساڵ جگەی موسوڵمانان ناچار بوون زەكـات بكـەن بەیاسـا بۆخۆیـان ، بەڵام ناویان نا ( الضمان الأجتماعي ) .

گەورەترین و چاكترین كاری ئیسلام بۆ هەژاران ئەمەیە هەموو یـەكێكیان بـە گوێـرەی توانای خۆیان بخرێنە كاركردنەوە هەتا هەست نەكەن بەناتەواوی خۆیان لەژیاندا هـەتا بـەر میهرەبانی خوای گەورە بكەون : كەبەندەی كاركەری خۆش ئەوێ .

خوای گەورە لەئایەتە پێشوەكانا باسی بەخشینی دەرامەتی بۆ كردین كە پێویستە بەهیچ مەبەستێ نەیبەخشن بۆ جگەی خوا ، بۆ پاك كردنەوەی خـۆی و دەرامەتەكـەی بـێ ، بـۆ

هاوسەری بەیەکەوە نوسانی ئادەمیزاد بێ بەبرایەتی . لە مەوپاشیش باسی سودمان بۆ ئەکا کە دژی ئەو بەخشینەیە ڕامان بوارد ، ئەبەخشێ دارایی خۆی بەمرۆڤێ بەشێوەیە پارەکەی خۆی بەزۆرترەوە وەربگرێ ، ئەو جۆرە مرۆڤانە تێرناخۆن و چاوچنۆکن و پارە ئەدەن بەدانیشتوان بەخراپەی خۆی وەری ئەگرێتەوە بۆ پاشەڕۆژی ، ئەو کەسانە داگیرکەری سامانی ئادەمیزادن ، زیانەکانی سوود (الربا) لەپاش مانا کردنی ئەم ئایەتانەی خوارەوە بەکورتی باسیان ئەکەین خوا یاریدەمانبێ ، بەتایبەتی پیت و فەڕی دەرامەت و مرۆڤایەتی نایەڵێ ، بۆیە خوا ئەفەرموێ :

ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَـٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰاْ ۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ ۚ فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٢٧٥﴾ يَمْحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرْبِى ٱلصَّدَقَـٰتِ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ ﴿٢٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ

وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٧٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَذَرُوا۟ مَا بَقِىَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ فَأْذَنُوا۟ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ ۚ وَأَن تَصَدَّقُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٨٠﴾ وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِ ۖ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٨١﴾

﴿ الذين يأكلون الربا ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ ئەخۆن دەرامەتی سوود ، سود یانێ زۆرکردن ، یانی ئەو کەسانە مامەڵەئەکەن و زۆرتر لەوەی خۆیان داویانە ئەی سێنن و وەری ئەگرن ، ناوبردنی خواردن بەتەنها هێمایە بۆ ئەوە لەسودا زۆرتر بۆ خواردن بووە .

﴿ لا يقومون إلاّ كما يقوم الذي يتخبطه الشيطان من المس ﴾ ئەو کەسانە هەڵناسنەوە لەگۆڕەکانیان لەڕۆژی دواییدا ، مەگەر بەوێنەی هەڵسانی کەسێکی ئەوتۆی فێدار ، شەیتان دابێتی لەو کەسە بۆ شێت کردنی ، یانێ ئەو کەسانە مامەڵەبەسود ئەکەن بەتەواوی هەروەك ئەو کەسە وان دێو و درنج دەستی لێوەشاندبێ و تووشی شێتی و فێ بوبێ و کەف بچەڕێنێ و لاقەفرتێ بکا و سەری خۆی بکێشێ بەدار و بەردا . لەڕۆژی دواییدا ئەو جۆرە کەسانە سوود خۆرن ئەناسرێن بەو جۆرە کار و نەخۆشیانە .

﴿ ذلك بأنهم قالوا إنما البيع مثل الربا ﴾ ئەو شتەی تووشی ئەوان بووە لەو سزادانەیان بەهۆی ئەوەبوە کەبەڕاستی ئەیان ووت سود وێنەی فرۆشتنە . یانێ ئەو قازانجە لەفرۆشراوا پەیدا ئەبێ لەکڕین و فرۆشتندا کەلەو نرخەی زۆرترە کەپێی کڕاوە وێنەی هەروەك ئەو قازانجیە لەسودا وەرئەگیرێ ، بەلای ئەوانەوە فرۆشتن و مامەڵەکردن بەسود یەکسانن ، بگرە سود چاکترە ، ئیتر بۆ ئەبێ فرۆشتن و کڕین ڕەوابێ و سود قەدەغە بێ ؟.

بێ باوەڕان ئەیان ووت : ئادەمیزاد ئایا بۆیان نیە بایی پێنج دینار بفرۆشن بە شەش دینار، یا کوتوپڕ شتێ بفرۆشن بە سێ دینار بۆ ماوەی دوو مانگ ؟ بێگومان ئەوانە دروستن ، بۆ ئەبێ حەوت دینار بەهەشت دینار دروست نەبێ خوای گەورە گومانەکەیان پوچ ئەکات و ئەفەرموێ :

﴿ وَاَحَلَ اللهُ البيعَ وَحَرَّمَ الرِّبا ﴾ وەخوای گەورە ڕەوای کردووە فرۆشتن ، چونکە لەوا هەیە قازانج بۆ بکڕ و بفرۆش ، قەدەغەی کردوە سود چونکە دارایی لەناو ئەبا و ئادەمیزاد نەخۆش ئەخا و قازانجەکەی هەر بۆ یەك کەسە ، ئیتر چۆن هەر وەك یەك وابن ؟ بفرۆش خۆی ماندو ئەکا و ئارەق ئەڕێژێ بەکاری بازرگانی بەکەڵك کەواتە قازانجەکەی بەرانبەر بەو ماندوو بونەیە ، بەڵام سود وەرگر بە بێ ماندوو بوون دەستی ستەم ئەخاتەکار بۆ داگیر کردنی دارایی خەڵکی هەژار و دەرامەتیان بەبێ ماندووبون ئەی‌خوا ، بۆیە فرۆشتن و سود وەك یەك نین لەهەموو ڕوویەکەوە .

﴿ فَمَنْ جاءَ هُ مَوعَظَةٌ مِنْ ربّه فانتهى ﴾ دوایی هەرکەسێ چوو بۆلای ئامۆژگاریە لەلایەن پەروەردەکەری خۆیەوە کە سود وەرگتن قەدەغەیە ، دوایی ئەو کەسە وازی هێنا لەسود وەرگتنی پاش قەدەغە کردنی و دوای فەرمانی خوا کەوت بەبێ دواکەوتن .

﴿ فَلَهُ ما سَلَف ﴾ دواییی بۆ ئەو کەسە هەیە شتێ لەپێشەوە وەری گرتوە بەر لە قەدەغەکردنی ، داوای گەڕانەوەی لێ ناکرێ ، بەڵام پاش قەدەغەکردنی داوای گەڕانەوەی لێ ئەکرێ ئەو زۆرەی وەری گرتوە .

﴿ وَأَمرُهُ إلى اللهِ ﴾ وەکاری ئەو کەسە ئەگەڕێتەوە بۆ لای خوا ، خوا پاداشتی ئەداتەوە لەسەر ئەوەی وازی هێناوە لەمامەڵەی سود بەوەرگرتنی ئەو ئامۆژگاری‌یە ، خوا خۆی ئەزانێ چ شتێکی بۆ ئەکا و پەیوەندی بەکەسی ترەوە نی‌یە ، بەڕاستی هەرکەسێ سودی وەرگرت و نەیزانی قەدەغە کراوە ، پاش زانین وازی لێ هێنا لەبەر پەرستنی بۆ خوا ، دوایی خوا چاودێری ئەو کەسە ئەکا ، بە دارایی ڕەوا سوود بەخشی ئەکا ، چونکە وازی هێناوە لەکاری قەدەغەکراو .

﴿ وَمَنْ عادَ فأولئِكَ أصحابُ النار هُمْ فيها خالِدون ﴾ وەهەر کەسێ بگەڕێتەوە بۆلای پەڕەوا دانانی مامەڵە کردن بەسود پاش ئەوەی خوا قەدەغەی کردوە ، دوایی ئەو کەسانەی بەڕەوای دائەنێن مامەڵەی سود و فەرمانی خوا نابینن دانیشتوو هاوڕێی ئاگری دۆزەخن ، ئەو کەسانە لەنێو ئاگردان بەبەردەوامی چونکە ئەو جۆرە کارانە لەبێ باوەڕانەوە ئەوەشێتەوە بۆیە لەئاگر ناچنە دەرێ .

﴿ يمحق اللهُ الربا ﴾ خوا دەرامەت و قازانجی سود لەناو ئەباو پیتی نایەڵێ ، ئەو داراییە سودی تێکەڵ بێ بنە بڕ ئەبێ و منداڵ و خێزان و خۆی کەڵکی لێ ودرناگرن ، وەك زۆر جاران بەچاوی خۆمان دیومانە کە زۆربەی نەوەکانی پاش مردنی خۆی دارایی ئەو کەسە لەخواردنی نا لەبار و لەخواردنەوەی مەی و قومارکردندا ئەیدۆڕێنێ .

﴿ ويربي الصدقات ﴾ وەخوا گەشە ئەکا بە چاکەکردن بەدارایی پێویست بن یان نە ؟ وەزۆری ئەکا و پیت ئەخاتە ئەو شتانەی لەوان دەربکرێ ، هەرچەندە خاوەنەکەی بیبەخشێ خوا هەر زۆر تری ئەکا .

﴿ والله لا يحب كل كفار أثيم ﴾ وەخوا خۆشی ناوێ هەموو بێ باوەڕانی تاوانکار کە بەردەوامن لەسەر بەڕەوا دانانی قەدەغە کراوەکان وازی لێ ناهێنن و درێژە ئەدەن بەگوناە کردن و بەردەوامن لەسەر خواردنی سود و باش بۆی دائەچێ لەو ئایەتەوە زانیمان سود خۆر بە خەیاڵێ خۆی بەمامەڵەکردنی سود ئەیەوێ دەرامەتی خۆی زۆرتر بکا . بەڵام

بێگومان کەمتری ئەکاتەوە ; چونکە سود پیسە و قەدەغەیە ، دەرامەتی قەدەغە هـی ئـەوان نیە و هی خەڵکی ترە ، جگە لەوانەیش سەرباری بێ پیتی ئەو داراییە خەشمی خوای گەورە لەسود خۆران و تۆڵەکردنەوە لەوان ، ئاگری دۆزەخ با بووە ستێ .

﴿ إن الذين آمنوا وعملوا الصالحات ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئـەو تـۆ باوەڕیـان هێنـاوە هەرشتێ بکەن یا نەیکەن بەگوێرەی فەرمانی خوایـە و ، کـردەوە چاکـەکان ئەکـەن بـەو جۆرەی خوا فەرمانی پێداوە بەنیازی پاکەوە .

﴿ وأقاموا الصلاة وآتوُا الزكاة ﴾ وەنوێژەکانیان بەرپا ئەکەن و ئەیکـەن بـەو جـۆرەی خوا فەرمانی پێداوە ، زەکاتەکانیان بەخشیوە بەهەژاران و خۆیـان هەڵناکێشـن و ئـازاری هەژاران نادەن .

﴿ لهم أجرهم عند ربهم ﴾ بۆ ئەو کەسانە هەیە پاداشتیان لای پەروەردەکـەری خۆیـان لەڕۆژی دواییدا مزەی چاکەکانیان وەرئەگرن .

﴿ ولا خـوفٌ عليـهم ولا هـم يحزنـون ﴾ وەتـرس لەسـەر ئـەو کەسـانە نیـە بـۆ ئـەو کارەچاکانە کردویانە لەبەر خوا و لەبەری خۆیانەوە ناردویانە بۆ توێشوی ڕۆژی دووایی ، خەفەتبار نابن بۆ ئەو شتانە لەمـەو پـاش دێتـە ڕێگـەیان . بـەو ئایەتـە بۆمـان دەرئەکـەوێ باوەڕهێنان بەتەنها و کردەوەی چاکی لەگەڵ نەبێ بێ هودەیە و ناگاتـە فریـای ئـادەمیزاد بەتەواوی .

هەندێ لەباوەڕداران پێش ئەوەی موسڵمان بـبن لـەنێوان یـەکتریدا مامەڵـەیان بەسـود کردبوو کە خوای گەورە سودی قەدەغەکرد خاوەن داراییەکان داوای قـەرزەکانیان کـرد لەقـەرزارەکانیان بەسـودەکەیانەوە ، خـوای گـەورە لـەو کـارەدا بەرهەڵسـتی کـردن و فەرموی:

﴿ يأيها الذين آمنوا أتقوا الله ﴾ ئەی کەسانێکی باوەڕتان هێناوە ئێوە لـەخوا بترسـن و خۆتان بپارێزن لەسزای خوا .

﴿ وزروا ما بقي من الربا إن كنتم مؤمنين ﴾ وەئێوە وازبهێنن لەشتێ ماوەتەوە لە سوود ، ئێوە دەست بەرداری بن و داوای مەکەنەوە لەقەرزارەکانتان دوای ئەوەی قەدەغە کراون ئەگەر ئێوە باوەڕتان هێناوە بەڕاستی .

﴿ فإن لم تفعلوا فأذنوا بحربٍ من الله وَرَسوله ﴾ دوایی ئێوەئەگەر وازتان نەهێناوە لەداواکردنی ئەو شتەی ماوەتەوە لای قەرزارەکانتان و داوای ئەکەن لەوان ، ئەگەر داوای بکەن دەرئەکەوێ باوەڕدار نین کەواتە ئێوە خۆتان ئامادەبکەن و ڕابگەیەنن جەنگ لەگەڵ خواو فروستادەی خوا ، وابزانن ئەوانیش جەنگ لەگەڵ ئێوە ئەکەن و خۆیان بەدوژمنی ئێوە ئەزانن . لەترسی ئەو هەڕەشەیە و پاش هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە باوەڕداران وتیان : ئێمە توانای جەنگمان نیە لەگەڵ خوا و پێغەمەر .

﴿ وإن تبتم فلكم رؤوس أموالكم لا تظلمون وَلا تُظلَمون ﴾ وەئەگەر ئێوە واز ئەهێنن و پەشیمان بوونەوە لەداواکردنی پاش ماوەی سودەکانتان ، دوایی بۆتان هەیە سەرمایەی داراییەکانتان بەتەواوی ، ئێوە ستەم لە قەرزارەکانتان مەکەن و زۆرتر لەسەرمایەکانتان وەرگرن ، ئێوەش ستەمتان لێ نەکرێ بەوەرگرتنی کەمتر لەسەرمایەکانتان ، یا سەرچەوتیتان لەگەڵ بکەن .

﴿ وإن كانَ ذو عشرةٍ فينظره إلى ميسرة ﴾ وەئەگەر قەرزارەکانتان خاوەنی دەست کورتی و سەختی بوون و نەدار بوون نەیان ئەتوانی سەرمایەکانتان بدەنەوە دوایی ئێوە چاوەڕوان بکەن هەتا قەرزارەکانتان ساماندار ئەبن ئەو کاتە بتان دەنەوە .. هەژاری لێرە پەیدا ئەبێ بەجگەی شوێنی دانیشتن و بەرگی خۆی و خێزانی و نامەی خوێندن .

﴿ وإن تصدقوا خير لكم إن كنتم تعلمون ﴾ وەبەخشینی ئێوە سەرمایەکەتان بەقەرزارەکانتان ، ئەو بەخشینە چاکترە بۆ ئێوە لای خوا و پاداشتی زۆرترە لەوەی چاوەڕوان بکەن ئەگەر ئێوە بزانن بەو چاکەیە بۆ خۆتان ، کەواتە ئێوە کار بکەن بەگوێرەی زانیاری خۆتان .

﴿ وأتقوا يوماً ترجعون فيه إلى الله ﴾ وەئێـوە خۆتـا بپـارێزن لـەڕۆژی پرسـیار و وەڵام کەڕۆژێکی سامناکە ئێوە ئەگێڕرێنەوە بۆلای خوای خۆتان .

﴿ ثم توفى كل نفس ما كسبت وهم لا يظلمون ﴾ لەپاشا ئەدرێ بەهــەموو کـەس بـە تەواوی شتێ کردویانە لەپاداشتی چاك و تۆڵەی خراپـەکانیان ، ئـەو کەسـانە سـتەمیان لێ ناکرێ لەو ڕۆژەدا لەپاداشت و تۆڵەی کردارەکانیان .

ئەو ئایەتە هاتۆتە خوارەوە پاش هەموو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بـە بیسـت و یـەك ڕۆژ بەلای زوربەی زانایانەوە ، هەندێ تریان بەزۆرتر ، هەندێ ئـەڵێن : بەکـەمتر لـەو ماوەیـە هاتوەتە خوارەوە ، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : ئەو ئایەتە دابنێن لەنێوان ئایەتەکانی سوود و ئایەتەکانی قەرزدا ، پاش بیست و یەك ڕۆژ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کۆچی دوایی فەرموو .

بەگوێرەی ئەو بەڵگانەی لەقورئان و فەرمودەی پێغەمەرەوە دەرئەکەون سـود خـواردن قەدەغەیە ، هەموو موسوڵمانیش پێك هاتوون لـەسەر قەدەغە کردنی ، هەرکەسێ مامەڵـەی سود و خواردنی بـەڕەوا دانـێ بـەبێ بـاوەڕ ئـەژمێررێ ، هـەروەك وەرگرتنـی قەدەغەیـە بەخشینیشی قەدەغەیە .

بەشە قەدەغەکراوەکانی سود سێ جۆرن:

١- فرۆشتنی شتێ بەشتێ تر ، یەکێ لەو شتانە زۆر تربێ لەوی تریان = (ربا الفضل).

٢- فرۆشتنی شتێ بەشتێ تر ، وەرگرتنی هەردوو لەو شـتانە یـا یـەکێکیان دوابخـرێ (رباالید) .

٣- فرۆشتنی شتێ بــە شـتێ تـر ، مـەرج بکـەن وەرگرتنـی یـەکێ لــەو دوو شـتانە دووابخرێ ، ئیتر باوەریشی بگرن لەو دانیشتنەیانا هــەر لــەو شـوێنە ، ئـەم بەشـەیان پێـی ئەبێژرێ (ربا النسئة) .

ئەو سێ بەشانە بەگشتی قەدەغەن بەو جۆرەی موسوڵمانان وەریـان گرتـووە بەگشـتی قەدەغەن بەو جۆرەی موسـوڵمانان وەریـان گرتـووە لـەقورئان و لـەفـەرموودەی پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ .

لەمەو پاش بەکورتی وێنە لەسەر مامەڵەی سوود ئەهێنینەوە :

ئەگەر خواردەمەنی فرۆشرا بەخواردەمەنی و لەیەك جۆربوون ، وەك گەنم بەگەنم ، زێڕ بەزێڕ ، یا زیو بەزیو ، لەو کاتەدا پێویستە هەردوولایان ئامادەی ئەو شوێنەبن و بەئەندازەی یەکبن ، بەر لەوەی بفرۆش و بکڕ لەیەك جوێ ببنەوە ئەبێ هەردوو شتەکان وەربگرن ، بەشێوەیە کارنەکەن مامەڵەکەیان قەدەغەبێ و پوچ بێ ، ئەگەر بەو جۆرە نەبێ سودە .

ئەگەر شتەکان لەدوو جۆر بون ، وەك گەنم بەجۆ ، زێڕ بەزیو ، مەرجە هەردوو شتەکان ئامادەی ئەو جێگەیەبن ، یەکێکیان لەوی تریان زۆرتر بێ و لەیەکتری وەریان بگرن . بەڵام یەکسانی لێرەدا مەرج نیە ، ئەم جۆرەیشیان بەو جۆرە نەبێ قەدەغەیە و پووچە .

خواردەمەنی لێرەدا بریتی‌یە لەوەی مەبەستی ئادەمیزاد بێ بۆ خواردنی ، ئیتر ببێتە هۆی ژیان و مانەوەیان وەك گەنم و جۆ و برنج و گەنمەشامی و بەڕو ، یا بۆ شەوچەرەبێ و بۆ میوە بێ ، وەك هەنجیر و ترێ و خورما ، وەیا بۆ دەرمان بەکار بهێنرێ وەك خوێ و بەهارات و گڵی ئەرمەنی. کەواتە ئەو سێ جۆرە ئەوانەن سوودیان تێدا پەیدا دەبێت جگە لەوانە سوود پەیدا نابێ.

بەڵام سود لەقەرزدانا هەیە ، وەك ئەوەی پێنج د ینار بدرێ بۆ ماوەی مانگێ بەشەش دینار ، بەجۆرێکی ڕوون تر هەرشتێ بەقەرز بدرێ بەکەسێ ، جگە لەو پارەیە خاوەن قەرزەکە شتێ تر وەربگرێ ، بۆ وێنە بڵێ ڕۆژێ ئێشم بۆ بکە یا بەرچینەیە هەنجیرم بۆ بهێنە، یانامەیەکم بدەرێ تەماشای بکەم ، ئەوانە هەموویان قەدەغەن و بەسود دائەنرێن لەلایەن یاسای ئیسلام .

هۆی قەدەغە کردنی مامەڵە بەسود زۆرن ، ئەمانەی دوایی هەندێکیانن :

١ – دژی بەرێزترین بیروباوەڕی ئادەمیزادن ، وەك چاکەکردن و یارمەتی و بەزەیی لەگەڵ یەکتریدا کە سود و ژیان بەوان گەشە ئەکا.

٢- خواردنی دارایی ئادەمیزاد بەبێ ماندووبون بۆ کارێکی پوچ ، سـود خـۆران هـەر وەرئەگرن و توشی زیان نابن .

٣- پارەداران بەسـود لـەقازانجان ، پـارەوەرگران بەسـود هـەر توشـی زیـان ئـەبن و لەهەژاری ڕزگاریان نابێ .

هەندێ لەزانایانی ئابوری ڕۆژئـاوایی ڕێگـەیان بـەو نەخۆشیانە بـردووە ، یـەکێ لـەو زانایانە دکتۆر (شاخیت) ئەڵمانی بەڕێوەبەری بانکی (ڕانج) لەپێشا ، لە (دیمشق) دوانێکی داو ووتی :- ئێمە ئەتوانین بەکارێکی ڕیازی و بیرکاری لەوە بگەین هەموو دەرامەتیزەوی لەپاشەڕۆژدا ئەچێتە گیرفانی کۆمەڵێکی تایبەتی لەسود خۆران ، چونکە ئەو کەسانە قـەرز بەسود ئەدەن لەهەموکارێکا هەر قازانج ئەکەن ، بەپێچەوانە قەرزارەکانیش وا ئەبێ قـازانج بکەن . بەڵام بەزۆری تووشی زیـان ئـەبن ، هـەتا وای لێ دێ زۆربـەی دەرامـەتیان ئـەبێ بەدارایی چەند هەزار کەسـێ ، زۆربـەی دانیشـتوانی سـەر زەوی ئـەبن بـە خزمـەتکار و کرێکاری ئەوان ، ئارەق ئەرێژن و موچەیەکی کەم وەرئـەگرن ، بەهـەزاران چەرمەسـەری بتوانن خۆیان و خێزانیان بەخێو بکەن.

ئەو زانایانە پیشەیان دارایی ناسینە و لەئابووریدا شـارەزان ئـەڵێن : سـەرچاوەی سـود خۆران جولەکەن لەکۆن و لەتازەدا ، ئادەمیزادی تر لەوانەوە فێری مامەڵ‌ەی سود بوون ، جولەکە هەر لەکۆنەوە خوا و ئاین و ڕێزیان تەنها هەر داراییە ، بەداوێن پیسی و دەلاڵی و دووڕوویی و کوشتن و دزی و دەست برین بۆیان بلوێ سڵی لێ ناکەنەوە .

وابەچاك دائەنرێ باسی هەندێ شت بکەین لەم سـەردەمەدا زۆربـاون و زۆریـان بـاس ئەکرێ :

١- کردنەوەی کارگەیە لەلایەن چەند کەسێکەوە ، بـەو مەبەسـتە قازانجەکـەی بـڵاو بکەنەوە بۆ یارمەتیدانی مرۆڤایەتی و دانانی لەهەموو ڕێگە چاکەکاندا لە پـاش دەرکردنـی موچەی فەرمانبەران و کرێکـارانی ئـەو کارگەیـە ، ئـەو کـارە بـە سـود دائـەنرێ ، وەك لەباسەکانمان بۆمانای سود ، زانراوە .

٢- دانانی پارە لەبانکەکاندا بەقازانجێکی دیاری کراو بۆ خاوەن پارەکان ، ئەو جۆرە کارە قەدەغەی ، بێ گومان بەسود دائەنرێ ، ئیتر ئەو قازانجە کەمبێ یا زۆر ، لەگوناهدا هەردوو لایان هاوبەشن ، چونکە خاوەن پارە قازانجەکەی مسۆگەرە بەبێ ئەوەی ماندوبێ ، ئەوەیش مەبەستە لەمامەڵە بەسود کردن .

بەڵام ئەگەر کەسێ زۆر نەدارا بوو ، کەسێ نەبێ بگاتە فریای و سەر بۆ جێگەیە تر دەرنەکا ، نەدەرامەت و نەکارکردنی بۆ نەئەلوا ، ئەو مرۆڤە هەژارە بێچارەیە ئەتوانێ بەگوێرەی پێویستی خۆی قەرز لەبانك بکا ، گوناه لەوکاتەدا لەسەر قەرزدەرەکەیە.

٣- کڕینی یانسیب گەورەترین جۆرەکانی قومارە و قازانجەکەی قەدەغەیە ، وەك کڕینی قەدەغەیە ، خواردنی گوناهە ، لەهەموشتێ سەیر تر ئەمەیە :

هەندێ کەس بەتایبەتی کاربەدەستان فرۆشتنی یانسیب بەکار ئەهێنن و ئەی فرۆشن ، بەئاواتی خۆیان بۆ کارە چاکەکانی ئە فرۆشن ، وەك یارمەتیدانی هەژاران ، ئەو کەسانە وێنەی ئەو کەسانەن پیتاك کۆئەکەنەوە بۆ کۆڕی سوڕدان و دەست ئەکەن بەمەی خواردنەوە ، یا بۆ لاسایی کردنەوەی بێ بنچینەی و بێ کەڵك ، بەدەیان کەس پارەی خۆیان لەکڕینی یانسیبا لەناو ئەبەن ، لەئەنجامدا بەڕوتوقوتی و دەستەپاچەیی دەرئەچن و دەرامەتیان نامێنێ . لەئایەتە پێشوەکاندا خوای گەورە باسی قەدەغەکردنی سودی فەرمو ، وەلە ئایەتەکانی دوواییدا باسی قەرزدان و یارمەتی و بازرگانی و نوسینی ئەندازەیی ئەو قەرزەمان بۆ ئەکا و ئەفەرموێ :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى فَٱكۡتُبُوهُۚ وَلۡيَكۡتُب بَّيۡنَكُمۡ كَاتِبُۢ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَلَا يَأۡبَ كَاتِبٌ أَن يَكۡتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُۚ فَلۡيَكۡتُبۡ وَلۡيُمۡلِلِ

ٱلَّذِى عَلَيْهِ ٱلْحَقُّ وَلْيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ وَلَا يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْـًٔا ۚ
فَإِن كَانَ ٱلَّذِى عَلَيْهِ ٱلْحَقُّ سَفِيهًا أَوْ ضَعِيفًا أَوْ لَا يَسْتَطِيعُ
أَن يُمِلَّ هُوَ فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُۥ بِٱلْعَدْلِ ۚ وَٱسْتَشْهِدُوا۟ شَهِيدَيْنِ
مِن رِّجَالِكُمْ ۖ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَٱمْرَأَتَانِ
مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحْدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ
إِحْدَىٰهُمَا ٱلْأُخْرَىٰ ۚ وَلَا يَأْبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُوا۟ ۚ وَلَا تَسْـَٔمُوٓا۟
أَن تَكْتُبُوهُ صَغِيرًا أَوْ كَبِيرًا إِلَىٰٓ أَجَلِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمْ أَقْسَطُ
عِندَ ٱللَّهِ وَأَقْوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ وَأَدْنَىٰٓ أَلَّا تَرْتَابُوٓا۟ ۖ إِلَّآ أَن تَكُونَ
تِجَٰرَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ
أَلَّا تَكْتُبُوهَا ۗ وَأَشْهِدُوٓا۟ إِذَا تَبَايَعْتُمْ ۚ وَلَا يُضَآرَّ كَاتِبٌ
وَلَا شَهِيدٌ ۚ وَإِن تَفْعَلُوا۟ فَإِنَّهُۥ فُسُوقٌۢ بِكُمْ ۗ وَٱتَّقُوا۟
ٱللَّهَ ۖ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٨٢﴾

وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا۟ كَاتِبًا فَرِهَٰنٌ مَّقْبُوضَةٌ فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ ٱلَّذِى ٱؤْتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ وَلْيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ ۗ وَلَا تَكْتُمُوا۟ ٱلشَّهَٰدَةَ ۚ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٌ قَلْبُهُۥ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨٣﴾

﴿ ياأيها الذين آمنوا إذا تداينتم بدينٍ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە هەرکاتێ ئێوە مامەڵەتان کرد ، هەندێکتان قەرزتان دا بەهەندێکتان بەقەرزێ بیدەن بە یەکتری ، بەگوێرەی یاسا مامەڵەکەتان لەگەڵ یەکتری کردبوو نرخەکەی قەرز بون .

﴿ إلى أجلٍ مُسمى ﴾ هەتا ماوەیەکی دیاری کرا بەساڵ یا بەمانگ یا بەڕۆژ ، قەرزەکەیشتان دامەزران و ڕونتان کردەوە بەبەڵگەو شێوازی وا کەبزانن قەرزەکە چۆنەوچیە . ئەم مامەڵەیە پێی ئەوترێ سەلەم ، وەکاتێ مامەڵەی واتان کرد پێویستە لەسەرتان .

﴿ فأكتبوه ﴾ دوایی ئێوە ئەو قەرزە بنوسن لەسەر پارچەیە کاغەز ، ناوی قەرزار و خاوەن قەرز و ئەندزەی قەرزەکە و ماوەکەی و ناوی شاهیدەکانی تێدا ڕوون بکەنەوە هەتا کاتی پێویست تەماشای بکەن.

﴿ وليكتب بينكم كاتب بالعدل ﴾ وەپێویستە ئەو بەڵگە نامەیە بنوسێ لەنێوان ئێوەدا نوسەرێ لەجگەی قەرزدەر و قەرزار بەجۆرێکی دادپەروەرانە . نەزۆر بنوسێ و نەکەم لەماوە و لەداراییەکە بۆ هەردوو لایان . کەواتە پێویستە ئەو نووسەرە داد پەروەر و دەست پاك و ئاین پەروەر بێ و باوەڕ پێ کرا و بێ . بەخامە و بەدڵ لایەنی هیچ لایەنێ نەگرێ.

زۆربەی زانایان ئەڵێن : فەرماندانی خوا بەو نووسینە بۆ پێویست بوون نیە . بەڵکو وا چاکە بنوسرێ بۆ دڵنیایی هەردوو لایان و لەبەرئەوەی موسوڵمانان لەکۆن و تازەدا پێك هاتوون لەسەر کڕین و فرۆشتن بەنرخێ و دوابکەوێ بەبێ نووسین و بەبێ شایەت ، پێویست کردنیان ئازار و تەنگ هەڵچنینە بەئادەمیزاد .

وەکەمێ لەزانایان ئەڵێن : ئەو فەرماندانە بەنوسین بۆ پێویستبوونە .

﴿ ولایأب کاتبٌ أن یکتب کما علمه الله ﴾ وە پێویستە هیچ نوسەرێ سەرپێچی نەکا لەنوسینی ئەو بەڵگەنامەیە کەداوای لێ کرا لەجێگەیە خاوەن قەرز کەسی تری دەست نەکەوێ بۆ نوسینی ئەو بەڵگە نامەیە ، بینوسێ بەوێنەی شتێ خوا فێری کردووە لەنوسینی بەڵگە نامە و نەی گۆڕێ و تێکی نەدا .

﴿ فلیکتب ﴾ دوایی پێویستە نووسەر بینوسێ بەجۆرێ نەکەمی بکاتەوە نەزۆر .شتێ بنوسێ چاکبێ بکرێ بەبەڵگە لەکاتی پێویستیدا ، هیچ لایێ لەمامەڵەکەران بەچاوی تایبەتی تەماشا نەکا ، هەردوو لایان ئەمینبن لەوەی مافی بڕوا . خۆی بپارێزێ لە ووشەیە ببێتە جێگەی دووبەرەکی .

﴿ ولیملل الذي علیه الحق ﴾ وەپێویستە دەری بخا و ڕوونی بکاتەوە کەسێکی ئەو تۆ بەسەرێوەیەتی قەرزەکە بۆ نووسەر هەموو قەرزەکە لایەتی بەبێ کەم و کوڕی ، وەبەزمان بڵێ : کە ئەندازەی قەرزەکە و ماوەی دانەوەی ئەوەندەیە .

﴿ ولیتق الله ربه ﴾ وەپێویستە هەموو یەکێ لە نووسەر و قەرزار لەخوا بترسن پەروەردەکەر یانە و بەخێوکەریانە ، نابێ درۆودە لەسەر بەکار بهێنن .

﴿ ولا یبخس منه شیئاً ﴾ وەنابێ ئەو کەسەی قەرزەکەی لەلایە کەم بکاتەوە لەو قەرزە هیچ شتێ لەکاتی دەرخستنیا بۆ نووسین .

ئەو شتانەی لەمانای ئەو شتانەدا باسمان کردن کەمترین مەبەستە کە پێویست کراوە لەسەر قەرزار بەرانبەر بەخاوەن قەرزەکە کە دەستی گرتووە لەکاتی تەنگانەدا ، بەڵام

بەداخەوە زۆر کەسمان چاو پێ کەوتوە لەکاتی داواکردنی قەرزدا باڵی کزۆڵی و هەژاری شۆڕ ئەکاتەوە لەبەردەم خاوەن دارایی‌دا بەهیوای ئەوە قەرزی بداتێ و پێویستی خۆی پێ جێبەجێ بکا ، خاوەن دارایی ، ئایین و مرۆڤایەتی پاڵی پێوە ئەنێ و وەلامی ئەداتەوە و قەرزەکەی ئەداتێ . کەچی دوای داواکردنی قەرزەکە ، لەخاوەن قەرز کە ڕائەپەڕێ و ئەچێ بەگژیا و ئەبێ بە دوژمنی ، وەك نەبای بینیبێ و نەبۆران ، بەدەیان ناو و ناتۆرەی خراپی بۆ دروست ئەکا ، هەر لەبەر ئەوەی خاوەن قەرزەکە داوای مافی ڕەوای خۆی ئەکا جگە لەوەیش خراپە بەکاردێنێ بەرانبەر بەو چاکەیە کەئەوەیش قەدەغەیە بەگوێرەی یاسا و بەگوێرەی ئەقڵ ، تینەتی خراپی خۆی و بێ نرخی خۆی و نامەردی خۆیشی بۆ هەموو کەس دەرئەخا .

خوای گەورە پێویستی کردوە لەسەر ئادەمیزاد سوپاسی خاوەن چاکە بکرێ ، ئیتر هەر کەسێ بێ خوا سوپاسی ئادەمیزادی بەرانبەر کردوە لەگەڵ سوپاسی خۆی ، وەك خوا ئەفەرموێ : ﴿ أن اشكر لي ولوالديك ﴾ سوپاسی من و دایك و باوکت بکە ، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێ ﴿ لا يشكر الله من لا يشكر الناس ﴾ سوپاسی خوا ناکا کەسێ سوپاسی ئادەمیزاد نەکا .. ئەمانەی خوارەوە باشترین بەڵگەن لەسەر ئەو مەبەستە :

١- ڕێزگرتنی ئادەمیزاد بەشێکە لە ڕێزگرتنی خوا . خوا ئەفەرموێ : ئێمە ڕێزی ئادەمیزادمان گرتووە . پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێ خوا بەبەندەیە لەبەندەکانی خۆی ئەفەرموێ : من نەخۆش کەوتم بۆ سەرخۆشیت لێ نەکردم ؟ بەندەکەی ئەڵێ : تۆ پەروەردەکەری بەندەکانی بێ ئازاری و نەخۆش ناکەوێ خوا ئەفەرموێ : برایەکی موسوڵمانی تۆ نەخۆش کەوت سەرت لێ نەدا و هەواڵت نەپرسی . بەگەورەیی خۆم سوێند ئەخۆم سەرت لێ بدایە من لەلای بوم . بەهۆی ئەو بەندە نەخۆشەمەوە هەموو پێویستی تۆم جێبەجێ ئەکرد بەهۆی میهرەبانی خۆمەوە و بەخشندەییمەوە .

٢- سوپاس کردنی چاکە کەران بەشێکە لەدروست پەیمانی ، ئەوە بەڵگەیە لە سەر ڕاست گۆیی و باوەڕ هێنان ، نیازپاکی و دەست پاکی و فیداکاری ، هەر کەسێ پەیمان

جێبەجێ بکا لەگەڵ کەسێ چاکەی لەگەڵ کردووە ئەوە ئەگەیەنێ ئەوەی لەسەریەتی جێبەجێ کردوە لەگەڵ خێزان و دۆستانی و نیشتمان و هەموو ئادەمیزاد . مرۆڤی بەڵێنی خۆی نەباتە سەر و دڵ پیسی لەگەڵ چاکەکەران بکا ئەوە ئەگەیەنێ دڵ پیسە بەرانبەر خێزان و دۆستان و نیشتمانی خۆی و چاوەڕووانی چاکەی لێ ناکرێ ئەوکەسەی خاوەنی بەڵێن نەبێ بەبێ باوەڕ دائەنرێ ، گەورەترین بەڵێن بەسەر بردن ئەوەیە لەکاتی ئازار و ئێش و تەنگانە دابێ ، چونکە بەڵێن بەسەر بردن لەکاتی چاکە کردن و کاتی خۆشیدا لەبەر داراییەکەیە نەك لەبەر خاوەنەکەی .

﴿ فإن كان الذي عليه الحق سَفيهاً أو ضميناً ﴾ دوایی ئەو کەسەی ئەوتۆ قەرزەکەی لەسەرە ئەگەر گێل و کەم ئەقڵ و شێت و دەست بڵاوبو شایانی بەخشین و وەرگرتنی نەبوو ، یا لاواز و منداڵ و پیر و پەك کەوتە و خەڵەفاو بوو.

﴿ أولا يستطيع أن يمل ﴾ یانە ئەتوانێ کەبەدەمی خۆی ئەندازە و چۆنیەتی قەرزەکە ڕوون بکاتەوە لەبەر لاڵی و نەخۆشی و زمان نەزانین .

﴿ فليملل وليه بالعدل ﴾ دوایی باڕوونی بکاتەوە کاربەدەستی ئەو کەسانە ئەندازەی ماوە و قەرزەکەی کەبریتین لەباوك و باپیر و دادوەر لەکاتی نەبونی ئەواندا بەجۆرێکی دادپەروەری و ڕاستی لەڕوون کردنەوەیانا بەبێ کەم و کوڕی ، ئەو دادپەروەریە موسوڵمان و بێ باوەڕانیش ئەگرێتەوە بەبێ جیاوازی .

﴿ وأستشهدوا شاهدين من رجالكم ﴾ جگەی ئەو نوسینە ئێوە داوای ئاگاداری دوو شایەتی تر بکەن و بیان کەن بەشایەت لەسەر قەرزەکە و ئەندازە و ماوەی لە پیاوانی موسوڵمانانی خۆتان بەلای پێشەوا شافیعی و مالیك . بەڵام لەلای حەنەفی شایەتی بێ باوەڕان بۆ یەکتری دروستە . ئەو دوو شایەتە پێویستە باڵغ و بێ گوناه و داد پەروەر بن .

﴿ فإن لَم يكونا رجلين فرجل وأمرأتان ﴾ دوایی ئەگەر دوو پیاو نەبوون بۆ ئاگاداری دوایی پێویستە پیاوێك و دوو ژن بن .

بۆ زانین : زانایان پێك هاتوون لەسەر ئەوەی شایەتی ژنان لەگەڵ پیاوان دروستە لەبۆ دارایی بەلای سۆفیانی سەوری و خاوەن بیرەکانەوە شایەتی ژنان لەگەڵ پیاواندا دروستە لەجگەی تاواندا ( عقوبة ) . هەندێ لەزانایان ئەڵێن: بۆ جگەی دارایی هەر پێویستە دوو پیاوی دادپەروەری بێ گوناه بن . شافیعی ئەڵێ : ئەوەی پیاوان بەزۆری ئاگاداری نین شایەتی ژنانی بۆ دروستە ، وەك منداڵ بوون و شیردان و کچایەتی و بێوەژنی بەدووژن و پیاوێ یا بەچوار ژن ، زانایان پێك هاتوون لەسەر ئەوەی شایەتدانی ژنان لەتاوان و سنوردا دروست نیە ( العقوبة و الحدود ) .

شایەتی پیاوێك و سوێندی داواکار و دروستە بۆ دارایی بەلای زانایانەوە جگەی حەنەفی .

ئەوەی جێگەی شایان بێ بەڵگە بۆ دروست بوونی شایەتی دووژن و پیاوێ یا شایەتی دوو پیاو قورئانی پیرۆزە . بەڵگەی دروست بوونی شایەتێك و سوێندێ فەرمودەی پێغەمەرە ﴿ﷺ﴾ .

﴿ ممن ترضون من الشهداء ﴾ لەو کەسانە بن ئێوە خۆتان پەسەندیان ئەکەن لە شایەتەکان ، بەمەرجێ بێ گوناه و دادپەروەر و جێگەی بڕواتان بن و خاوەنی مرۆڤایەتی بن لە پیاوان و ژنانی موسوڵمانی خۆتان .

﴿ أن تضلّ أحداهُما فتذكرا إحداهما الأخرى ﴾ لەبەرئەوە کەیەکێ لەو دووژنانە شایەتیەکەی و مامەڵەکە لە بیرچوەوە ، دوایی بیری بخاتەوە ژنەکەی تریان چۆنیەتی ئەو مامەڵەیە لەبیری نەماوە . هەموو موسوڵمانان لەسەر ئەوەن شایەتی ژنان بەبێ پیاوان بۆ درایی دروست نیە . بەڵام شایەتی پیاوان بۆ هەموو شتێ دروستە .

هۆی ئەوەی لەشایەتی دانا دووژن بەپیاوێ دائەنرێ ئەمەیە : ژنان بەزۆری لەمامەڵەکردندا دورن و زۆرتر لەپیاوان فەرامۆشیان بەسەرادێت . خوای گەورە فەرمانی پێداوین دووژن بەپیاوێ دائەنرێ لەشایەتی دانا ، کەواتە پێویستە ئێمەیش بێ چەند و چوون مل کەچی فەرمودەی خوا بین ، زۆر هۆی واهەیە خوا ئەیزانێ و ئێمە نایزانین .

بۆ زانین : ئەوەی شایانی باسبێ وا ئەبێ دادوەر بڕوای بەشایەتی ژن زۆرترە ، زانستی بەوەی ژن ئەیلێ بۆی پەیدا ئەبێ چاکتر لەوەی چەند پیاوێ ئەیلێن کە دادپەروەر نەبن ، دادوەریش بۆی هەیە فەرمان بدا بەگوێرەی زانیاری خۆی کەببێ بەجێگەی بڕوای بێگومانی ئەو دادوەرە .

﴿ ولایأبِ الشهداء إذا ما دعوا ﴾ وەنابێ شایەتەکان سەرپێچی بکەن بۆ هەڵگرتنی شایەتی و شایەتی دانەکەی کاتێ داوایان لێ کرا بۆئەو مەبەستانە بەمەرجێ ئازوخەی هاتوچۆیان بدەنێ و پەکی کار و فرمانی خۆیان نەکەوێ ، ئەگەر کەسێ تریان دەست کەوت پێویست نابێ لەسەریان . ئەگەر کەسی تر دەست نەکەوت پێویستە لەسەریان وەڵامیان بدەنەوە .

﴿ ولاتسأموا أن تکتبوه صغیراً أو کبیراً إلی أجله ﴾ وە نابێ ئێوە ماندوو ببن و لاتان گرانبێ کەئێوە بنووسن قەرزەکانتان و مافەکانتان ، قەرز و مافەکان بچوکبن یان گەورە ، کەمبن یا زۆر ، بۆ ئەوە ئێوە تووشی گێرە و کێشە نەبن ، بەو جۆرەی قەرزار ئەیلێ نووسەر وای‌بنوسێ ، هەتا کاتی کۆتایی پێ هاتنی ماوەی دیاری کراو بۆ دانەوەی قەرزەکەی بەو جۆرەی مامەڵەکەران بڕیاریان لەسەر داوە . خوای گەورە بەو ڕستانە هانمان ئەدا بۆ قەرز و ماف و ئەندازەی قەرز بەبێ جیاوازی ، بنوسرێن .

﴿ ذالکم أقسطُ عند الله وأقوم للشهادة وأدنی أن لا ترباوا ﴾ نووسینی ئەوانە بۆ ئێوە دادپەروەرترە لای خوا ، ڕاستر و پایەدار ترە بۆ شایەتی دان ، چونکە ئەو نوسینە بیریان ئەخاتەوە مامەڵەکە چۆن کراوە و دورترە لەکەم کردنەوە و زۆرکردنی قەرزەکەوە نزیکترە ئەو نووسینە کەئێوە گومان پەیدا نەکەن بۆ ئەندازە و ماوەی قەرزەکە و ، بۆ ڕوون کردنەوەی چۆنیەتی مامەڵەکە لای شایەتەکان و لای خۆتان لەکاتی تەماشاکردنی نووسراوەکەدا .

خوای گەورە لەو ئایەتەدا چوار جار فەرمانی داوە بەو نووسینە . یەکەم : بەڕستەی ﴿ فاكتبوه ﴾ ، دووهەم : بە ﴿وليكتب بينكم كاتب ﴾ ، سێ هەم : بە ﴿ ولا تسأموا أن تكتبوه ﴾ ، چوارەم : بە ﴿ ذلكم أقسط عند الله ﴾ . هەروەها دوو جاریش فەرمانی داوە بەشایەت گرتن ، بە ﴿ واستشهدوا شهدين ﴾ ، وە بە ﴿ وأشهدوا إذا تبايعتم ﴾ کەچی لەگەڵ ئەو هەموو فەرمانانەدا زۆربەی زانایان ئەڵێن : ئەو فەرمانانە بۆ پێویست کردنی نووسین و شایەت گرتن نین . بەڵکو چاك وایە بنوسرێ و شایەت بگرن . بەڵگەی ئەو زانایانە ئەوەیە لەسەردەمی پێغەمەرەوە ﴿ﷺ﴾ هەتا ئێستا موسوڵمانان بەزۆری مامەڵەیان کردووە لەگەڵ یەکتری بەقەرز و بەبێ نووسین و شایەت گرتن بێ ئەوەی کەس خراپە لەکەس بگرێ . کەواتە ئەو فەرمانانە بۆ پێویست کردن نیە ، ئەگەر پێویست بکرێن ئەبێتە هۆی تەنگ پێ هەڵچنینی مامەڵە کەران ، خوای گەورە بەمیهرەبانی خۆی ویستی وایە کاری موسوڵمانان بەئاسانی بەڕێوە ببا و گرانی نەکا لەسەریان .

﴿ إلا أن تكون تجارة حاضرة تديرونها بينكم ﴾ هەموو کاتێ چاك وایە نووسین و شایەت گرتن لەمامەڵەدا مەگەر کەئەو مامەڵەیە فرۆشتنێ‌بێ نرخەکەی کوتوپڕ بدرێ و قەرز نەبێ لەو کاتەدا دانیشوون بۆ ئەو مامەڵەیە ، ئێوە لەم دەستەوە ئەو فرۆشراوە بدەن بەو دەستەکەی تر ،بفرۆش نرخەکە وەرگرێ لەکڕیار ئەویش فرۆشراوەکە وەرگرێ لەبفرۆش دەست بەدەست .

﴿ فليس عَلَيكُم جناحٌ أنْ لا تكتبوها ﴾ دوایی کەمامەڵەکەتان دەست بەدەست بوو لەنێوان ئێوە هیچ گوناهێ لەسەر ئێوە نیە کەنەنوسن چۆنیەتی ئەو بازرگانیە لەجیهاندا ئەگەر فەرمانەکانی خوا بۆ پێویست بوون نەبێ ، چونکە ئەو نوسینە بۆ ئەوەیە قەرزەکە لەکیس نەچێ و لەم کاتەدا قەرز نیە .

پوختەی مانای ئەو ئایەتە ئەمەیە : ئەگەر ئێوە مامەڵەتان کرد دەست بەدەست و نرخ و فرۆشراو وەرگیران ئێوە گوناهتان لەسەر نیە واز لەنوسین و شایەت گرتن بهێنن . بەلام

ئەگەر مامەڵەتان کرد بەقەرز لەکڕین و فرۆشتندا لەڕۆژێکا چەند جارێ ، وەك کڕینی خواردەمەنی ڕۆژانە و بەرگ و پۆشاك و ووردە شتی تر لەو کاتانەدا واز هێنان لەنوسینی بەڵگەنامە باشتر گوناهی تێدانیە ، بگرە نووسینەکە زۆر گرانە و ئەبێتە هۆی ئازاری زۆری مامەڵەکەران ، چونکە لەڕۆژێکا چەندجارێ ئەبێ پەلاماری پەیداکردنی نووسەر و پێنوس و کاغەز بدەن ئەوە لەلایەکەوە لەلایە ترەوە ئەگەر سوودی ئادەمیزاد لەنووسینی بەڵگە نامە و شایەت گرتندا بوو لەو کاتەدا چاك وایە ئەوانە جێبەجێ بکرێن . بەتایبەتی لەکڕین و فرۆشتنی شتەبەنرخەکاندا ، وەك زەوی و باخ و ماشێن .

کەواتە خوای گەورە بەمیهرەبانی خۆی هەموو کارو فەرمانی بۆ بەندەکانی خۆی ڕوون کردۆتەوە . لەوکاتاندا ئازاری زۆر بچێژن لەنووسین و شایەت گرتندا پێویست نیە ئازاری خۆیان بدەن ، کاتێ سود لەنوسین و شایەت گرتندابو چاك وایە ئەوانە بەجێ بهێنن، واتە وازهێنان و وازنەهێنان بەگوێرەی ئازار و سوودی ئادەمیزادە ، ئەوی گرنگبێ خوا داوا ئەکا دەستی یەکتری بەخۆڕایی نەبڕن و یەکتری ئازار نەدەن .

﴿ وأشهدوا إذا تبايعتم ﴾ وەئێوە شایەت بگرن لەکاتی کڕین و فرۆشتن لەگەڵ یەکتری ، ئیتر دەست بەدەستبێ یانە ؟ بەجۆرێ تر مانای ئەو ڕستەیە کراوە : یانی ئێوە شایەت بگرن لەکاتی بازرگانی دەست بەدەست بەتەنها و نوسین پێویست نیە . وەفەرماندان بەشایەت گرتن لەو ڕستەیەدا بۆ پێویست نیە بەڵکو چاك وایە شایەت بگرن .

﴿ ولا يضار كاتبٌ ولا شهيدٌ ﴾ وەنوسەر زیان نەدا لەهیچ شتێ و دادپەروەربێ و شایەتیش زیان نەگەیەنێ بەکەس و بەڕاستی شایەتی بدا هەرکاتێ مامەڵەکەران پێك هاتن لەسەر نوسین و شایەت گرتن و زیانیان پێ نەگا ، هەروەها ئەوانیش ئازار بەنووسەر و شایەت نەگەیەنن و زۆریان لێ نەکەن لەسەر نوسین و شایەتی هەڵگرتن و شایەتی دان ، کرێ و ئازوخەی هاتوچۆیان بدەنێ بەگوێرەی باوی کات و جێگە .

﴿ وإن تفعلوا فأنه فسوقٌ بكم ﴾ وەئەگەر ئێوە مامەڵەکەر و نوسەر و شایەت ئەو کارە زیان بەخش و قەدەغەکراوانەتان کرد و زیانتان بەیەکتری گەیاند و ، هەریەکەتان

بەپێویستی سەرشانی خۆتان هەڵنەسان ، دوایی بە ڕاستی ئـەو کـارە زیـان بەخشـانە ئێـوە کردوتانە گوناه و لادانە لەفەرمانی خوا بۆ ئێوە ، لەپەرسـتنی خـوا لاتـان داوە و تووشـی سزای خوا ئەبن .

﴿ وأتقوا الله ويعلمكم الله ﴾ وەئێـوە لـە خـوا بترسـن و بەپێچەوانـەی فـەرمانی خـوا هەڵمەسن ، خۆتان بپارێزن لەئازاردانی یەکتری و ، خوا ئێـوە فـێری بـەختیاری هـەردوو جیهانتان ئەکا . ئیتر بیانوتان نەماوە کەلەخوا نەترسن .

﴿ والله بكل شيء عليم ﴾ وەخوا بەهەموو شتێ ئەزانێ و بێ ئاگا نی‌یە و هیچ کـارێکی لێ پەنهان نی‌یە ، ئەوەی لەئاسمان و زەویدان ئەیانزانێ و لای ئەو هەموو ئەو شتانە ڕوون و ئاشکرایە .

ڕوون و ئاشکرایە خوای گەورە ڕاستەوخۆ هەریەکـە لـەئادەمیزاد فـێری هەمووشـتیان ناکا بەبێ ناردنی پێغەمەران و بیخاتە مێشکیانەوە . بەڵکو ئێمە فـێری بـەختیاری هـەردوو جیهان ئەکا بەهۆی سروشەوە کە خوا ئەینێرێ بۆ سەر پێغەمـەران ، ئـەوانیش ئێمـەی فـێر ئەکەن ، یانی ئەو سرووشە هەمو هۆی ڕانمویی تێدایە بۆ ئێمە ئەگەر وانەبێ و هـەر کەسـێ لەخۆیەوە فێری هەموو شتێ ببێ پێویست بەناردنی پێغەمەران نامێنێ ، ئەوەیش دژی یاسای خوایە . کەواتە زۆر جێگەی سەرسـوڕمانە زۆربـەی سۆفیەکان ، یـا کـەمێکیان ئـەڵێن : ڕستەی ﴿ وأتقوا الله ويعلمكم الله ﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لە خواترسان ڕاستەوخۆ فێری هەموو شت ئەبن بەبێ هۆی تر ، ئەو جۆرە فێر بوونە لای ئـەوان پـێی ئـەبێژرێ ( العلـم الـدنی ) یانێ زانین لای خوا ، ئێمە لەوەڵامیانا ئەڵێین : کاتێ ئەو داوایـە بـۆ ئـەوان ئـەبێ ﴿ يعلمكم الله ﴾ ببێ بەوەڵام بۆ ﴿ وأتقوا الله ﴾ وەنایشـبێ بـەوەڵام بـۆی هـەتا نـەبێژرێ ﴿ فيعلـمكم الله ﴾ یانی بەخستنی پیتی (ف) بۆ سەر ﴿ يعلـمكم ﴾ ، وەمەجزومیشبێ .

پاش ئەوەی خوا فەرمانی دا بەنوسینی چۆنێتی قەرز بۆ پاراستنی ئەو قەرزە فەرمانمان پـێ ئەدا بەبارمتەدانان بۆ قەرز لەکاتێکا بۆمان نەکرا بینوسین ، وەك ئەوەی مامەڵەکەران ڕێبوار بوون ، بۆیە خوا ئەفەرموێ :

﴿ وإن كنتم على سفرٍ ولم تجدوا كاتباً ﴾ وەئەگەر ئێوەی مامەڵەکەران لەسەر ڕێبواری بوون ، ناسراوی بڕواپێ کراوتان دەست نەئەکەوت قەرزتان بداتێ ، ناچار بوون مامەڵەتان بەقەرزبێ ، دەستتان نەئەکەوت نوسرێ بۆ نوسینی بەڵگەنامەی قەرزەکەتان ، یا بەچاکی نەیئەزانی بینوسێ ، یا پینۆس و کاغەز و شایەتتان بۆ پەیدا نەئەبوو ، گومانتان پەیدا کرد بۆتان پێك نایەن .

﴿ فرهان مقبوضة ﴾ دوایی کار و مامەڵەتان ببەستنەوە بەبارمتەیەکی وەرگیرا و لە لایەن خاوەن قەرزەوە ، ئەندازەی بارمتەکە بەئەندازە ژمارەی قەرزەکەبێ ، خوای گەورە فەرموی : ئەگەر ڕێبوار بوون ، بارمتە وەرگرن ، مانای وانیە لەکاتەکانی تردا بارمتە وەرناگیرێ . بەڵکو لەبەر ئەوەیە بەزۆری ڕێبواران نوسەریان دەست ناکەوێ ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بارمتەی دانا لای جولەکەیە و ڕێبواریش نەبوو .

﴿ فإن أمن بعضكم بعضاً ﴾ دوایی ئەگەر هەندێ لەخاوەن قەرزەکان دڵنیا بوون لە قەرزارەکان کە داراییەکەی ناخواو سەرچەوتی ناکەن .

﴿ فليؤد الذي أؤتمن أمانته ﴾ دوایی بیداتەوە کەسێکی ئەوتۆ وَدڵنیایی لێ پەیدا کراوە بۆ قەرزپێدانی مافی خاوەن قەرزەکە بەبێ کەم و کوڕی و سەرچەوتی و نەڵێن : ئەمڕۆ نەسبەینێ پارەکەتان ئەدەمەوە بەبێ بیانو .

﴿ وليتق الله ربه ﴾ وەپێویستە قەرزار لەخوا بترسێ کەپەروەردەکەری خۆیەتی ، ئەو قەرزەی لایەتی بەڕاستی بیداتەوە ... ئەو فەرمانە تەنها بۆ قەرز نیە هەموو شتێ ئەگرێتەوە لەکاروبار و مامەڵەی ئادەمیزاد لەنێو یەکتریدا و نابێ خراپە لەگەڵ یەکتری بکەن.

﴿ ولا تكتموا الشهادة ﴾ وەئێوە مەشارنەوە ئەو شایەتیە لاتان دوای ئەوەی شایەتیتان هەڵگرتووە ، شاردنەوەی شایەتی دان یەکێکە لە گوناهە گەورەکان .

﴿ ومن يكتمها فأنه أثم قلبه ﴾ وەهەرکەسێ شایەتیدان بشارێتەوە و دەری نەخا ، دوایی بەڕاستی ئەو کەسە گوناهبار دەبێ ، گوناه لەبەرێزتریان ئەندامیا جێگەی خۆی گرتووە کە دڵیەتی.

﴿ والله بما تعملون عليم ﴾ وەخوا بەشتێ ئێوە بیکەن ئاگادارە و ئەیزانێ لەچاکە و لە خراپە ، پاداشت و تۆڵەی هەموو کارەکانتان وەرئەگرن .

خوای گەورە لەو دوو ئایەتەدا ڕابووردوون باسی پێنج فەرمانی ئابووری گرنگی کردووە :

١- قەرز ( القرض والدين ) قەرز بریتیە لەو شتەی بدرێ بەکەسێ ، ئەو کەسە خاوەنی ئەو شتە نەبێ ، بەمەرجێ پاش ماوەیە نرخەکەی بداتەوە بەخاوەنی پێشوی ئەو شتە، قەرزدان پێویست نەکراوە لەلایەن خوای گەورەوە . بەڵکو زۆرچاکە بەگوێرەی یاسای ئایین ، بەمەرجێ ناچار نەبێ . وەئەگەر هەژاری و نەدارایی تەنگی پێ هەڵچنی بوو ، دەستی لەجێگەیە تر گیرنەبوو ، لەو کاتەدا پێویستە قەرزی بدرێتێ و نەدانی گوناهە ، بگرە لەهەندێ کاتا بەخۆڕایی بیدرێتێ . ئەگەر کەسێ داوای قەرزی کرد و ئەتزانی ئەو پارەیە دائەنێ لە گوناه و کاری قەدەغە کراودا پێویستە قەرزی نەدرێتێ ، پێویستە لەسەر خاوەن قەرز زۆرتر لە مافی خۆی وەرنەگرێ ، ئەگەر زۆرتر وەرگرێ بەسود دائەنرێ و خواردنی قەدەغەیە . خاوەن قەرز پێویستە مناڵ و شێت و گێل و زۆر لێ کراو نەبێ .

٢- نوسینی ئەندازەی قەرز و ماوەی دانەوە لەلایەن نوسەرێ جگە لەقەرز دەر و قەرز وەرگربێ ، نوسینی قەرز بەو جۆرە پێویست نەکراوە لەلایەن خوای گەورە وە بەڵکو چاك وایە بنوسرێ ، بۆ ئەوەی لەژمارەی قەرز و ماوەکەی توشی گێرە و کێشە نەبن ، بەباشی بیریان بکەوێتەوە .

٣- شایەت . مەرجەکانی شایەت : سەربەستی . بالغ و ئاقڵ . خاوەنی ڕێزگرتنی خۆی بێ . بەخەبەربێ . توانای گفتوگۆی هەبێ . گێل و گومان لێ کراو نەبێ . داد پەروەر و بێ گوناه بێ . جوزەلە لێ دەر و مۆسیقا ژەن نەبێ و ژمارەی شایەت بەم جۆرەیە : بۆ چاوپێ کەوتنی مانگی ڕەمەزانی یەك شەوە یەك شایەتی دادپەروەری بێ گومان بەسە . بۆ زینا و نێر بازی چوار پیاو پێویستە ، بۆ دارایی و ئەو شتانە پەیوەندیان بەداراییەوە هەیە

دوو پیاو یا پیاوێك و دووژن یا پیاوێك و سوێندی داواكار ، بۆ ئەو شتانە بەزۆری پیاوان ئاگاداریانن و دوو پیاوە، ئەو شتانەی بەزۆری ژنـان بیـانزانن دوو ژن و پیـاوێ ، یـا دوو پیاو، یا چوار ژن ، وەك منالْ بوون و حەیز وكچێتی و بێوەژنی و شیردان . شـایەتی دانـی باوك و باپیر و دایك بۆ كورِ و نەوەی خۆیان دروست نیـە ، شـایەتی دانـی ئـەمانیش بـۆ ئەوان دروست نیە ، هەلْگرتنی شایەتی پێویست نەكراوە بەلاّم شایەتی دان پێویستە و نابـێ داپۆشرێ .

٤- سەلـەم : كرِینی شتێكی زانراو و دیاری كراو بەشێوازێ مامەلّەكەرائن بیزانن بە ووشەی سەلـەم . بەو جۆرە بلّێ : ئەم دینارەم دا بەتۆ بەبیست كیلۆ گەنمی قەنەهاری لـەوەرزی هـاویندا بمدەیتێ ، ئەوی تریان بلّێ قبولّم كرد ، یا چـل دینـارم دابـەتۆ بەمـەرِێكی یـەك سـالّە لـەپایزدا بمدەیتێ، پێویستە لـەو جێگەیەدا مامەلّەكە ئەكەن پارەكەی وەربگیرێ ، پێویستە بابەت و ئـەندازە و شێوازی سەلـەم تێداكراو روون بكەنەوە لـەگەلّ ماوەی وەرگتنـی كاتـێ مـاوەی بـۆ دانـەنراو كوتوپرِ وەرنەگیرا ، پێویستە ئەو شتەی سـەلـەمی تێـدا ئـەكرێ كرِیـن و فرۆشـتنی دروسـتبێ ، لـەكاتی وەرگرتنیدا دەست بكەوێ ، پێویستە جێگەی وەرگرتنی سەلـەم روون بكرێتەوە .

٥- بارمتە (الرهن ) بۆ قەرزێ جێگەی خۆی گرتبێ بەتەواوی لـەگەردنی قـەرزداردا ، ئەدرێ بەخاوەن قەرز بەمەرجێ بالّغ و ئاقلّبێ ، بارمتە بەم رِستە دائەبەسترێ : ( ئەم شـتەم كرد بەبارمتەی ئەم قەرزە و لای تۆم دانا هەتا قەرزەكەت ئەدەمەوە ) ، قەرزدەریش بلّـێ : ( لـێم وەرگتی بەبارمتە ) ، دەرامەت و بەروبومی بارمتـە و بـەخێوكردنی لـەسـەر خـاوەن قەرزارەكەیـەتی ، وەقـەرزدەرنابێ هیـچ شـتێكی لێ بخـوا نەلـە كرێـێ و نەلـەبـەروبومی ، خواردنی سود و قەدەغەیە .

پایە و پێویستەكانی بارمتە ئەمانەی خوارەوەن :

أ- ئەو رِستانە بارمتە دانانەكەی پێ دائەمەزرێ (الأیجاب والقبول ) یـانی قـەرزار بلّـێ بەقەرزدەر : ئەم خانوە ، یا ئەم ماینە ، یا ئەم پارچە قوماشـەم لا دانـای بەبارمتـە ، ئـەویش بلّێ وەرم گرت .

ب- بارمتە وەرگر (المرتهن ) مەرجە بالّغ و ئاقڵ بێ ، زۆر لێ کراو و گێل نەبێ .

جـ- بارمتە دانەر (الراهن) مەرجە بالّغ و ئاقڵ بێ ، زۆر لێ کراو و گێل نەبێ .

د- بارمتە (المرهون ) پێویستە شتێکی ڕوون و دیـاری کراوبـێ ، وەك خـانوو مـاین ، بارمتە بەقەرز کە لای کەسێ بێ دروست نیی‌یە .

هـ- بارمتە بۆ دانراو (المرهون به ) مەرجە قەرزێکی وابێ ئەندازە و شێوازی لای بارمتە وەرگر و بارمتە دانەر ڕوون بێ ، بەتەواوی جێگـەی خـۆی گرتبـێ لەگـەردنی بارمەتـەدا نەری قەرزاردا . پاش تەواو بوونی ماوەی قەرزەکە ئەگەر نەدرایەوە بارمتەکـە ئەفرۆشـێ و خاوەن قەرز بەشی خۆی هەڵەگرێ .

لەنامە یاساییەکاندا بەدرێژی باسی قەرز و نووسینی بەڵگە نامـە و شـایەت و سـەلەم و بارمتە کراون ، بۆئەوەی چاك تێ بگەن هەریەکەیان لەجێگەی خۆیانا تەماشای بکەن ..

خـوای گـەورە لـەم سورەتەدا باسـی بەڵگـەکان لەسـەر یـەکێتی خـوای گـەورە و ڕەوانەکردنی پێغەمەران و نوێژ و ڕۆژوو زەکات و تۆڵە سەندن لەپیاو کـوژان و حـەج و جەنگ کردن بۆ سەرکەوتنی ئایینی ئیسلام و حەیز و تەلاق و عیدە و مـارەیی و خولـع و سوێند خواردن بۆنەچونـە لای ژنـان و شـیردان بـەمنالان و کڕیـن و فرۆشـتن و سـود و قەرزدان و سەلەم و بارمتەی بۆ کردین ، لـەدوای ئەوانـە بەگشـتی و چـەندین تـری زۆر کۆتایی بە سورەتەکە ئەهێنێ بەباسی بەڵگەی تەواو لەسـەر خـاوەنێتی خـوای گـەورە بـۆ هەموو بونەوەران و ئەفەرموێ :

لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۗ وَإِن تُبْدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُۖ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٖ قَدِيرٌ ﴿٢٨٤﴾

﴿ لله مافي السماوات وما في الأرض ﴾ بۆ خوایە پاشایەتی و بەڕێوەبردن و دروست کردنی شتێ لەئاسمانەکاندایە لەئەستێرە و فریشتەکان و ، شتێ لەزەویدایە لەئادەمیزاد و گیانەوەران و درەخت و بەرد و ئاوو گیاو کانەکان ، بچوك و گەورەیان ، کەم و زۆریان، سەرەوەیی و وژێرەوەیی .

﴿ وإن تبدوا ما في أنفسكم أو تخفوه يحاسبكم به الله ﴾ وەئەگەر ئێوە دەری بخەن شتێ لەدەرونتانایە لەپەرستنی خوا و بێ فەرمانی خوا ، یا ئێوە بیشارنەوە ئەو شتە ، ئیتر بڕیارتان دابێ بیکەن یا نە ؟ هەمویان بەئاشکرا و نهێنیانەوە بەدەستی خوان ، خوا بەهۆی ئەو شتەوە پرسیار لەئێوە ئەکا و پاداشتیان وەرئەگرن لەپاشە ڕۆژدا .

بۆ زانین : ئەوەی پوختەی مەبەستێ لەو فەرمودەی خوایە بەم جۆرەیە بەگوێرەی بیروڕای زانایان : بەڕاستی نیازی بێ باوەڕی ئەبێ بەهۆی باوەڕنەبوون ، هاتوچۆی گوناه بەدەروندا بەبێ نیازی کردن لێبوردنی خوای بۆ ئەبێ . نیازی کردنی گوناهو پەشیمانی پیاو داوای لێبوردن لەخوا بکا خوا لێی ئەبورێ . بەلاَم کەسێ نیازی خراپەیە بکا و بەردەوام بێ بۆکردنی و شتێ ڕێگە بە کردنی بگرێ کەبەدەستی خۆی نەبێ سزای نادرێ بەسزای کردنی ، ئایا سزای ئەدرێ لەبەر نیازەکەی ، هەندێ لەزانایان لایان وایە سزای نادرێ ، لەبەر فەرمودەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ . خوا ئەبورێ لە ئۆمەتی من لەو شتانە ئەڕوا بەدەرونیدا بەمەرجێ نەیکا . زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن خەتەرەی دەرون بەبێ نیاز و کردن سزای لەسەر نیە بەلاَم سزادان لەسەر نیازی گوناه هەیە ..

﴿ فيغفر لمن يشاء ﴾ دوایی خوا خۆش ئەبێ لەکەسێ ئارەزوی بکا بەهۆی میهرەبانی،خۆیەوە ، یانی گوناهی لێ پەیدا بووە ، بەلاَم باوەڕی ڕاستەقینەی بەخوا جێگەی گرتووە لەدەرونیدا و پەشیمان بۆتەوە ئەو کاتە ئەبێـە جێگەی لێ بووردن .

﴿ ويعذب من يشاء ﴾ وەخوا سزای کەسێ ئەدا ئارەزوی هەبێ ، وەك کەسێ هاتووە بەدەرونیدا گوناه بکا و کردبێتی و زۆرگرنگ نەبوبێ لای کردنی ئەو گوناهە ، پەشیمان نەبوبێتەوە ، ئەو کەسە جێگەی خەشمی خوایە و سزای ئەدا :

﴿ والله على كل شيء قدير ﴾ وەخوا بەسەر هەموو شتێکا توانای زۆرە لەهەندێ کەس خۆش ئەبێ ، سزای هەندێ ئەدا . هەموو ئادەمیزاد زیندوو ئەکاتەوە پرسیاری چاکە و خراپەیان لێ ئەکا ، هەریەکەیان بەگوێرەی کردەوەی خۆیان تووشی پاداشت و تۆڵە ئەبن .

خوای گەورە کەباسی نوێژ و زەکات و فەرمانەکانی تر هەواڵی پێغەمەرانی کرد ، کۆتایی بەسورەتەکە ئەهێنێ بەوەی پێغەمەر و هەموو باوەڕداران بڕوایان بەوانە هەیە .

ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَعَلَيۡهَا مَا ٱكۡتَسَبَتۡۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذۡنَآ إِن نَّسِينَآ أَوۡ أَخۡطَأۡنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرٗا كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلۡنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦۖ وَٱعۡفُ عَنَّا وَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَآۚ أَنتَ مَوۡلَىٰنَا فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٨٦﴾

بەر لەوەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بکرێ بەپێغەمەر بڕوای بەیەکێتی خوا هەبووە ، نەی ئـەزانی قورئان و باوەڕهێنان چۆنە. وەك خوا ئەفەرموێ:﴿ ما كنت تدري ما الكتاب ولا الأيمان ﴾ تۆ نەت ئەزانی نامە چ شتێکە و باوەڕهێنان چۆنە ، بـەڵام پـاش هاتنـە خـوارەوەی قورئـان پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەبێ گومان بەدڵی بێ گەردەوە باوەڕی بەخوا و هەموو فەرمانەکانی هێنا و بۆی درکەوت سروشی بۆ هاتووە ، وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ آمن الرسول بما أنزل إليه من ربه والمؤمنين ﴾ باوەڕی هێناوە نێردراوی خـوا بەشـتێ نێرراوەتەوە خوارەوە بۆ لای لەلایەن پەروەردەکەری خۆیەوە کەقورئانی پـیرۆزە بەهـەموو ناوەرۆکیەوە . ئەو باوەڕەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەئەندازەی بـاوەڕی هـەموو پـەیڕەوەکانێتی ، بگرە زۆر تریشە بەو بۆنەوە پێغەمەر جگە لەباوەڕهێنان پێویستە لەسەری خۆی ماندوو بکا بۆ ئەو شتەی هاتووەتـە خـوارەوە بـۆلای و ڕای بگەیـەنێ بـە ئـادەمیزاد و بـاوەڕدارانیش باوەڕیان هێناوە بەو شتە هاتوەتە خوارەوە بۆ لای پێغەمەر لەلایەن پەروەردگارەوە .

﴿ كل آمن بالله ﴾ هەموو کەسێ لەباوەڕداران بڕوایان هێناوە بەخوایە تاك و تەنـها بـێ هاو بەشە لەپەرستندا ، هەربوە و هەر ئەبێ ، هەموو شتێ ئەزانێ ، دروست کەری هـەموو بونەوەرانە .

﴿ وملائكته ﴾ وەبڕوایان هێناوە بەفریشتەکانی خوا ، هـەموویان بـەندەی ڕێزگـیراوی خوان ، بێ فەرمانی خواناکەن، نەنێرن و نەمێ ، خەوو خواردنیان نیە ، دروســت کـراوی خوان ، نەخوان و نەکچی خوان .

﴿ وكتبه ﴾ وە بڕوایان هەیە بەهەموو نامەکانی خوا هەر لەپەڕاوەکانی ئادەمـەوە هـەتا تەورات و ئینجیل و لـەکۆتاییدا بـەقورئانی پـیرۆز . هـەموویان لەلایـەن خـوای گـەورەوە هاتوون بۆ پێغەمـەران ، هـەموویان =دە سـتور و یاسـای خـوان بـۆ کـاتی خۆیـان جگـە لـەقورئانی پیرۆز کە یاسا و دەستوری هەموو کات و جێگەیەکـە بـۆ هـەموو ئـادەمیزادی سەر زەویە هەتا هەتایە ، سەرچاوەیان یەکن ، پاك و خاوێن و بێ دەستکارین ئەگەر یــەکێ

لەو نامانە لەسەرچاوەی ئایینداجیاوازی هەبوو لەگەڵ قورئاندا بە دەست کاری کراوی جولەکە و گاورەکان دائەنرێ .

﴿ ورسله ﴾ وەبڕوایان هەیە بەنێراوەکانی خوا هەمویان بەبێ جیاوازی . هەموویان بەر لە منالّی و پاش منالّی ، بەر لەپێغەمەرایەتی و پاش بە پێغەمەربوون نەگوناهی گەورە و نەگوناهی بچوکیان نەرکردووە ، لەهەموو ڕویەکەوە ڕاست وێژ بوون .

﴿ لا نفرق بين أحدٍ من رسبله ﴾ ئێمەی موسوڵمان جیاوازی پەیداناکەین لەنێوان هیچ یەکێ لە فردۆستکانی خوا، بڕوامان بەهەمویان هەیە بەبێ جیاوازی ، نەك وەك جوولەکە بڕوایان بەعیسا و بەموحەمەد نیە و ، گاورەکان بڕوایان بە موحەمەد نیە ، کەواتە ئەگەر کەسێ بڕوای بە خوا هەبێ . بەلاّم بڕوای بەیەکێ لەو فروستادانە نەبوو ، بڕوای بەیەکێ لەو نامانە نەبوو بەبێ باوەڕ دائەنرێ .

﴿ وقالوا سمعنا واطعنا ﴾ وە باوەڕداران ئەڵێن بیستومانە فەرمودەکانی خوا ، بڕوای ڕاست و بێگومانمان بەو فەرمودانە هەیە و ، ئێمە فەرمانبەرداربووین بۆ هەموو یاسا و دەستوری قورئان ، بڕوامان بەهەموو پێویستکراوەکانی و قەدەغەکراوەکانیان هەیە .

﴿ غفرانك ربنا ﴾ ئێمە داوای لێ خۆشبوونی تۆ ئەکەین ، ئەی پەروەردەکەری ئێمە ئێمەی موسوڵمان جگەی لەتۆ کەسی ترمان نیە ، بۆیە داوات لێ ئەکەین ببورە لەکەم و کوڕیمان بەرانبەر بەفەرمانی تۆ .

﴿ وإليك المصير ﴾ وەبۆ لای تۆیە گەڕانەوە و چارەنوسمان ، لەڕۆژی دواییدا نەك بۆ لای جگەی تۆ .

خوای گەورە لەو ئایەتەدا باسی ئەو کاتانە ئەکا تێپەڕیوە بەسەر موسوڵمانان :-

١- بەڕستەی ﴿ آمن الرسول ﴾ باسی کاتی ڕابوردویان ئەکا .

٢- بەڕستەکانی ﴿ سمعنا وأطعنا ﴾ باسی کاتی ئێستایان ئەکا .

٣- بەڕستەی ﴿ وإليك المصير ﴾ باسی کاتی پاشەڕۆژیان ئەکا .

﴿ لا يكلف الله نفساً إلا وسعها ﴾ خوا زۆر ناکا و داوا لــەهیچ کەسێ بـۆ کـردن و نەکردنی هیچ شتێ ناکا مەگەر بەشتێ لــەتوانانیانا هـەبێ ، داواکردنـی شـتێ لـەئادەمیزاد لەتوانایا نەبێ ستەمە ، خوای گەورە ستەم ناکا لەبەندەکانی خۆی . بەلاّم پێشەوا ئەشعەری ئەلّێ داوای شتێ لەتوانادا نەبێ دروستە بۆ تاقی کردنەوە .

بۆ زانین : پلەی داواکردنی شتێ لەتوانادا نەبێ سێ پلەن :

١- شتێکە نەگونجێ کردنی لەخۆیا ، ئەمەیان دروست نیە داواکردنـی ، وەك ئـەوەی شتێ لەیەك کات ڕەشبێ و سپی بێ .

٢- شتێکە بگونجێ کردنی لەخۆیاو نەگونجێ پەیدا بوونی لەئادەمیزادە ، ئەم بەشـەیان داواکردنی پەیدا نابێ و دروستە داوای بکرێ . وەك دروست کردنی گیانداری .

٣- شتێکە بگونجێ کردنی لەخۆیاو ئەگونجێ لەبەندە و پەیدا ببێ . بەلاّم زانستی خـوا پەیوەستە بەنەکردنی ، ئەم بەشەیان پەیدائەبێ و دروستیشە داواکردنی ، وەك باوەڕهێنان.

﴿ لها ما كسبت ﴾ بـۆ ئـەو کەسـە هەیـە شـتێ کردویـەتی لەچاکـەو پەرسـتنی خـوا بەگوێرەی کردەوەی چاکی پاداشتی ئەداتەوە .

﴿ وعليها ما أكتسبت ﴾ وەلەسەر ئەوە کەسەیە کردویەتی لەخراپە ، بەشوێنیا گـەڕاوە بۆ کردنی خراپە و سوود لەچاکەی کەس وەرناگرێ .

لەبەزەیی و میهرەبانی خوایـە کەبـەندەی خـۆی چاکـەی کـرد کوتوپـڕ فـەرمان ئـەدا بەنووسینی هەر لەکاتی کردنیدا ، ئەگەر خراپەی کرد نووسینەکەی دوا ئەخا بۆ ماوەیـە ، ئەگەر پەشیمان بویەوە داوای لێ بووردنی کرد نانوسرێ خراپەکەی ، ئەگەر بەردەوام بـوو لەسەر کردنی و پەشیمان نەبویەوە فەرمان ئەدا لەسەر بنووسن .

کۆمەڵێ لەخواناسـان ئـەلێن ، ئـادەمیزاد خـۆی لـەخۆیا پـاڵ پێوەنـەرێکی هەیـە لـە دەروونیدا کەچاکە بکا ، چونکە لەسەر پاکی دروست بووە ، خراپە ناکا مەگەر هۆیـەکی دەرەکی پاڵی پێوەبنێ لەشوێنەوار و پەروەردەکردنی خراپ .

خوای گەورە و موسوڵمانان فێری پاڕانەوە ئەکا و ئەفەرموێ بڵێن :

﴿ ربّنا لاتؤاخذنا إن نسينا أو أخطئنا ﴾ ئەی پەروەردەکەریۆ ئێمە : تۆ سزای ئێمە مەدە ئەگەر ئێمە لەبیرمان چوبوەوە کارێکی چاك بکەین و لەدەستمان دەرچوبوو خراپەمان لێ وەشایەوە ، یا ئێمە خەڵەتاین و بەخۆمانمان نەزانی و گوناهمان لێ پەیدا بوو ، بەسەر لێ شێواوی نارەواییمان کرد .

بۆ زانین : لەبارەی لەبیر چوونەوە و خەڵەتان (النسيان والخطأ ) ووتویانە ئەو دووشتە لەژێر ویستوو توانای ئادەمیزادا نین ، کەواتە سزای لەسەریان هەڵگیراوە . ئیتر پاڕانەوەی بۆ چیە؟

ئەوەی ڕاستبێ بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پسیارە ئەمەیە : بەڕاستی لەبیر چوونەوە و هەڵە بەدوو جۆرە:

١- هەندێ جار ئەوانە پەیدا ئەبن لەئادەمیزادە و لەدوای هوشیاری و خۆپاراستن لەوان ، ئەم جۆرەیان خاوەنەکەیان بیانوودارە و دروست نیە سزای بدرێ بەگوێرەی دادپەروەری .

٢- هەندێ جاریش ئەوانە پەیدا ئەبن بەهۆی سستی و کەمتەرخەمیەوە ، ئەم جۆرەیان بیانوی بۆ دانانرێ و دروستە سزادانی ، فەرمودەی خوا لەم بەشەیانە و پاڕانەوەی بۆ ئەکرێ لەخزمەت خوادا .

﴿ ربنا ولا تحمل علينا إصراً ﴾ ئەی پەروەردەکەری ئێمەو ، تۆ مەیدە بەسەر ئێمەدا باری قورس و گران و نەتوانین هەڵی گرن و بەو بۆنەوە تووشی بێ فەرمانی تۆ ببین .

﴿ كما حملته على الذين من قبلنا ﴾ بەوێنەی ئەو بارەگرانەی داوتە بەسەر کەسانێکی ئەو تۆ لە پێش ئێمەدا بوون. وەك جوولەکەکان ئەگەر یەکێ گوناهی بکردایە پەشیمان بونەوەی لێ وەرنەئەگیرا و ئەبوایە بکوژرایە ، ئەگەر جێگەیە لەبەرگی پیس ببوایە ئەبوایە بیان بڕیایە ، لەشەوو ڕۆژێکا پەنجا نوێژیان لەسەر پێویست کرابوو ، پێویست بوو لەسەریان چواریەکی دارایی خۆیانیان بدایە لەزەکاتا .

﴿ ربنا و لا تحملنا ما لا طاقة لنا به ﴾ ئەی پەروەردەکەری ئێمە ، تۆ داوا لەئێمە مەکە شتێ لەتواناى ئێمەدا نەبێ ، وەمەیدە بەکۆڵی ئێمەدا ئەو سزایانەی داوتە بەسەر ڕابووردواندا و لەتواناى ئێمەدا نی‌یە بەرگەی بگرین .

پ/ جیاوازی لەنێوان ڕستەی ﴿ ولا تحمل علینا إصراً ﴾ وەڕستەی ﴿ ربنا و لا تحملنا ما لا طاقة لنا به ﴾ چ شتێکە و سوود لەدووپات کردنەوەی چی‌یە ؟

وەڵام / مەبەست لەناوەڕۆکی ڕستەی پێشوو داواکردنی ئەوەیە لەپەرستن و فەرمان بەرداریدا شتی گرانیان لێ داوانەکرێ . مەبەست لەناوەڕۆکی ڕستەی دووەم داواکارن بۆ ئەوەی سزای گرانیان بەسەردا نەدرێ کەبەرگەی نەگرن .

﴿ وأعف عنا وأغفر لنا وأرحمنا ﴾ وەتۆ پەروەردگار ببورە لەگوناهەکانمان و بیان شۆرەوە ، تۆ داپۆشە گوناهەکانی ئێمە و ئابڕومان مەبە، بەزەیی خۆتمان بەسەردا بڕێژە و ڕزگارمان بکە لەسزای خۆت .

﴿ أنت مولانا فأنصرنا علی القوم الكافرین ﴾ تۆ یاریدەدەر و پارێزەر و کار بەڕێوەبەری ئێمەی ، دوایی تۆ سەرمان بخە بەسەر کۆمەڵی بێ باوەڕاندا .

**بەیاریدەی خوا کۆتایی بەنووسینی ئەم بەشە هات**

**ڕۆژ / یەك شەممە**

**ڕێکەوتی ١٩٩٨/٧/٢٦**

**لەشاری سلێمانی**

*خوایە لەگوناهی خۆم و باوکم و دایکم خۆش ببە*

*یاریدەی کوڕو نەوەکانم بدە لەسەر پەرستنی خوا .*

کۆمەڵێ لەگاورەکانی نەجران هاتن بۆ خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ پێك هاتبون لـــە (٦٠) پیاو بەسەرۆکایەتی پاشا و شالیار و قەشە ، ئەو قەشەیە خاوەنی خوێندنگـــا و وابنـــە بیـژ و یاسازانی گاورەکان بوون ، لەمزگەوتی مەدینـــە چوونـــە لای پێغەمـــەر﴿ﷺ﴾ پـاش نوێـژی عەسـر دەسـتیان کـرد بـەنوێژکردنی خۆیـان . پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ فـەرمانی دا بـەهاوڕێکانی مزگەوتیان بۆ چۆڵ کەن ، پاش نوێژی خۆیان دەستیان کـــرد بـەگفتوگۆ لەگـەڵ پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ دەربارەی عیسا ، ئایا کوڕی خوایە یانـــە؟ ، پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ وەڵامـی دانـەوە بـەو جۆرەی کە ملیان بۆ کەچ کرد .

بەڵام چونکە دڵیان بەگوناهەوە بەسترا بوو ، باوەڕیان نـــەهێنا . دوایـی خـوای گـەورە زیاتر لە هەشتا ئایەتی لەو بارەیەوە ناردە خوارەوە ، لە پێشەکی سورەتی ئالی عیمراندا .

سورەتی ئالی عیمران لەمەدینە هاتووەتە خوارەوە ، ژمارەی ئایەتەکانی دووسەد ئایەتن .

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَيُّ ٱلْقَيُّومُ ﴿٢﴾ نَزَّلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنزَلَ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴿٣﴾ مِن قَبْلُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَأَنزَلَ ٱلْفُرْقَانَ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٤﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَخْفَىٰ عَلَيْهِ شَىْءٌ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٥﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُصَوِّرُكُمْ فِى ٱلْأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَآءُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٦﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

[ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ]

﴿ ألم ﴾ لەسورەتی ئەلبەقەرەدا باسی مانای ئەو پیتانە کراوە . ئەوەی جێگەی متمانـەی زۆری زانایانە ئەڵێن : ئەم نامەیـە کەهاتووەتـە خـوارەوە بـۆ پێغەمـەرێك لەرەگـەزی ئـەو پیتانەیە، کە عەرەبەکان خۆیان گفتوگۆیان پێ ئـەکردن ، کـەچی شـێوەی دارِژاندنـی ئـەم نامەیە سەری پێ شۆڕ کردن و نەیان توانی وێنەی ئەو نامەیە دابنێن هەرچـەندە ئـەم مانایـە هەڵبژاردنی بەندەیە ، بەڵام خوای گەورە زاناترە بەماناکەی .

﴿ الله لا إله إلاّ هوَ الحيُّ ﴾ خوایە شایستەی پەرستنێ هەر خوایە ، هیچ خوایە نیـیـە و هەبێ و پەرستنی بۆ بکرێ مەگەر هەر ئـەو خوایـە ، زینـدووە و نـامرێ ، گیـانی هـەموو بوونەوەرانی بەدەستە کە یەکێ لەوان عیسایە .

﴿ القیوم ﴾ ئەو خوایە ڕاوەستاو و پایەدار بەسەر هەموو بوونەوەراندا بەشتێ ئەیکەن و داد پەروەرە ، هەڵسوڕێنەری کاروباری ئادەمیزاد و ئـەیانپارێزێ ، ئیـتر چـۆن ئـەبێ نـەی پەرستن ؟

ئێمەی موسوڵمان بەناوەرۆکی ئەو ئایەتە جوێ ئەبینەوە لە جولەکەکان . ئەوان ئەڵێن : عوزەیر خوایە ، ، وەئەو بیر و باوەڕە پووچـەی ئـەوان لەنامـەی بـەلای خۆیانـەوە پـیرۆز (الکتاب المقدس ) لەنامەی دروست کردن ( سفر التکوین ) . و لەڕاستیەکانی شەشـەمدا (الأصحاح السادس ) کوڕایەتی عوزەیریان بۆ خوا نووسیوە .

لەگاورەکان جوێ ئەبینەوە ، ئەوان هەندێکیان ئەڵێن : خوا سێهەمین خوای سێ خوایە. هەندێ تریان ئەڵێن: عیسا کوڕی خوایە و هەر ئەو خوایە بەتەنها ، هەندێ تریـان ئـەڵێن : عیسا و مەریەمەی دایکی عیسا هەردووکیان خوان ، هـەندێ تریـان ئـەڵێن : قەشـەکان و پارساکان جگە لەخوا ئەوانیش خوان . بەسەدسـاڵ بـەر لـەهاتنی ئـاینی ئیسـلام هـەندێ لەپاشای گاورەکان ، بەتایبەتی هیرقەل ویستیان ئەو بیرو باوەڕە پوچەلەنێو خۆیانا لابـەن ،

بەڵام لەبەر چەند هۆیەکی ڕامیاری بۆیان نەلوا و وازیان هێنا . لەبت پەرستەکان جوێ ئەبنەوە و ئەوان دێو و درنج و فریشتە و مانگ و خۆر و بتیان ئەپەرست . کەمێکیان ئەڵێن : بۆیە ئەیان پەرستین لەخوامان نزیك بکەنەوە .

﴿ نزل عليك الكتاب بالحق ﴾ خوا ناردویەتیە خوارەوە ئەو نامەیە کە قورئانە بۆ سەر تۆ موحەمەد پلەبەپلە و ماوەبەماوە لەماوەی نزیکەی بیست و سێ ساڵدا بەڕاستی بۆ ڕوون کردنەوەی ڕاستی و پوچی .

﴿ مصدقاً لما بين يديه ﴾ ئەو قورئانە بەڕاستی گێراوە ئەو نامانە هاتونەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمەرانی پێشوو دابین ئەکا وەك ئەوان باوەڕ بەتاکی خوا و بەپێغەمەرانی ڕابووردوو و بەڕۆژی دوایی و بەپایەکانی ئایین .

﴿ وأنزل التوراة ﴾ وە خوا ناردویەتی‌یە خوارەو تەورات بۆ سەر موسا بەیەك جار ئەو تەوراتەی کاتی موسا . نەك ئەم تەوراتەی دەستکاری کراوی ئێستا لەلایەن مالومەکانی جولەکە ئەڵێن : عوزەیر کوڕی خوایە ، شێوازی پێغەمەریان لەودا فرێداوە .

تەورات ووشەیەکی عبریە بەمانا دەستورە . بەلای خاوەن نامەکانەوە تەورات لەپێنج نامە پێك هاتووە (الأسفار) .

١- نامەی دروستکرن (التكوين) باسی دروستکردنی بونەوەران ئەکا بۆ یەکەمجار لەگەڵ هەواڵی پێغەمەران .

٢- نامەی دەرچوون (الخروج) مێژووی کوڕو نەوەکانی ئیسرائیل و موسای تێدا نوسراوە .

٣- نامەی دووانە (التثنية) باسی یاسا و دەستوری جولەکەکان ئەکا .

٤- نامەی لاویەکان (سفر اللاويين) باسی چونێتی پەرستن و خواردەمەنی قەدەغە کراو ئەکا لەباڵندە و زیندەوارانی تر .

٥- نامەی ژمارە ( سفر العدد) باسی ژمارەی هۆزەکانی کوڕانی ئیسرائیل و لەشکرەکانیان ئەکا . ئەو نامەیە لەژمارەی (٣٩)ی نامەدا کۆکراونەتەوە ، گاورەکان ناویان ئەبەن بەپەیمانی کۆن (العهد القديم) .

﴿ والأنجيل ﴾ وەناردویەتیە خوارەوە ئینجیل بۆ سەر عیسا بەیەك جار . مەبەست لەو ئینجیلە ئەو ئینجیلەیە خوا ناردوویە بۆ سەر عیسا . نەك ئەو ئینجیلە دەستکاری کراوە لەلایەن قەشەکانەوە ئەڵێن : عیسا کوڕی خوایە ، ڕەوانەکردنی پێغەمەری ئیسلام و شێوازی ناوی ئەویان لەئینجیلدا کوژانوەتەوە ، ئینجیل ووشەیەکی یۆنانیە ، بەمانا موژدەدانە .

ئینجیلە بڕوا پێکراوەکان لای گاورەکان چوار ئینجیلن ، هەرچەندە ژمارەی ئینجیل زۆرن :

١- ئینجیلی (متی) مێژووی دانانی ئەو ئینجیلە ئەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی (٦٠) ساڵ پاش لەدایکبوونی عیسا ، بەزمانی ئارامی دانراوە .

٢- ئینجیلی مارقوس : لەنێوان (٦٣ – ٦٥ ) زاینی بەزمانی یۆنانی دانراوە .

٣- ئینجیلی یوحەنا : مێژووی دانانی لەنزیکەی (٩٣) ساڵی زاینی بەزمانی یۆنانی دانراوە.

٤- ئینجیلی لوقا : لەکاتی مێژووی ئینجیلی مارقوسدا دانراوە بەزمانی یۆنانی .

ژمارە و کاتی دانانی ئەو ئینجیلانە بۆمان دابین ئەکەن کە فەرموودەی ڕاستەقینەی ئینجیل نین ، ئەوە لەلایە ، لەلایە ترەوە جگە لەوە کە دانراوی ئەو چوار کەسەن لە نێو خۆیانا دژایەتی زۆریان بۆ یەکتری تێدایە .

گاورەکان لەسەردەمی سەدەی پێنجەمی زاینیدا هاتنە سەر ئەوەی لەنێو هەموو نامەکاندا پشت بە (٣٧) نامەیان ببەستن ، ئەڵێن : ئەوانە هەموویان بەسروش لەلایەن خواوە نێردراون بۆ دانەرەکانیان بەمانا نەك بەووشە و پیت ، ئەو نامانە بەپەیمانی تازە ناو ئەبەن گاورەکان بەلای خۆیانەوە (العهد الجديد) بۆئەوەیە بەرانبەری پێ بکەن بەپەیمانی کۆنی جولەکەکان کەئەی گێڕنەوە بۆ لای سەردەمی موسا ، سەردەمی عیسا بە پەیمانی تازە ناو ئەبەن .

﴿ مِنْ قَبلُ هدىً للناس ﴾ لەپێش ناردنی قورئان ڕانموویی کەر بوون بۆ ئادەمیزادی ئەو سەردەمە بەجۆرێکی ڕاست و ڕەوان ، لەو دوو نامانەدا پەرستنی جگەی خوا قەدەغە بوون. کەواتە بیرو باوەڕی جولەکەکە و گاورەکان پوچە ئەڵێن : عیسا و عوزەیر کوڕی خوان شایانی پەرستنن .

﴿ وأنزل الفرقان ﴾ وەخوا ناردویەتیَ خوارەوە نامەیە لەیەك جویَ ئەکاتەوە ڕاست و پوچ ، نامە بڕوا پیَ کراوەکان جویَ ئەکاتەوە لەنامە دەست کاری کراوەکان .

زانایان ئەڵێن : مەبەست لەفورقان یەکیَ لەمانەیە : ئەقڵ ، زبور ، قورئان ، هەموو نامەکانی خوا ، ئەو کارە بەکەس نەکراوانە لەو نامانەدان ، هەموو شتیَ ببێە هۆی جویَ کردنەوەی ڕاستی و پوچی . هەرکام لەو مانانە بیَ مەبەستەکە ناگۆڕیَ .

﴿ إن الذين كفروا بآيات الله ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە بەئایەتەکانی نامەی خواو و بەنیشانە ڕوون و ئاشکراکانی . ناوەڕۆکی ئەو ڕستەیە هەروەك هەموو بیَ باوەڕان ئەگرێتەوە بەگشتی ، ئەو (٦٠) کەسەی نوێنەرانی گاورەکانی نەجران ئەگرێتەوە بەتایبەتی .

﴿ لهم عذابٌ شديد ﴾ بۆ ئەوە بیَ باوەڕانە هەیە سزایەکی زۆر سەخت لەپاشەڕۆژدا .

﴿ والله عزيز ذو أنتقام ﴾ وەخوا زۆر بالادەستە و کەس بەسەریا زاڵ نابیَ ، خاوەنی تۆڵە کردنەوەیە لەبیَ باوەڕان.

﴿ إنَّ اللّهَ لا يخفى عَلَيهِ شيءٌ ﴾ بەڕاستی خوا پەنهان نیە لەسەری هیچ شتیَ لەبونەوەران.

﴿ في الأرض ولا في السماء ﴾ نەلە زەوی و نەلەئاسمان . بەڵکو زانینی هەموو شتیَ لەواندا بیَ ئەیگرێتەوە ، ئاگاداری باوەڕو کردەوەی موسوڵمانانە ، کردەوە و بیَ باوەڕی بیَ باوەڕان ئەزانیَ ، ، پاداشت و تۆڵەی هەموویان ئەداتەوە بەگوێرەی بیرو باوەڕ و کردەوەی خۆیان ، گفتوگۆی نوێنەرانی گاورەکانی نەجرانیش لای خوا ڕوونە ، سزای بیَ باوەڕی ئەوان ئەۆداتەوە کە خۆیان هەڵئەکێشا .

﴿ هو الذي يصوركم في الأرحام ﴾ خوا کەسێکی ئەوتۆیە نەخشەی ئێوە ئەکێشێ لەمنداڵدانەکاندا و دروستتان ئەکا .

﴿ كيف يشاء ﴾ بەهەر جۆرێ بیەوێ و ئارەزوو بکا : درێژبێ یا کورت ، نێر بێ یا مێ ، ڕەش بێ بیا سپی ، تەواو بێ یا ناتەواو ، جوان بێ یا ناشیرین ، زانا بێ یا نەزان ، عیسا یەکێکە لەوانە خوا نەخشەی کێشاوە لەمنداڵدانی مەریەمەدا ، ئیتر چۆن خۆی نەخشەی ئەکێشێ و خۆی دروست ئەکا .

﴿ لا إله إلاّ هو العزيز الحكيم ﴾ هیچ خوایە نی‌یە شایستە بێ پەرستنی بۆ بکرێ مەگەر ئەو خوایە زۆر بەتوانایە و نەخشەی هەموو بونەوەران ئەکێشێ ، خوایە کە کارو فەرمانی بوونەوەران هەڵئەسوڕێنێ ، هەموو شتێ لەجێگەی شیاوی خۆیدا دەئەنێ . ئەو ڕستەیە دووپات کراوەتەوە بۆ لوت سۆلا نەوەی گاورەکان ئەلێن : خوا سێهەمی سێ خوان.

بەکورتی هەوڵدان بەهەندێ شت ، وەك زیندوو کردنەوەی هەندێ مردووان لەلایەن عیساوە ، لەدایك بوونی بەبێ باوك نیشانەی ئەوەنی‌یە کە عیسا خوابێ ، خوا ئەبێ هەموو شتێ کە لەبەرچاو نین بیانزانێ ، لەزەوی و لەئاسماندا هیچ شتێکی لێ پەنهان نەبێ ، هەموو مردووان زیندوو بکاتەوە بەبێ جیاوازی ، پێویستە توانای بەسەر هەموو بوونەوەراندا هەبێ کەیەکێ لەوانە دروستکردنە بەبێ باوك ، دروست کردنی هەموو بونەوەران لەنەبوونەوە بۆ بوون ، ڕ،ون و ئاشکرایە عیسا توانای ئەوانەی نیە و ناتوانێ هەموو مردووان زیندوو بکاتەوە ، توانای ئەوەی نیە هیچ کەسێ لەمنداڵدانی دایکا دروست بکا بێ باوك ، بەبێ هۆی دایك و باوك دروستی بکا ، پێچەوانەی ئەوانە بۆ عیسا ڕاستە ، لەبەر ئەوەی خۆی لەمنداڵدانا دروست بووە . گەورەترین بەڵگە لەسەر نەبونی عیسا بەخوا ئەوەیە : چ کەسێ بەر لەعیسا بوونەوەرانی دروست کردووە؟

خوای گەورە لەمەو بەر باسی ناردنە خوارەوەی قورئانی کرد ، لەمەو دوا باسی چۆنێتی ناردنە خوارەوەی ئەکا و ئەفەرموێ :

هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٧﴾ رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا وَهَبۡ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةًۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ﴿٨﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ جَامِعُ ٱلنَّاسِ لِيَوۡمٖ لَّا رَيۡبَ فِيهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ ﴿٩﴾

﴿ هو الذي أنزل عليك الكتاب ﴾ خوا کەسێکی ئەوتۆیە ناردویێتیە خوارەوە بۆ سەر تۆ ئەو نامەیە کە قورئانە . بەڕاستی خوایەکە لەزەوی و ئاسماندا هیچ شتێکی لێ وون نابێ .

﴿ منه آيات محكمات ﴾ هەندێ لەو نامەیە چەند ئایەتێکن ماناکانیان ڕوون و ئاشکران و پێویستیان بەمانا لێکدانەوە نیە ، مەبەستەکە ئەگەیەنن بەڕوونی ، گۆڕان کاری و لادانی بۆ لای مەبەستێکی تایبەتی هەڵناگرن . نەلەمانای پیت و نە لەماناکانیانا گومانیان تێدا دەرناکەوێ ، جێگەی ووردەکاری نین هەتا ماناکانیان بگۆڕرێن .

﴿ هُنَّ أم الكتاب ﴾ ئەو ئایەتانە ئەسڵ و بنچینەی ئەو نامەیەن بۆ ئەو فەرمانانە ئادەمیزاد لەهەردوو جیهاندا بێ ئەوان نایان کرێ ، وەك ناوەرۆك و پوختەی مانـــای ﴿ قـل هـو الله أحد ﴾ ﴿ إن الله لا یأمر بالفحشاء ﴾ . تۆ بڵێ : خوا تەنهایە . بەڕاستی خوا فـەرمان نـادا بەکاری خراپ ، هەم وەك ئەو ئایەتانەی فەرمان ئەدەن بەباوەڕهێنان بەخوا و بێ هاوبەشـی خوا و باوەڕهێنان بەپێغەمەران و بەرۆژی دوایی و هەموو ئەو ئایەتانەی ماناکانیان ئـەزانرێ هەریەکەیان بەسەربەخۆیی خۆیان .

﴿ وأخر متشابهات ﴾ وەهەندێ تر لەئایەتەکانی ئەو نامەیە پێویستیان بەڕوون کردنـەوە هەیە و مەبەست لەماناکان ئاشکرانیە ، بەئاسانی ماناکانیان نازانرێن ، کەسانی دڵ نـەخۆش و مێشك پووچ بەگرانی ماناکانیان بۆ لێك نادرێتەوە سـەرەڕای ئاسـانی ، ئـەو ئایەتانـە وا ئەبێ خاوەن دوو مانان ، بیری ئادەمیزاد زۆربـەیان کۆڵـن لەدەسـت نیشـانکردنی مانـای ڕاستی . وەك مانای ﴿ ونفخنـا فیـها مـن روحنـا ﴾ ئـەو پـەڕی زانسـتی ئێمـە کـە ڕۆح شاراوەیەکی خواییە پەیدا ئەبێ لەئادەمیزادا ، ئەو نهێنیە ڕاستیەکەی ئادەمیزاد نایزانن بگرە زاناکانیش نایزانن .

زانایان بۆ مانای ووشەی ﴿ محکمات ﴾ وە ﴿ مُتَشابِهات ﴾ زۆری لەسـەر ڕۆیشـتوون بەم جۆرەی خوارەوە :

١ – ﴿ محکم ﴾ ئەوەیە مەبەست لەماناکەی بەبێ بەڵگـە دەر ئەکـەوێ ، وەك ﴿ إن الله لا یظلم شیئاً ﴾ بەڕاستی خوا ستەم ناکا هیچ شتێ . ﴿ متشابه ﴾ پێویستی بەبەڵگەیە هەیە بـۆ دیاری کردنی مەبەست لەماناکەی ،وەك ﴿ ثم أسـتوی علـی العـرش ﴾ ووشـەی عـەرش بەمانای کورسی یە ، ئەقڵ ئەو مانایە واز لێ ئەهێنێ ، خوا نــە جێگـە و نـەکاتی بـۆ دابـین ناکرێ ، کەواتە پێویستە مانایەکی بۆ دابـنرێ بگونجێ و شایسـتەی خـوا بـێ ، ئـەوەیش بەتایبەتی زانایانی زۆر زانا ئەیزانن .

٢ – ﴿ محکم ﴾ ئەو ئایەتەیە گوڕەری مانـای ئایـەتی تـر بـێ (النـاسـخ ) وە ﴿ متشـابە ﴾ ئەوەیە مانکەی گۆڕا بێ بەهۆی ئایەتی ترەوە ( المنسوخ ) .

٣- ﴿ محكم ﴾ ئەوەیە یەك مانای هەبێ بەتەنها ، ﴿ متشابه ﴾ ئەوەیە خاوەنی دوو مانا بێ یا زۆر تر ﴿ والمطلقات یتربصن بأنفسهن ثلاثة قروء ﴾ ووشەی (قرء ) بەمانای پاكی ژنان و حەیز و پیسایی هاتووە .

٤- ﴿ محكم ﴾ ئەوەیە ڕستەكانی دوو پات نەكرابێتەوە ، ﴿ متشابه ﴾ ئەوەیە ڕستەكانی دوو پات كرابێتنەوە ، وەك چیرۆكی موسا و فیرعەون .

٥- ﴿ محكم ﴾ ئەوەیە ئەقڵی ئادەمیزاد ڕێگە بەماناكەی ببا ، ﴿ متشابه ﴾ ئەوەیە بەبێ بەڵگەیە ئەقڵی ئادەمیزاد لەتوانایا نەبێ سەر لەماناكەی دەر بكا .

وەمانا لەیەك چووەكان =﴿ متشابه ﴾ كە دژی مانا دەركەوتووەكانە =﴿ محكم ﴾ ئەو جۆرانەی خوارەوەی هەیە :

١- ﴿ متشابه ﴾ ئەو شتەیە ماناكەی بەكەم و كورتی بزانرێ نەك بەشی كراوەیی تەواویی وەك مانای ﴿ ونفخنا فیها من روحنا ﴾ ، مرۆڤ كاتێ ئەیزانێ خۆی بۆ ماندوو بكا ، ئەوەی ڕاستی بێ هەر خوا ئەیزانێ ، بەم نزیكانە لەباسی مانای ﴿ محكم ﴾ دا باسی كرا .

٢- ﴿ متشابه ﴾ ئەوەیە ماناكەی بەڕواڵەت ئەقڵ پەسەندی نەكا ، وەك ﴿ ثم أستوى على العرش ﴾ ئەم باسەیش لەمەوبەر ڕوون كرایەوە .

٣- ﴿ متشابه ﴾ ئەوەیە بەڕواڵەت هەمووئادەمیزاد بگرێتەوە لەفەرمانەكەیا ، وەك مانای ﴿ السارق والسارقة فأقطعوا أیدیها ﴾ پیاوێ دزی كرد و ژنێ دزی كرد ، دوایی دەستیان ببڕن ، كەچی دز لەسالانی گرانیدا و باوكێ دزی لەماڵی كوڕی خۆی بكا دەستی نابڕرێ، یا ئەو شتە دزراوە لەجێگەی شیاوی خۆیدا دانەنرابێ یا كەمترێ لەچواریەكی دیناری ، لەو كاتانەدا دز دەستی نابڕرێ .

٤- ﴿ متشابه ﴾ ئەوەیە فەرمان پێدانەكەی گۆڕرا بێ ، وەك ڕوو كردن لەنوێژ بۆلای بەیتولموقەدەس ، فەرمانپێدانەكەی وا ئەگەیەنێ ڕوو كردن بۆ لای نەگۆڕرێ ، كەچی لەدواییدا بەڵگەی بێ گومان هاتووە بۆ گۆڕانی ڕوانگەی نوێژ بۆ كەعبە .

بۆ مانا زانینی ﴿متشابه﴾ مەرج نیە ماناکەی بەهیچ جۆرێ کەس نەیزانێ ، بگرە هەموو جۆرەکانی ﴿متشابه﴾ جگە لەجۆری یەکەمیان لەوانەیە زانایانی تایبەتی مانای سێ جۆرەکانی تر بزانن .

پوختەی مانای ڕابووردوو ئەمەیە : بەڕاستی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ و زانایانی تایبەتی مانای هەموو قورئانیان زانیوە ، ئەوەتا خوای گەورە ئەفەرموێ : ﴿ هذا بلاغٌ للناس ﴾ یانێ ئەوە ڕاگەیاندنە بۆ ئادەمیزاد ، خوای گەورە فەرمان بەشتێ نادا کەس نەیزانێ لەزۆر جێگەی قورئاندا خوا فەرمانی داوە بەبیر کردنەوە لەمانای قورئان ، ئەو فەرمانە ئەوەمان نیشان ئەدا کە هەندێ لەزانایان ئەتوانن مانای هەموو قورئان بزانن ئەگەر وانەبێ خوا فەرمانی پێ نادا.

بۆ ئەوەی بۆ هەموو ئادەمیزاد ڕوون ببێتەوە بەتایبەتی دوژمنانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام کە دژایەتی لەنێو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا نیە ، ئەم پرسیارانەی خوارەوە لەگەڵ وەڵامەکانیانا ئەنووسین :

پ / خوا لەقورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێ : ﴿ كِتَابٌ أحكمتْ آياتهُ ﴾ نامەیەکە ڕوون کراوەتەوە مانای ئایەتەکانی بەشی کراوەیی . ئەو ڕستەیە وا ئەگەیەنێ هەموو ئایەتەکانی قورئان ﴿ محكم ﴾ بن .

وەڵام / زۆر ڕاستە هەموو قورئان لەداڕژاندن و ڕێك خستن و ماناو ووشە و ڕستەیانەوە ڕوون کراونەتەوە و کاری بەکەس نەکراون .

پ/ لەسورەتی ﴿ الزمر ﴾ دا ئایەتی (٢٣) خوای گەورە ئەفەرموێ : ﴿ الله نزل أحسن الحديث كتاباً متشابهاً ﴾ خوا ناردویەتی شیرینترین گفتوگۆ نامەیە ماناکەی ئاشکرا نین .

وەڵام / بێگومان ئەو نامەیە لەڕەوان بێژی و ڕانمویی کردنی ئادەمیزادا بەجۆرێکی بەکەس نەکراو هەموو ئایەتەکانی بەبێ جیاوازی لەیەك ئەچن و وەك یەك وان .

پ / لەم سورەتەدا خوا ئەفەرموێ : ﴿ منه آيات محكمات وأخر متشابهات ﴾ ئەو ڕستانەی ڕوونی ئەکەنەوە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز هەندێکیان ماناکانیان ئاشکرایە ،

هەندێ تریان ماناکانیان ئاشکرا نین و هەموو کەس لەمەبەستی تەواویان تێ ناگەن ، بەپێچەوانەی ئەو دوو ئایەتە لەهەردوو پرسیارەکاندا باسیان کرا .

وەلاّم / وەك لەمەو بەر زانیمان هەندێ ئایەتەکانی قورئان ماناکانیان هەموو کەس ئەیزانێ بەبێ بەلّگەی دەرەوە ، هەندێ تریان زانایان ماناکانیان ئەزانن بە هۆی بەلّگەی دەرەوە پاش خۆ ماندوو کردن . کەواتە بۆمان دابین کرا دژایەتی لە نێو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدانیە .، بەتایبەتی ئەو سێ ئایەتەی پرسیارەکان .

﴿ فأما الذين في قلوبهم زيغ ﴾ دوایی کەسانێکی ئەو تۆ بەچاو لێ کردنی سەرۆکەکان لەدلّیانا هەیە لادان لەڕاستی.

﴿ فيتبعون ما تشابه منه ﴾ دوای شتێ ئەکەون ماناکانیان ڕوون نیە لە قورئاندا .وێنەی ئەو کەسانە لەو نامەیە هاتوەتە خوارەوە کەقورئانی پیرۆز دەرئەکەوێ لەبارەی ئەو ئایەتانەوە مانایان ئاشکرانیە ، لەو کاتەدا ئەو کەسانە لایان دا و بەگوێرەی بیری خۆیان مانای ئەکەن لەمانای ڕاستی بێ خەوش لای ئەدەن ، بۆ ئەوەی مێشکی ئادەمیزادی سادە و گێلی پێ تێك بدەن . بۆ نمونە ئەلّێن : مانای ﴿ فنفخنا فيه بروحنا ﴾ دوایی فەرمانماندا بەجبرەئیل فوبکا بەنێو مندالّدانی مەریەمەدا بەو گیانەی ئێمە بەخشیومانە بە عیسا ، بەلاّم ئەو کەسانەی دلّیان لای داوە لەڕاستی ماناکەی ئەگۆڕن بەجۆرێ خۆیان ئەیانەوێ ، یانی گیانی خوایە و لەڕەگەزی خوایە ، هەردوکیان خاوەنی یەك گیانن و لەدوو لەشدان ، خۆیان لەمانای ڕوون و بێ پەردەی فەرموودەی خوا گێل و کوێر ئەکەن کە ئەفەرموێ : ﴿ لقد كفر الذين قالوا إنَّ الله هو المسيح أبن مريم ﴾ سورەتی مائیدە ئایەتی (١٦) ، یانی بەڕاستی بێ باوەڕ بوون کەسانێ:ی ئەو تۆ ووتویانە : بەڕاستی خوا هەر ئەوە مەسیحی کوڕی مەریەم .

﴿ ابتغاء الفتنة وابتناء تأويله ﴾ لەبەر داواکردنی ئەوەی کە ئادەمیزاد لابدەن لە ئاینی ئیسلام و چەواشەکردنی گێل و کەم ئەقلّەکان و ، لەبەر ئەو مەبەستەی مانای نامەی خوا

بگۆڕن بەجۆرێ خۆیان ئارەزووی ئەکەن ; بۆ ئەوەی خۆیان و چەند کەسێکی‌تری ئەقڵ پوچ گومان لەدڵیانا بروێ ، هەتا بەئاواتی پوچی خۆیان ڕوناکی ئاینی ئیسلام خامۆش بکەن ، خۆیان هەڵواسن بەمانایەکەوە لەچوار چێوەی ئاینی ڕاستیدا نەمێنن .

﴿ وما يعلم تأويله إلا الله ﴾ وەنازانێ مانای ئەو ئایەتانە ماناکانیان ئاشکرا نین مەگەر خوا خۆی کە نارویەتی‌یە خوارەوە شارەزای ماناکەی بێت .

﴿ والرّاسخون في العلم ﴾ وەئەو زانایانەیش جێگەی خۆیانیان دابین کردووە لە زانینا ئەوانیش مانای ئەو ئایەتانەی مانایان ڕوون نیە ئەیزانن .

﴿ يقولون آمنا به ﴾ ئەو زانایانە ئەڵێن : ئێمە باوەڕمان هێناوە بە قورئان و بەو ئایەتانە مانایان ڕوون نیە لای زۆر کەس و ئێمە بەگوێرەی زانستی خۆمان ماناکانیان لامان ئاشکرایە .

زانایان هەندێکیان ئەڵێن:ڕستەی ﴿ والرّاسخون في العلم ﴾ پەیوەستە بەووشەی ﴿ الله ﴾ کەواتە ماناکەی بەم جۆرەیە : مانای ئەو ئایەتانە کەس نایزانێ مەگەر خوا و ئەو زانایانە بەهۆی بیری پاك و تیژی خۆیانەوە ماناکەی ئەزانن.

هەندێ تر لەزانایان ئەڵێن : ئەو ڕستەیە پەیوەندی بەپێشەوەی خۆی نیە و ڕستەیەکی سەر بەخۆیە ، ماناکەیشی بەم جۆرەیە : وەئەو زانایانە کەلەزانستا چوونەتە قووڵایی زانین ئەڵێن : ئێمە بڕوامان بەو ئایەتانە هێناوە هەرچەندە مانایان نازانین .

﴿ كل من عند ربنا ﴾ هەموو یەکێ لەئایەتە مانا ڕوونەکان و ئایەتە مانا ڕوون نەکراوەکان و ئەوانەیان ئێمە ماناکانیان ئەزانین و ئەوانەی ئێمە ماناکانیان نازانین لەلایەن پەروەردەکەری ئێمەوەن و دژایەتی لەنێوانیانا نیە ، بۆیە پێویستە ئێمە بڕوامان بەهەمویان بێ .

﴿ وما يذكر إلا أولوا الألباب ﴾ وەئامۆژگاری وەرناگرن بەئایەتەکانی قورئان مەگەر کەسانێ خاوەن ئەقڵن و لەو زانایانەن لەزانستا دامەزراون ، مانای هەموو ئایەتەکان ئەزانن

پاش بیرکردنەوە ، نایکەن بەجێگەی گومان و بیانوو بۆ گومڕاکردنی کەسانی ساویلکە ، وەك ئەو کەسانەی تانە ئەدەن لەئاینی ئیسلام .

پ / لەبەر چ شتێ خوای گەورە هەندێ لەئایەتەکانی قورئانی ناردوەتە خوارەوە بەجۆرێ هەموو کەس ماناکانیان ئەزانێ ، هەندێ تریان جگە لەزانایانی بیر تیژ کەسی تر نایانزانێ ؟

وەڵام / قورئان کە هاتوەتە خوارەوە ڕوی فەرمانەکانی ئەکاتە زانایان و نەزانان ، زیرەك و تەمەڵ ، هەروەها هەندێ مەبەست هەن ئادەمیزاد دەقیان گرتوە بەزانینیانەوە و لەگەڵیان ئاشنان پێویستیان بەپرس و خوێندن نیە بۆ یەکەمجار ، هەندێ تریان مانای ڕەستەکانیان گرانن و قوڵن ، بۆ زانینیان پێویستیان بەگەڕان و خوێندن و پرس هەیە جگە لەخاوەن دانش کەس مانایان نازانێ ، بۆ ئەوەی هیچ کەس بێ بەش نەبێ لە قورئان خوای گەورە بەو شێوەیە نامەی خۆی ناردوەتە خوارەوە .

﴿ ربنا لا تزغ قلوبنا ﴾ ئەی پەروەردەکەری ئێمە تۆ دڵی ئێمە لا مەدە لەئاینی ڕاستەوە بۆ لای گومڕایی و پەیڕەوی مانایە تۆپەسەندی فەرمووی .

﴿ بعد إذ هديتنا ﴾ دوای ئەو کاتەی تۆ ڕانموویی ئێمەتان کردوە بۆ لای ئەوە باوەڕمان هێناوە بە هەموو ئایەتەکان لەوانەی مانایان ئاشکران و ئەوانە هەمووکەس نایزانێ ماناکانیان .

﴿ وهب لنا من لدنك رحمة ﴾ وەتۆ ببەخشە بەئێمە لەلایەن خۆتەوە یاریدان و ڕاوەستانمان لەسەر باوەڕهێنان و ڕاستی .

﴿ إنك أنت الوهاب ﴾ بەڕاستی هەر تۆ خاوەن بەخشندەیی و هیچ شتێکت ناوێ هەرکەسێ بەگوێرەی شایستەی خۆی پاداشتی ئەدەیتەوە .

﴿ ربنا إنك جامع الناس ليوم لا ريب فيه ﴾ ئەی پەروەردەکەری ئێمە بەڕاستی تۆ هەموو ئادەمیزاد کۆئەکەیتەوە لەرۆژێکا گومان لەو ڕۆژەدا نیە هاتنی بۆ پرسیار و وەرگرتنی پاداشت و تۆڵە .

﴿ إن الله لا يخلف الميعاد ﴾ بەڕاستی خـوا لا نـادا لەبـەڵێن دان کـە زینـدو ئەکاتـەوە بونەوەران دوای مردنیان و ناردنی هەریەکەیان بۆ جێگـەی شـایانی خۆیـان لەبەهەشـت و لەدۆزەخ .

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَن تُغْنِىَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ وَقُودُ ٱلنَّارِ ﴿١٠﴾ كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿١١﴾ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٢﴾ قَدْ كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ فِى فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَا ۖ فِئَةٌ تُقَٰتِلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْىَ ٱلْعَيْنِ ۚ وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِۦ مَن يَشَآءُ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُو۟لِى ٱلْأَبْصَٰرِ ﴿١٣﴾

ئەو کەسەی لەمانای ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز وورد بێتەوە بۆی دەرئەکەوێ کاتێ خـوا باسی خاوەن سامان و خاوەن دارایی‌یەکان ئەکا بەئەوپەڕی خراپەوە باسیان ئەکا ، بەچـەند

شتێکی نا پەسەند ناویان ئەبا ، ناویان ئەبا بەیاخی و خۆ هەڵکێش و دەمار زل و چاو چنۆك و تێر نەخۆر ، وائەزانن ئەو سامانەی هەیانە لەنەگبەتی هەردوو جیهان ئەیانپارێزێ ، بەچاوی خۆیان زۆر جار دیویانە لەکاتی ڕووداوی ئەمڕۆدا سامان ناگاتە فریایان ، ئەوەتا خوای گەورە ئەفەرموێ :

﴿ إن الذين كفروا ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە لەگاور و جولەکەکان و بت پەرستان کەسەرزەنشتی پێغەمەریان ئەکرد کە هەژارە و خاوەنی دارایی و منالّ نیە ، خۆیانیان بەمنالّ وسامانەوە هەڵئەکێشا .

﴿ لن تغني عنهم أموالهم ولا أولادهم ﴾ ناگاتە فریای ئەو کەسانە داراییەکانیان و منالّەکانیان کە پێیانەوە ئەنازن و خۆیانیان بەوانەوە هەڵئەکێشا .

﴿ مِنَ الله شيئاً ﴾ لەسزای خوا هیچ شتێ لەهەردوو جیهاندا لەپاشە ڕۆژدا ، ئەبنە هۆی شەرمەزاریان ، بەتایبەتی لەدوارۆژدا کەڕەوانەی لای دۆزەخیان ئەکەن .

﴿ أولئك هم وقود النار ﴾ وەئەو تاقمانە هەر ئەوانەن ئەبنە سوتەمەنی ئاگری دۆزەخ و گڕ سەندنی ، وێنەی نەوت و درەخت و شتی تر ، ئەو خاوەن بیرە پوچانە وایان ئەزانی سامان و منالّەکانیان ئەیانپارێزن لەڕووداوی ئەوّم ڕۆژە هەتا ڕوو بەڕوو چاو بەچاو لە پانایی جەنگدا ئەوەستن ، ئەو کاتە بۆیان دەرئەکەوێ سامان ومنالّەکانیان دیار نین لەئەنجامدا هەستیان بە لاوازی و بۆڕدانی خۆیان کرد .

هەروەها مێژوو خراپەی گەورەتری نەدیوە لەخراپەی خاوەن دارایی و سامان کۆکراوەکانی ئەم سەردەمەی ئێمە، بەڕاستی ئەو کاربەدەستانەی ڕۆژ ئاوا و ڕۆژ هەلاّت کە ناخۆشی و جەنگ ئەڕەخسێنن ، فێلّ و فڕوداوی ناهەموار ئەخەنە کار لەدژی هەموو جولاّنەوەیەکی سەربەستی و سەربەخۆیی لەهەموو لایەکەوە کە ئادەمیزاد بەرپای ئەکا ، بۆیە ئەو ستەمکارانە پۆل پۆل بەکرێ گیراوی خۆیان و پاپۆڕی جەنگی و سیخوڕی خۆیان بەهەموو جێگەیەکا پرژ و بلاّو ئەکەنەوە بۆ ئەوەی دانیشتوانی سەر زەوی بکەن بە ژێر دەستەی خۆیان ، بازاڕی چەوسانەوە بخەنە کار بۆ سوودی ملیۆنەرەکان ، ئەو کەسانە

نەبڕوایان بەخوا و نەبەمرۆڤایەتی و نەبەهیچ شتێ هەیە جگە لە قـازانج و سـوودی تایبـەتی خۆیان ، نایەڵن گەلانی ئاشتی خواز بۆ خۆیان بژین ، نان و سامانی بەئارەق پەیدا کـراوی خۆیان بخۆن و ناموسی خۆیان بپارێزن ، پاشەڕۆژی خۆشی بۆ خۆیان دروست بکەن . ئـەو خوێن مژانە ستەمکاری خۆیان ئەخەنە کار بۆ ترساندن و بۆ لاوازی ئـابووری و ڕامیـاری گەلانی بێ دەستەڵات ، هەموو هێز و توانای پیسی خۆیان ئەخەنە گـەڕ بـۆ پارچـە پارچـە کردنی نیشتمانیان و یەکێتی نیشتمانیان ، هەتا هەموویان سەریان بۆ شۆڕبکەن بۆ ڕوتانـەوە و خوێن مژینیان ، بۆیە خوای گەورە قەدەغـەی کـردووە لەموسـوڵمانان سـامانی خۆیـان بشارنەوە و دارایی زۆر پێکەوەنان بەڕێگەی ناڕەوا ، هانیان ئـەدا بـۆ یـەکێتی و یـاریدەی یەکتری بەسامان و دارایی لەدژی دوژمنانی ئاینیان ، قەدەغەی کردوە هێز سەپاندن بەسـەر هەژارانی خۆیانا ، هەڕەشەی کردووە لەو کەسانەی دارایی خۆیـان ئەشـارنەوە و بـەکاری ناهێنن لەڕێگەی خوادا ، خوا ئـەو کەسـانەی نـاوبردووە بـەیاخی و بەسـتەمکار ، داب و نەریتی ئەو جوولـەکە و گاورو بت پەرسـتانە ئەیانـەوێ بـەملی شـکاوی خۆیـان پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ بەدرۆ بخەنەوە .

﴿ کـدأب آل فرعـون ﴾ ڕەوشـتی ئـەو بـێ باوەڕانـە وێنـەی ڕەوشـتی پـــەیڕەوان و پیاوماقوڵانی فیرعەونە لەبەدرۆ خستنەوەی پێغەمەرەکانیان ، ئەوانیش سامان و منالـەکانیان نەگەیشتنە فریایان لەهەردوو جیهاندا .

﴿ والذین من قبلهم ﴾ وەوێنەی ڕەوشتی کەسانێکی ئەوتۆ بـوون لـەپێش فیرعەونـەوە بوون وێنەی گەلی عـــاد و سەموود و جگەی ئەوانیش .

﴿ کذبوا بآیاتنا ﴾ بەدرۆیان خســتەوە پێغەمــەرەکانیان و باوەڕیـان بەئایـەتی نامـەکانی ئێمەیان نەهێنا کاتێ پێغەمەرەکانیان چوون بۆ لایان .

﴿ فأخذهم الله بذنوبهم ﴾ دوایـی خـوا سـزای ئـەوانی دا بـە هـۆی گوناهەکانیانـەوە لەبەدرۆ خستنەوەی پێغەمەرەکانیان و بێ باوەڕیانەوە ، لەناوی بردن بەکارەساتی ناهەموار.

لەمانای ئەو ئایەتانەوە بۆمان دەرکەت دارایی و سامان و منالْ نابنە هـۆی بـەختیاری و سەرکەوتن و ڕزگاری ، بگرە زۆر جاران هەژاران سەرکەوتوون بەسەر خاوەن سـاماندا ،

تاقمێکی کەم بەسەر تاقمێکی زۆردا ، مێژوو پڕە لەو بەڵگـە ڕاستیانە . بیـنراوە فیرعـەون گەلەکەی بەو دەسەڵات و دارایی و چەك و لەشکرە زۆرەی هەیان بوو ، بەرانبەر بە موسا و گەلەکەی ژێر کەوتن و ڕسوا بوون ، ئەوان بەبێ چەك و بەژمارەی کەمەوە سەرکەوتن، بەر لەوان نوح و گەلەکەی سەر کەوتن ، ئیبراهیم سـەرکەوت بەسـەر نـەمروزا ، سـاڵح بەسەر سەمودا .

﴿ والله شديد العقاب ﴾ وەخوا سزای زۆر سەخت و گرانـە بـۆ بـێ بـاوەڕان لەپاشـە ڕۆژدا .

کەوا بوو ژمارە و سامان و منالّی زۆر ، زۆر جاران مسۆگەر نین بۆ سەرکەوتن و نابنە فریاڕەس ، بگرە ئەبنە هۆی ڕسوایی .

بێگومان پاشەڕۆژی موحەمەد ﴿ﷺ﴾ و باوەڕدارانیش سەرکەوتنە ، پاشـەڕۆژی ئەوانـە موحەمەد ﴿ﷺ﴾ بەدرۆ ئەخەنەوە هەروەك ئەوانەی پێشوو ڕسوایی و لەناو چوونە .

بەمەرجێ قورئان بکەین بەیاسا بۆ خۆمـان و واز لەڕەگـەز پەرسـت و بێگانـە پەرسـتن بهێنین ، پاشە ڕۆژی ئێمەیش سەرکەوتنە بەسەر دوژمنانی ئەمرۆماندا .

لەو کاتـەدا پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ سـەرکەوت بەسـەر قورەیشـیەکاندا لەجـەنگی بـەدردا و گەڕایەوە بۆ مەدینە جولەکەکانی لـەبازاڕی بـەنی قـەیناعا کۆکـردەوە و فـەرموی : ئـەی گروپی جولەکە ئێوە لەخوا بترسن بەبۆنەی ئەو نەگبەتییەوە تووشـی قوڕەیشـیەکان بـوە لەڕۆژی بەدردا ، موسوڵمان بن بەر لەوەی وەك ئەوانتان بەسەر بێ ، بەڕاستی ئێوە ئەزانن مـن فرۆسـتادەی خـوام ، وەك لەنامەکـەتانا نوسـراوە ، جوولـەکـەکان ووتیـان : ئـەی موحەمەد: تۆ لەگەڵ کۆمەڵێ بەرانبەر بووی لەجەنگدا بێ تەجرەبە و ناشـارەزان لەهونـەر و چۆنێتی جەنگ ، بۆت لواوە بەرێکەوت بەسەریانا زاڵ بـووی ، ئەگـەر ئێمـە جـەنگت لەگەڵ بکەین ، ئەو کاتە بۆت دەرئەکـەوێ هـەر ئێمـە پیـاوی ئـەو کـارەین ، بۆیـە خـوا فەرموی :

﴿ قل للذين كفروا ستغلبون ﴾ موحەمەد تۆ بڵێ بەو کەسانەی ئەو تۆ باوەڕیان نەهێناوە لەو جولەکانە تانەت لێ ئەدەن : لەمەو پاش بەم نزیکە موسوڵمانان سەرئەکەون بە سەر ئێوەدا و ئێوە ژێر ئەکەون . ئەو فەرمودەی خوایە هاتەدی ، موسوڵمانان هۆزی قورەیزەیان کوشت و بەدیلیان گرتن ، بەنی نەزیر و دووڕووەکانیان دەربەدەر کرد ، سەرانەیان لەسەر جولەکەکانی تر پێویستکرد .

﴿ وتحشرون إلى جهنم وبئس المهاد ﴾ وەئێوەی بێ باوەڕ کۆئەکرێنەوە لەڕۆژی دواییدا و ڕاپێچ ئەکرێن بۆ لای دۆزەخ ، وەخراپ ژێرە خەرێکە دۆزەخ ئێوە پاڵ و پشتی تێدا ئەکەن .

﴿ فقد كان لكم آية في فئتين ألتقتا ﴾ بەڕاستی بۆ باوەڕداران و بێ باوەڕان هەبوو نیشانەیە لەسەر پێغەمەرایەتی موحەمەد لەڕووداوی ئەو دوو تاقمە گەیشتن بەیەك و هەڵگژان بەیەكدا لەڕۆژی بەدردا کە تاقمەکانی قورەیش شکان و بەر لەجەنگ خۆیان هەڵئەکێشا ئێوەی جولەکەیش خۆتان هەڵئەکێشن چاوەڕوانی پاشەڕۆژی نەمانی خۆتان بکەن .

﴿ فئة تقاتل في سبيل الله ﴾ تاقمێکیان جەنگ ئەکەن و خۆیان ماندوو ئەکەن لەڕێگەی ئاینی خوادا و بۆ سەرکەوتنی ئیسلام ، ئەو تاقمە بریتی بوون لەپێغەمەر ﴿ﷺ﴾ و هاوڕێکانی بە ژمارەیەکی کەم و بێ چەك کە ژمارەیان (٣١٣) کەس بوون ، (٧٧) کەسیان کۆچ کەران و (٣٦) کەسیان یاریدەدەرانی مەدینە بوون ، بەیداخ هەڵگری کۆچ کەران عەلی کوڕی ئەبوتالیب بەیداخ هەڵگری یاریدەدەران سەعدی کوڕی عوبادە .

﴿ وأخرى كافرة يرونهم مثليهم ﴾ وەتاقمێ تریان بێ باوەڕبوون بەخواو بەپێغەمەر بەسەرۆکایەتی ئەبوجەهل ژمارەیان (٩٥٠) کەسبوون ، بت پەرستان موسوڵمانەکانیان بەدوو ئەوەندە خۆیانیان ئەبینی بەنزیکەی دوو هەزار کەس ، بەو بۆنەوە ترسی زۆریان لە موسوڵمانان پەیدا کردبوو بەو بۆنەوە بیمیان لێ ئەکردن . بەجۆرێ تر مانای ئەو ڕستەیە

ئەکرێ : موسوڵمانان بت پەرستەکانیان بەدوو ئەندازەی خۆیانیـان ئـەبینین ، بۆیـە لـەوان نەئەترسان لەدڵی خۆیانا ئەیان ووت دیارە کەمن . کەچی لـەناوەڕۆکا بـێ بـاوەڕان سـێ ئەوەندەی باوەڕ داران بوون ، ئەوەیش لەمیهرەبانی خواوە بوو ، هەر چۆنێ بێ مەبەستەکە ناگۆڕێ .

﴿ رأى العين ﴾ بەدوو ئەوەندەی خۆیانیان ئەزانین بەبینینی چاو و بەگوێرەی ڕووالـەت نەك لەڕاستیدا .

﴿ والله يؤيد بنصره من يشاء ﴾ وەخوا بەهێز ئەکا بەهۆی یاریدانی خۆیەوە هەرکەسـێ ئارەزوی هەبێ با چەك و ژمارەیشی کەمبێ ، وەك باوەڕداران .

﴿ إن في ذلك لعبرة لأولي الأنصار ﴾ بەڕاسـتی هەیـە لەکـەم کردنـەوە و زۆرکـردن ، لەسەرکەوتنی تاقمێکی کەم بەسەر تاقمێکی زۆردا تەمێ کـردن و ئامۆژگـاری کـردن بـۆ کەسانێ خاوەنی ئەقڵبن و دڵیان ڕونبێ .

خوای گەورە بەو ئایەتەی پێشوو ئامۆژگاری باوەڕداران و بێ بـاوڕان ئـەکا بەمـەرجێ ژێر بن بەڕوداوی جەنگی بەدر ، چۆن تاقمی خوا بەسەرۆکایەتی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ زاڵبـوون بە سەر پارتی شەیتانا کەچی موسوڵمانان جگە لەدوو ئەسپ و حەوت زرێ و دوو شمشێر خاوەنی چەکی تر نەبوون ، ژمارەیشیان زۆر کەمبوون ، هەر چوار کەسـیان هوشـترێکیان پێ بوو ، بێ باوەڕان زۆر زۆر بـوون ، چـەك و ئازووخـەی زۆر تـەواویان هـەبوو ، ئـەو ڕووداوەی نێوان موسوڵمانان و بت پەرستان گەورەترین پەندە بۆ ئادەمیزاد .

هەموو کاتێ موسوڵمانان خاوەنی باوەڕی بەهێز بن ، بەبێ جیاوازی هـەروەك ئەوانـەی پێغەمەر ئەبن ، قورئان بکەن بەیاسای خۆیان بێگومان زاڵ ئەبن بەسەر دوژمنـانی خۆیانـا ، لەم سەردەمەیشدا باوەکو دوژمنان بۆنبای نیترۆن و فرۆکە و چەکی ڕوخێنەری زۆر بـن ، ئێمەی موسوڵمانانیش ئەتوانین ئەگەر خاوەنی باوەڕی بەهێز بین زێـری ڕەش و کەرەسـەی خاو بین ، خۆیشمان چەکدار بکەین بەیەکێتی نیشـتمان و نیشـتمان پـەروەری ، بێگومـان

سەر ئەکەوین و زاڵ ئەبین بەسەر دوژمنانی خوادا و مرۆڤایەتی ئەمڕۆ ، خۆمان ئەکەین بەخاوەنی سامانی خۆمان و ڕزگارمان ئەبێ لەدەستی کۆیلەیی و خۆ بەکرێ گیراوی خوێن مژانی ڕۆژ هەلآت و ڕۆژ ئاوای چاوچنۆك .

خوای گەورە کە باسی جەنگ و خۆ ماندوو کردنی بۆ کردین بۆ بەرزی ئیسلام ، لەوانەیە لەکاتی دەست کردن بەجەنگ و زۆریش نزیکە جەنگاوەران هەندێکیان بەگوێرەی سروشت دەست بکەن بە تالآنی کردن و بەدیل گرتنی ژنان و چارە وێی و پول و پارە و دارایی و شتی تر ، بۆیە خوای گەورە فەرمان ئەدا بەواز هێنان لەڕابواردنی ئەمڕۆی بڕاوەی جیهان ، لای خوایە پاداشتی نەبڕاوە و بەردەوام ، بۆیە پێویستە جەنگاوەران و خۆ ماندوو کەرانی موسوڵمانان مەبەستیان بەرز کردنەوەی ئالآی ئیسلام بێ و داوای پاداشتی خوا بکەون ، مەبەستیان کالآی ئەمڕۆ و ڕابواردن و ژن و چارەویی و دارایی و ماشێن و کۆشك نەبێ لەجیهاندا ، بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێ :

زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ ﴿١٤﴾

﴿ زين للناس حب الشهوات ﴾ ڕازێنراوەتەوە و جوانکراوە بۆ ئادەمیزاد خۆشەویستی و دۆستایەتی ئارەزووەکانیان کە زۆریان پێ خۆشن و هەست بەبەختیاری ئەکەن کە بۆیان پەیدا ببێ ، خوای گەورە خۆشەویستی ئارەزووەکانی جیهانی لەدەرونی ئادەمیزادا

بەگوێرەی سروشت پەیدا کردۆوە هەتا نەوەکانیان پەرە بسێنن و بەخۆشی بژین لەم سەر زەوییەدا . بەڵام شەیتان خراپە ئەبزوێنێ لەدەرونا بۆ ئەوەی کاری خراپەیان پێ بکەن .

﴿ من النساء ﴾ ئارەزوەکان لەژنان کە خۆشەویستی ئەوان لەدەروونی پیاواندا ڕواوە لەهەموو شتێ زۆرتر هەروەها خۆشەویستی پیاوانیش لەدەروونی ژناندا گەشەی سەندووە لەبەر مانەوەی ڕەگەزی ئادەمیزاد ، کەواتە ژنان گەورەترین داوی شەیتانە بۆ نێچیر کردنی پیاوان ، بۆیە پێویستە پیاوان زۆر وریای خۆیان بن لەکاتی خۆشەویستی ژنان دا .

﴿ والبنین ﴾ وە لە کوڕان کە ئەوانیش خۆشەویستن بەگوێرەی سروشت بۆ باوك و دایك لەبەر ئەوەی کە کوڕان ئەبنە هۆی ڕەگەزی باوکیان و یاریدەیان ئەدەن لە ئیش و کاردا و ئەبنە جێگەنشینیان .

﴿ والقناطیر المقنطرة ﴾ وەلەدارایی زۆری کۆکراوەی لای خۆی و جۆراوجۆر ، ئەو سامانە زۆرەیش :

﴿ من الذهب والفضة ﴾ لەزێڕ و زیو ، ، خۆشەویستی ئەو دوو شتانە لەبەر ئەوەیە ئەبنە نرخی هەموو شتێ ، هەرکەسێ ئەوانەی هەبێ ، وەك خاوەنی هەموو شتێ بێ وایە .

﴿ والخیل المسوّمة ﴾ وەلەچاوەڕێی جوانی نیشانەدار کراو ، یا لە چارەوێی نێو چاوان سپی و چوار پەل سپی . لەم سەردەمەی ئێمەدا چارەوێی باسی نەماوە ، باس باسی ماشێن و فڕۆکە و شتی تری تازە بابەتە .

﴿ والأنعام ﴾ وە لە چوار پیکانی تر لەگا و بزن و مەڕ و هوشتر ، بەڕاستی ئەوانە بۆ پەیدا کردنی ئابووری زۆر بەسوودن .

﴿ والحرث ﴾ وەلەکشت و کاڵ و چێنراوەکانی سەر زەوی لەهەموو دانەوێڵە و سەوزە.

﴿ ذلك متاع الحیاة الدنیا ﴾ ئەو شتانەی باسکران و ناویان بران ڕابوردنی ژیانی جیهانن و خاوەنی سوودن بۆ ئادەمیزاد ، ئەڕۆن و بەردەوام نین .

﴿ والله عنده حسن المآب ﴾ وەخوا لەلایەتی خۆشی و شیرینی گەڕانەوە بۆ لای لە پاشەڕۆژدا ، کۆتایی پێ نایە و مانەوەی بەردەوامە .

بۆ زانین : خۆشەویستی ژنان و کوڕان و دارایی خۆیان لەخۆیانا خراپ نین .شیرین و بەتامن و بێزیان لێ ناکرێ ، خوای گەورە هەرگیز قەدەغەی نەکردوون ، بگرە خوا ئەفەرموێ بۆتانم پاك و ڕەوا کردوون ، بەو مەرجەی بەکار بهێنرێن بەگوێرەی دەستور و سنووری دیاری کراو بۆیان . خۆشەویستی ژنان و کوڕان و دارایی هەموو سەردەمێ ئەگرێتەوە . بەڵام خۆشەویستی چارەویی و چوارپێ بۆ هەموو سەردەمێ نین ، ئێستا باوی خۆشەویستی شتی ترە ، بەڵام چوار پێ بوونیان بۆ ئادەمیزاد پێویستە ئەوەی گرنگە و بۆ ئێمە دەرئەکەوێ لەدارڕژاندنی ئەو ئایەتە پیرۆزە ئەمەیە:

خۆشی ڕۆژی دوایی نەگۆڕینەوە بەم خۆشیەی ئەمڕۆ هەن و ئەبڕێتەوە .

ئەو شەش شتانەی باسیان کرا هەندێکیان هەر بۆ سوودی خۆی و خۆمان بەکار دێ ، هەندێ تریان بۆ سەوودی خۆمان و هەموو ئادەمیزاد بەکار دێن ، بەتایبەتی بۆ دەست گیرۆیی هەژاران و لەڕێگەی ئایینی خوا و بەرزی ئیسلام.

هەندێ کەسانی بیر تەسك وائەزانن بەختیاری و خۆشی شتان : لەش ساغی ، ژنی جوانی ڕێك و پێك ، دارایی زۆر زۆر بەگوێرەی ویستی خۆیان ، پلە و پایەی ئەوان بنە هۆی مانەوەی ڕێز ، ئەو خاوەن بیر تەسکانە جگە لەبەختیاری خۆیان بیر لەبەختیاری کەسی تر ناکەنەوە ، ئەوانە خۆ پەرست و بێ بەزەیین ، ئەگەر بەژیرانە و بە بیری فراوانی مرۆڤایەتی بیریان بکردایەوە هەستیان بەگیرو گرفتی داماوی هەموو دانیشتوانی سەرزەوی ئەکردەوە ، ئەی بۆ ئەبێ لەخوا نەترسن و بێ ئاگابن لە ئێش و ئازاری ئادەمیزادانی تر ؟ ئەی بۆ بیر لەپاشەڕۆژی سامناك وئاوارەیی و چەوسانەوەیی و کوشتن و بڕین و دەربەدەری و ڕوتاڵی و برسێتی ئەوان ناکەنەوە وەك ئەوکەسانە هەستی ئایین و مرۆڤایەتیان لێ شۆرابێتەوە ، هەروایشە . پێویستە ئەو کەسانە هەست بکەن بەختیاری نەبۆئەوان و نەبۆ

هیچ کەس نەلواوە لەهەموو ڕوێکەوە ، بەچاوی خۆمان دیومانە هەتا سەر کەس بەخۆشـــی نەژیاوە بگرە لەسەر سامانی زۆری دەرکراوە ، لەم سەر زەوی‌یەدا خۆی بۆ نەگیراوەتەوە، کەوایە بەر لەوەی ئەوان تووشی ئەو ڕۆژە بن با کارێ بۆ خۆیان بسازێنن ، بەڕو کردنیان بۆ لای داد پەروەری و بیرکردنەوەیان لەژیانی دانیشتوانی سەر زەوی .

کاتێ خوای گەورە باسی ڕابواردنی بـڕاوەی ئـەمڕۆی بـۆ کردیـن لەئایـەتی پێشـوودا بەهۆی ئەو شەش شتانەوە ، فـەرموی : سـوودەکانی پاشـەڕۆژ زۆر چاکـترە لـەوان ، بـۆ ئەوەی لەو باسە باش تر بگەین کە پاداشتی لای خوا شیرینترە لەڕابواردن و ژیانی ئەمڕۆ ، خوا ئەفەرموێ :

قُلْ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيْرٍ مِّن ذَٰلِكُمْ ۚ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ ﴿١٥﴾ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا إِنَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ﴿١٦﴾ الصَّابِرِينَ وَالصَّادِقِينَ وَالْقَانِتِينَ وَالْمُنفِقِينَ وَالْمُسْتَغْفِرِينَ بِالْأَسْحَارِ ﴿١٧﴾

﴿ قل أؤنبكم بخير من ذلكم ﴾ موحەمەد تۆ بلێ بەو کەسانە بۆیان ڕازێنراوەتەوە ئەو شەش شتانە باسکران لەئایەتی پێشودا ، ئایا من هەواڵ بدەم بەئێوە بەچاکتر لەو شتانە خۆشتان ئەوێن بۆ ڕابواردنتان و گوزەرانتان ، یانێ ئادەمیزاد پاش گەڕانەوەیان بۆ لای پەروەردگاری خۆیان دەستیان ئەکەوێ چاکتر لەژنان و دارایی و هەموو ئەوانەی لەئەمڕۆدا هەن ، بەمەرجێ خاوەن باوەڕبن بەئاینی ئیسلام . کەواتە ئەم ئایەتە درێژە و شی کردنەوەی کورتەی مانای ئایەتی پێشوە .

﴿ للذين أتقوا عند ربهم جناتٌ ﴾ بۆ کەسانێکی ئەوتۆ هەیە لەخوا ئەترسن و خۆیان ئەپارێزن لەبت پەرستی و لەبێ باوەڕی و داوێن پیسی و کاری ناڕەوا چەندین باخ و بێستانی پڕ لەمیوە کە لەهەموو جیهان و لەو هەموو شتانە لەواداان چاکترە لەکشت و کاڵ و چارەوێ و چوارپێ و دارایی بێ بەردەوامی ئەمڕۆ .

﴿ تجري من تحتها الأنهار خالدين فيها ﴾ ئەڕوا بەژێر درەخت و ئەم لا و لای کۆشکەکانی ئەو بەهەشت و بێستانەدا چەندین ڕووباری ئاوی شیرین و بێ خەوش ، بەردەوامن لەناو ئەو بەهەشتانەدا و نامرن و تەمەن کورت نین.

﴿ وأزواج مطهرة ﴾وەبۆیان هەیە چەندین ژن وهاوسەری پاك کراوە لەحەیز و لەلەش پیسی و هەموو شتێ تری قێزەوەن و بێز لێ کراوەی وا کە لەئادەمیزادا هەن ، وائەبێ خوا لەبەهەشتا بۆیان دروست ئەکا بەشیرینی و بەڕەوشت پاکی .

﴿ ورضوان من الله ﴾ وەبۆیان هەیە خۆشەویستی‌یە لەلایەن خواوە لەبەهەشتا بە هەموو ڕابواردنێکەوە ، ئەو سێ شتانە بۆ کەسی تر نابن جگە لەو کەسانەی لە خوا ئەترسن .

﴿ والله بصير بالعباد ﴾ وەخوا ئەزانێ بەکرداری بەندەکانی خۆی و بەو کەسانەی لەخوا ترساون ، بۆیە ئەو بەهەشتانەی بۆ ئامادە کردوون .

﴿ الذين يقولون ربّنا آمنا ﴾ ئەو لەخوا ترسانە کەسانێکی ئەوتۆن کە جێگەیان بەهەشتە، لەڕوی نازەوە ئەڵێن :ئەی پەروەردەکەری ئێمە باوەڕمان هێنا بەفەرمانەکانی تۆ و بەفروستادەت .

﴿ فأغفر لنا ذنوبنا وقنا عذاب النار ﴾ دوایی لەئێمە خۆش بە و گوناهەکانمان بشۆرەوە ، خامەی میهرەبانی بدە بەسەرمانا و بمانپارێزە لەسزای ئاگری دۆزەخ لەپاشە ڕۆژدا و لەکاتی زیندوو بونەوەماندا .

﴿ الصابرين ﴾ مەبەست لەو خوا ترسانەکە کەسانێکن ئارام ئەگرن لەسەر بەجێ هێنانی فەرمانە پێویستەکان ، خۆ پارێزن لەکارە قەدەغە کراوەکان لەکاتی خۆشی و ناخۆشیدا ، لەکاتی گرانی و جەنگدا ، خەباتی بێ وچان ئەکەن و پشت بەخوا ئەبەستن ، خۆش حاڵن بە بەرهەمی خەباتی خۆیان ، خۆڕاگرن لەسەر گیروگرفتی جیهان .

﴿ والصادقين ﴾ وەڕاست گۆن لەباوەڕهێنانیانا ، نیاز پاك و زمانیان پاك و خاوێنە لە پەنهانی و لە ئاشکرادا ، هەرگیز درۆناکەن تووشی زیان بن یا تووشی سوود و چاکە بن.

﴿ والقانتين ﴾ وەخوا پەرست و باوەڕدارن ، بەردەوامن لەسەر کردنی کاری چاکە .

﴿ والمنفقين ﴾ وەکەسانێکن ئەبەخشن دارایی خۆیان بۆ خۆیان و بۆ خێزانیان و خزم و هەژاران ، ئیتر پێویست کرابێ لەسەریان یان نە ؟ لەڕێگەی ئاینی خوادا سامانی خۆیان بڵاوئەکەنەوە .

﴿ والمستغفرين بالأسحار ﴾ وەداوای لێ خۆش بون ئەکەن لەخوا ، ئەپاڕێنەوە لەخوا لەکاتی نوێژی بەیانیان و ئێوارانداکە ئەو کاتانە شیاو ترین کاتن بۆ پاڕانەوە و پەرستن دوورن لەبەر چاوان و خۆ نواندن ، هەموو کەس لەو کاتانەدا خەوتوون ، دۆست بەخەبەر و ئاگادارە ، کاتی ڕاز و نیازی دۆستانە .

وەئەو پێنج ڕەوشتانە : ئارام گرتن ، ڕاست گۆیی ، پەرستنی خوا ، بەخشندەیی ، داوای لێ خۆشبوون ، بەر هەموو ئەنجامی سێ پایە و بنچینەی باوەڕن : باوەڕ بەتاکی و بەتەنهایی خوا ، باوەڕ بەپێغەمەران ، باوەڕ بەڕۆژی دوایی ، ئەو سێ پایانە هەر بەتەنها دروشمی ئاین نین و بەس کە موسوڵمانان بەرزی کەنەوە بەبێ کردەوە.

بەڵکو پێویستە لەگەڵ ئەو باوەڕەدا خاوەنی بەرهەم و کاری زۆر بن کە ڕەوشتی چاك و کردەوەی ڕاست کۆیان ئەکاتەوە ، لەو کردەوە چاکانەیە ئەو پێنج نوێژە بەنرخانە ،

ئەوانە لەلایەکەوە ، لەلایەکی ترەوە پێویستە کاری چاکە و پەرستن لە هەموو ڕویێکەوە ببەسترێ بەو سێ شتەوە لەژیانی ڕۆژانەی موسوڵمانانندا . نەك باوەڕهێنان بەتەنها ، بەبێ کار و کردەوە ، بۆیە هەموو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بەستراوە بەکردەوەی چاکەوە .

خوای گەورە لەمەوبەر باسی چاکە و گەورەیی موسوڵمانانی بۆ کردین لەگەڵ خاوەن نامەکانی تردا ، لەمەو پاشیش ئەفەرموێ : نیشانەی باوەڕهێنان ئاشکرایە ، دەست نیشانی ئاینی ڕاستیشمان بۆ ئەکا ، کاتێ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ چووە مەدینە ، دوو کەس لەزانایانی گەورەی شام هاتن بۆ خزمەتی کە چاویان بەمەدینەکەوت بەیەکتریان ووت : ئەم شارە بەزۆری لەو شارەئەچێ پێغەمبەری دوارۆژ لەوێ سەر هەڵئەدا ، کە پێغەمبەریان بینی ناسیان، بۆیان دەرکەوت کوتومت ئەو کەسەیە لەتەوراتا باسی کراوە ، ووتیان : تۆ موحەممەدی ، فەرمووی : بەڵێ ، تۆ ئەحمەدی ، فەرموی : بەڵێ . ووتیان پرسیاری ئاشکراکردنی شتێکت لێ ئەکەین ئەگەر وەڵامت داینەوە باوەڕت پێ ئەهێنین . فەرمووی : چ شتێ ئەپرسن بیپرسن . ووتیان : گەورەترین شایەتی دانی نامەی خوا چ شتێکە ؟ خوای گەورە فەرموی :

شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْعِلْمِ قَآئِمًۢا بِٱلْقِسْطِ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٨﴾ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ۗ وَمَا ٱخْتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِـَٔايَٰتِ

ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿١٩﴾ فَإِنۡ حَآجُّوكَ فَقُلۡ أَسۡلَمۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِۗ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡأُمِّيِّـۧنَ ءَأَسۡلَمۡتُمۡۚ فَإِنۡ أَسۡلَمُواْ فَقَدِ ٱهۡتَدَواْۖ وَّإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٢٠﴾

﴿ شهد الله انه لا إله إلاّ هو ﴾ خوا شایەتی داوە و فەرمانی داوە و ڕوونی کردۆتەوەبەڕاستی هیچ خوایە نی‌یە پەرستنی بۆ بکرێ مەگەر هەر خوایە تاك و تەنهایە .

﴿ والملائكة ﴾ وە فریشتەکان شایەتی ئەدەن هەر بەو جۆرەی خۆیان لا یان ڕوونە کە هیچ خوایە نیە جگە لە خوا ، گەورەیی توانای خوا لایان ڕونە ، ئەوان لە هەموو کەس نزیکترن بۆ زانینی چۆنێتی هەڵسوڕاندنی ئەم بونەوەرە سەر سوڕێنەرانە لەلایەن خواوە .

﴿ واولوا العلم ﴾ وەخاوەن زانیاریەکانیش شایەتی ئەدەن بەتاك و تەنهای خوا و شایانی پەرستن هەر بۆ ئەوە . ئەو زانایانە بریتین لەو کەسانە بیر لەهێزی هەڵسوڕێنەری ئاسمانەکان و زەوی ئەکەنەوە لەپێغەمەران و پەیڕەوەکانی و فریشتەکان کە ئەزانن خوا یەکە و هەر ئەو شایانی پەرستنە .

﴿ قائماً بالقسط ﴾ ڕاوەستاوە بەداد پەروەریی لەئاین و لە دەستوردا ، لەبەخێوکردنی بونەوەران و ڕۆزی پێدانیان ، لەپاداشت دانەوەیان بەکرداری خۆیانن ، لەشایەتی دان بەوەی هەر خۆی شایانی پەرستنە .

﴿ لا إله إلا هو العزيز الحكيم ﴾ هیچ خوایێ نیە شایانی پەرستنبێ مەگەر خوای تاك و تەنها ، گەورە و بەتوانایە هیچ کەسێ باڵادەستی ئەونیە ، هەموو شتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ ... هۆی دووپات کردنەوەی ئەو ڕستەیە لەیەك ئایەتدا بۆ ئەمەیە :

ئەوەی لەفەرموودەی قورئانەوە ناسراوبێ بنچینە گرنگەکانی بیروباوەڕ دووپات ئەکاتەوە بەتایبەتی یەکێتی خوا بۆ نەهێشتنی هەموو گومانێ . هەندێ لەزانایان ئەڵێن مەبەست لەڕستەی یەکەم بۆ ئەوەیە بزانرێ هەر خوا بەتەنها شایستەی پەرستنە ، مەبەست لەڕستەی دووهەم ئەمەیە : هەتا بزانرێ هەر خوا بە تەنها هەڵئەستێ بە دادپەروەری و یەکسانی .

﴿ إن الدين عند الله الأسلام ﴾ بەڕاستی ئاینێ پەسەندبێ لای خوا ئاینی ئیسلامە بەتەنها نەك ئاینی جولەکەکان و گاورەکانی ئێستا ، ئاینی ئیسلام ئەو ئاینەیە مرۆڤ بەهۆی ئەوئاینەوە خۆی ئەداتە دەست خوا بە مل کەچیەوە ، بۆ مرۆڤێ دەرئەخا بچێتە نێو جەرگەی پەرستنەوە ، ئاینی ئیسلام ئەو ئاینەیە هەموو پەرستنی خوای تێدایە بەبێ کەم و کورِی هاتوەتە خوارەوە بۆ لای پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بنچینەی دامەزراوە لەسەر یەکێتی خوا لەیەکەم کاتی ئادەمەوە هەتا هاتنی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئاینی پێغەمەران بەگشتی بەئیسلام ناوبراون .

﴿ وما أختلف الذين أوتوا الكتاب إلاّ من بعد ما جاءهم العلم بغيا بينهم ﴾ وە ناكۆکی و دژایەتی ئاینی ئیسلامیان نەکردووە کەسانێکی ئەوتۆ نامەیان پێ دراوە مەگەر لەدوای ئەوەی هات بۆ لایان زانیاری بەو ئاینە ڕاست و بێگومانە دژایەتی و ناكۆکیان لەبەر دەروون پیسی نێوان خۆیان و لەبەرمانەوەی سەرۆکایەتی خۆیان بوو ، نەك لەبەر ئەوەی گومانیان هەبێ لەو ئاینەدا و نهێنی بێ لایان .ناکۆکیان پەیدا کرد لەتاك و تەنهایی خوادا ، گاورەکان بڕیاریان دا سێ خوا هەیە جولەکەکان ووتیان : عوزەیر کورِی خوایە .

﴿ ومن يكفر بآيات الله فان الله سريع الحساب ﴾ وەهەرکەسێ باوەڕنەهێنێ بە بەڵگە ڕوونەکانی خوا لەسەر ئەوەی تەنهایە و ئاینی ئیسلام ڕاستە و قورئان نەکا بەیاسای خۆی و پێغەمەر نەکا بەپێشەوا بۆ خۆی ، دوایی بەڕاستی خوا لە پرسیار کردندا زۆر چوستە و دواکەوتنی بۆ نیە .

ئەو خاوەن نامانە ناکۆکی و جیاوازیان بەتەنها بەئاینی ئیسلامەوە نەوەستاوە ، ناکۆکیان لەنێو خۆیان زۆرە : هەندێکیان ئەڵێن زیندوو بوونەوەی پاش مردن نیە ، سزای خراپە و

پاداشتی چاکە هەر لەجیهاندا ئەدرێتەوە دەســـت خاوەنـەکانیان ، هـەندێ تریـان ئـەڵێن : هەندێ لە پیاو چاکان لەم سەرزەویەدا زیندوو ئەبنەوە بۆ بەشداری کردنیـان لـەدەسـەڵاتی پێغەمەراندا و لـەو دەستەڵاتەی ئەو مەسیحەی لە دوا کاتا دێت ..

بەڵام بیروباوەڕی گاورەکان گۆڕانی بەسەرداهات و چەندین پلەی بڕی بەر لـەوەی کە بڕیاری سێ خوایی بدەن . دوایی بوون بـەدوو بەشـەوە ، بەشـێکیان وەك خۆیـان مانـەوە لـەسەر پەرستنی خوایەکی تەنها ، بەشێکی تریان هاوبەشـیان بـۆ خـوا دانـا ، دوایـی ئـەم بەشەیان بوون بەدوو بەشی ترەوە : یەکێکیان بڕوایان وابوو عیسا خاوەنی دوو سروشـتە : خوایێتی و ئادەمیزادی ، دووهەمیان بڕیاریان دا عیسا خاوەنی دوو سروشتی خواییە بەتەنها، ئەو جیاوازیە ئایینیەی گاورەکان سەری کێشا بـۆلای قەسـابخانەیەکی بـێ وێنـە لـەنێوانیانا لەمێژووی ئادەمیزاددا گێڕراوەتەوە و لەپێغەمەرەوە ﴿ﷺ﴾ . جولـەکەکان ئـەبن بـە (٧١) تاقم ، گاورەکان ئەبن بە (٧٢) تاقم . ئەفەرمویێ ئۆمەتی من ئەبن بە (٧٣) تاقم.

پرسیار / لـەو ئایەتەدا دەرئەکەوێ هەموو ئایینەکانی پێغەمەرانی تر هیچ شتێ نـین جگـە لـەئاینی ئیسلام لـەگەڵ ئەوەیشدا بەفەرمودەی قورئان و پێغەمەر ئەو شـتەی پێغەمـەرانی تـر هێناویانە ڕاستن ؟

وەڵام /

١) بەڕاستی ئاین بەر لـەهەموو شتێ چەقی داکوتاوە لـەسەر سێ شت : باوەڕکردن بە خوا و تاکی خوا ، سروش و پاراستنی سروش ، زیندوو بوونەوە و پاداشت .ئێمە هەموومان ئەزانین بەباوەڕێکی بێ گومانەوە خوا هیچ پێغەمەرێکی نەناردووە مەگـەر بـەو شـتانەوە نێرراوە.

٢) ووشەی ئیسلام بەم مانایانە هاتووە : مل کەچی و خـۆدان بەدەسـتی فـەرمانی خـوا ، بەنیازپاکی و خالّی لـەگومان و پۆخلّەوات ، بێگومان هەموو ئاینێ کـە پێغەمـەرانی تـر هێناویانە پاك و بێ گەردن ، کەواتـە شایسـتەیە کـە هـەموو ئاینـەکانیان پێـی ببێـژرێ ئیسلام.

٣) سەرچاوەی قورئان یەکە و جیاوازی لەنێو ئایەتەکانیا نی‌یە نەبەزۆر و نەبەکەم . بەڵکو هەندێکیان مانای هەندێکیان ئەکا . لەئایەتی (٧٢)ی سورەتی (یونس)دا فەرمان دراوە بە نوح لەموسوڵمانان بێ . لەئایەتی (١٣٣)ی (ئەلبەقەرەدا) ئیبراهیم و یەعقوب فەرمانیان داوە بەکوڕەکانیان موسوڵمان بن . موسا لەئایەتی (٨٤)ی سورەتی (یونس)دا ، عیسا لەئایەتی (١٠١)ی سورەتی (ئەلمائیدە)دا فەرمانیان داوە بەگەلەکانیان موسوڵمان بن .

﴿ فإن حاجوك فقل أسلمت وجهي لله ومن اتبعني ﴾ دوایی ئەگەر خاون نامەکان بەتایبەتی نوێنەرانی گاورەکانی نەجران دوژمنایەتی تۆیان کرد و داوایان لێ کردی واز لەئاینی ئیسلام بهێنی ، لەوەڵامیانا بڵێ : من خۆم بەدڵ و بەزمان و بەهەموو ئەندامی لەشمەوە سپاردووە بەخوا و مل کەچی فەرمانی ئەوم و ، کەسێکیش پەیڕەوی منی کردووە ئەوەیش وەك من خۆی سپاردووە بەخوا و مل کەچی فەرمانی ئەون و نیازیان پاکە ،

﴿ وقل للذين أوتوا الكتاب والأميين أأسلمتم ﴾ وەتۆ بڵێ بەکەسانێکی ئەوتۆ دراوە بەوان نامەی خوا لەگاور و لە جولەکەکان و ، بڵێ بەو کەسانەی نەخوێنەوارن : ئایا ئێوە موسوڵمان ئەبن لەپاش ئەو هەموو بەڵگە ڕوونانەی هاتووە بۆ لاتان؟

﴿ فان أسلموا فقد اهتدوا ﴾ دوایی ئەگەر ئەوان موسوڵمان بوون ، دوایی ئەوان ڕاغوییان وەرگرتوە و ڕێگەی ڕاستیان گرتوە ، وازیان لەخراپە هێناوە ، ئەوان هەر ئەو کەسانەن لایان وایە موسا و عیسا بەندەی خوان.

﴿ فان تولوا فانما عليك البلاغ والله بصير بالعباد ﴾ دوایی ئەگەر ئەوان واز لەئیسلام بهێنن ، دوایی بەڕاستی تۆ لەسەرتە گەیاندنی پەیامی ئیسلام بەوان ، زیان بەتۆ ناگەیەنن و، خوا ئەزانێ بەبەندەکانی خۆی پاداشتی چاکە و خراپەی هەموویان ئەداتەوە ، تۆیش خۆت ماندوو مەکە .

هەندێ لەزانایان ئەڵێن :ناوەرۆکی ئەو ڕستەیە ماناکەی ڕونە (محکم) ە مەبەستەکەی دڵدانەوەی پێغەمەرە ﴿ﷺ﴾ چونکە ئەو زۆر مەبەستی بوو ئەوان باوەڕ بهێنن و ئێشی پێ

ئەگەیی وازیان لەباوەڕ هێنا . هەندێ تریان ئەڵێن : ئەو ئایەتــە ماناکـەی گـۆڕاوە بـەهۆی ئایەتی شمشێرەوە (السیف) .

ئەو شتەی ئێمە سوودی لێ وەرگرین لەو ئایەتەوە ئەمەیە : خــوای گـەورە موحەمـەدی هەڵبژارد بۆ فرۆستادەیی نەخشەی پەیڕەو پرۆگرامێکی تایبەتی بــۆ کێشـاوە بـۆ گـەیاندنی پەیامەکـەی بـەهۆی بەڵگـە و خۆڕاگرتنـی بەرامبـەر بـەدەم درێـژی دوژمنـانی خــۆی . خۆپاراستنی بــە شـێوەیە بتوانــێ بەسـەریانا زاڵ ببــێ بڕوبیانویـان نـەمێنێ کـەخۆیانی پێـدا هەڵواسن .

بائەمەیش بزانین چاکترین ئـادەمیزاد بۆپـەیڕەوی کردنـی پێغەمـەران پێویسـتە خـاوەنی زانست و زانیاری بن بەئاین و بەدەستورەکانی ، هەرئەوانیشن بانگی ئادەمیزاد بکــەن بـۆ لای باوەڕو فێرکردنی ڕەوشتی بەرزی ئیسلام و ئەو شتانەی پێغەمەرانیان بۆ ڕەوانەکراوە .

کۆمەڵێ لەپێغەمەران خوا ڕەوانەی کردن بۆ لای بەنو ئیسرائیلی هەتا بانگیان کەن بـۆ لای خوا پەرستی کەچی سەرەڕای ئەوەی باوەڕیان پێ بکەن دەستیان کرد بە کوشـتنیان ، دوای ئەوانیش کۆمەڵێ لەباوەڕداران هــاتن و فـەرمانیان دا بـە دادپـەروەری ئەوانیشـیان کوشت بەو بۆنەوە خوا ئەفەرموێ :

إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقۡتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيۡرِ حَقٍّ وَيَقۡتُلُونَ ٱلَّذِينَ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡقِسۡطِ مِنَ ٱلنَّاسِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢١﴾ أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّـٰصِرِينَ ﴿٢٢﴾

﴿ إن الذین کفروا ﴾ بەڕاستی کەسانێك باوەڕیان نەهێناوە بەقورئان لەگاور و جولەکەکانی سەردەمی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کەوازیان لەئیسلام هێنا و باوەڕیان :

﴿ بآیات الله ﴾ بەنیشانەکانی خوا نەهێنا ن ئیتر هەر نیشانەیە بێ ، بەتایبەتی قورئان و پێغەمەرەکە بەڵگەی ڕوونی بۆ ئەوان هێناوە لەسەر پەرستنی خوا بەهۆی نامەکانی خواوە .

﴿ ویقتلون النبیین بغیر حق ﴾ وەئەکوژن پێغەمەرەکان بەبێ ئەوەی کوشتنەکانیان ڕەوابێ ، ئەو ڕستەیە هەڕەشەیەکی زۆر سەختە ، بۆ ئەوە بزانرێ کوشتنی پێغەمەران هەموو کاتێ ناڕەوایە ئەیان کوشتن و ئەیانزانی ناڕەوایە و کارێکی خراپە .

﴿ ویقتلون الذین یأمرون بالقسط ﴾ وەئەکوژن کەسانێکی ئەوتۆ فەرمان ئەدەن بە داد پەروەری و ڕاستی لەئادەمیزادی جگەی پێغەمەران .

﴿ فبشرهم بعذاب ألیم ﴾ دوایی تۆ موژدە بدە بەوان بەسزایەکی ئازاردەر .

پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لەمانای ئەو ئایەتەدا فەرمووی : سەر لەبەیانی ڕۆژێك چل و سێ کەسیان لەپێغەمەران کوشت پاش ئەو کوشتنەیان دوازدە کەس لەپیاوچاکان هەستان و فەرمانیان دا بەچاکەکردن بەتایبەتی قەدەغەی کوشتنی پێغەمەران کەچی لەکۆتایی ئەو ڕۆژەدا ئەوانیشیان کوشت .

مەبەست لەو کەسانە بەو کوشتنە هەڵسان گاور و جولەکەکانی سەردەمی پێغەمەرە ﴿ﷺ﴾ ، ئەو کەسانە هەرچەندە پێغەمەرانیان نەکوشتووە ، بەڵام وازیان لەئیسلام هێناوە ئەو کارە خراپانە لەوانەوە دوور نی‌یە پێی هەڵسن وەك ئەوە وایە ئەمان بەو کوشتنە هەڵسابن .

جولەکەکانی پێش ئەوان پێغەمەرەکانی خۆیانیانکوشت لەو پێغەمەرانە بوون زەکەریا و یەحیا ، گاورەکانی پێش پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هەرکەسێ بڕیاری بدایە خوا یەکە و عیسا ئادەمیزادە ئەیان کوشت ، هەر لەبەر ئەوە کە فەرمانیان بەداد پەروەری ئەدا ، لەبەر ئەوەی جوولەکە و گاورەکانی سەردەمی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەکرداری پێشوەکانیان ڕازی

بوون ، وەك ئەمان کردبێتیان وایە ، زۆر ڕاستە ئەو کەسەی ڕازی بێ بەکردەوەی خراپی کۆمەڵێ بەهاوبەشی ئەوان دائەنرێ ، زۆر جاران پیشەی باوك ئەدرێتە پاڵی کوڕ ، لەبیرمان نەچێ زۆر جاران هەوڵی کوشتنی پێغەمەریان داوە بەتایبەتی جوولەکەکان .

﴿ أولئك الذين حبطت أعمالهم في الدنيا والآخرة ﴾ ئەوکەسانەی بەو کارانە هەڵساون لەخاوەن نامەکانی پێشوو ئەوانەی سەردەمی پێغەمەر کەبەو کارانە ڕازین کەسانێکی ئەوتۆن پووچ بۆتەوە پاداشتی کردارەکانیان کە بەگوێرەی بڕیاری خۆیان ئەڵێن بە فەرمانی تەورات و دەستوری موسا هەڵساوین لەجیهاندا ستەم لێ کراو و گومڕان نەخۆیان و نەداراییان نرخیان بۆ دانانرێ لەلایەن ئیسلامەوە ، نهێنی خراپی دەرونیان ڕوون ئەبێتەوە ، لەپاشە ڕۆژدا ئەخرێنە دۆزەخ بەبەردەوامی .

﴿ وما لهم من ناصرين ﴾ وەبۆ ئەو کەسانە نیە هیچ یاریدەدەر و پشتیوانێ کەلەسزای دۆزەخیان دوور بخاتەوە .

زانایان بۆ فەرماندان بەچاکە و بۆ قەدەغە کردنی خراپە چەند مەرجێکیان بۆ داناوە :

پێویستە ئەو کەسە ترسی لەناوچوونی خۆیی و خێزانی نەبێ ، بەو بۆنەوە سامانی نەکەوێتە مەرتسیەوە . بەڵام هەندێ لەزانانیان ئەڵێن : فەرمان بەچاکەکردن و قەدەغە کردن لەخراپە لەسەر هەموو کەس پێویستە سەربکێشێ بۆ لەناوچوون یان نە ؟ بەڵگەیشیان ئەو ئایەتەیە لەکاتێکا پێغەمەران خۆیانیاندابێ بەکوشتن ، جگە لە پێغەمەرانیش پێویستە خۆیان دابنێن .

بەشی زۆری زانایانی بڕوا پێکراو بیریان وایە هەرکاتێ زانرا کە فەرماندان بەچاکە و قەدەغەکردنی خراپە هیچ سوودێ نابەخشێ ، بگرە سەرئەکێشێ بۆ لای گوناە و زیانی خراپتر و گێرە شێوێنی نالەبارتر ، لەوکاتەدا بۆی دروستە بێ دەنگ بێ ، ئەگەر بڕوای تەواوی وابوو سوود بەخشە بۆ ئاین لەو کاتەدا پێویستە لەسەر موسوڵمانان فەرماندان بەچاکە و قەدەغە کردن لەخراپە یا ببێتە هۆی زیانی خۆیان ، ئەوە لەلایەك لەلایەکی ترەوە

ئەگەر ئەیانزانی سوود بەخشە بۆ کارێکی زۆر گرنگی ئاین ، وەك بنەبڕ کردنی بێ باوەڕی و نەهێشتنی ستەم و گێرە شێوێنی لەسەر زەوی ، زۆر ڕەوایە ئەو زیانە هەڵگرن لەبەر ئەو ڕێگە گرنگە ، بگرە وایش ئەبێ پێویست نەبێ لەسەریان ، ئەگەر لایان وابوو پاراستنی خۆیان و مانەوەیان گرنگترە لەو قەدەغەیە ، بۆ وێنە قەدەغەکراوەکە بریتی بێ لەخواردەمەنی پیس ، ئەوانیش زانا و دانای ئاین بوون بەتەنها ، بۆیان دروستە بێ دەنگ بن ، وایش ئەبێ پێویستە بێ دەنگ بن ، هەندێ جاریش وائەبێ پێویستە فەرماندان بەچاکە کردن و قەدەغە لەخراپە . بەکورتی ئادەمیزاد پێویستە تەماشای کات و شوێن و کاروباری هەڵسوڕاوی ئەو سەردەمەی خۆیان بکەن . بەبێ درۆ و دەلەسە لەنێوان خۆیان و خوادا ، ئەوەی سوودی ئاینی تێدایە لەمانەوەی خۆیان و فەرماندان بە چاکە کردن و قەدەغە کردن بیکەن ، لەو بارەوە ئادەمیزادی جگەی پێغەمەران تەماشاناکرێن ، چونکە پێغەمەران بەپێچەوانەی ئێمەوە چاك و خراپیان بەهۆی پەیامەوە لا ڕوونە ، لەمەو دوایش بەگوێرەی جێگە و باس لەم بارەیەوە گفتوگۆی تر بەرپا ئەکرێ ، خوا یاریدەدەرمانبێ .

پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ چو بۆ لای یەکێ لەخوێندنگای جولەکەکان ، داوی لێکردن باوەڕ بەئاینی ئیسلام بهێنن ، ئەوانیش ووتیان : ئەی موحەمەد تۆ لەسەر چ ئاینێکی ؟ فەرموی لەسەر ئاینی ئیبراهیم ووتیان : ئیبراهیم جوولەکە بووە . فەرموی کەواتە وەرن بابەتەورات بڕیاری خۆمان بدەین ، ئەوانیش ملیان شۆڕ کرد ، بۆیەئایەتی (٢٣) هەتا ئایەتی (٢٥) هاتە خوارەوە . هەندێ لەزانایان ئەڵێن : هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتانە چەند شتێ ترن هەرچۆنێ بێ مەبەستەکە ناگۆڕێ ، خوا فەرمووی :

أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُدْعَوْنَ إِلَىٰ كِتَابِ اللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لَن تَمَسَّنَا النَّارُ إِلَّا أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ وَغَرَّهُم

فِي دِينِهِم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾ فَكَيْفَ إِذَا جَمَعْنَاهُمْ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٥﴾

﴿ ألم تر إلى الذين أوتوا نصيباً من الكتاب ﴾ ئایا تۆ تەماشات نەکردووە بۆ لای کەسانێکی ئەوتۆ بەخشراوە بەوان بەشێ لەو نامەیەی تەورات ،کە لەو نامەیەدا هەبوو زانیاری و فەرمانەکانیخوا ،بەتایبەتی شێواز و ناوی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾.

﴿ یدعون إلى کتاب الله ﴾ بانگیان کرا بۆ لای نامەی خوا کە تەوراتە یا قورئان کەبەهۆی بەڵگەی ڕوونەوە بۆیان دەرکەوتبوو کەلەلایەن خواوە هاتووە ، باوەڕیان پێ نەهێنا . بەڵام زۆرتر لەزانایان لایان وایە مەبەست لەو نامەیە تەوراتە ، چونکە هۆکانی هاتنە خوارەوەی ئەو وامان بۆ دابین ئەکا ئەو نامەیە تەوراتبێ .

﴿ لیحکم بینهم ﴾ بۆ ئەوەی ئەو نامەیە فەرمان بدا لەنێوان جولەکەکان و پێغەمەردا کە فروستادەی خوایە و ئیبراهیم جولەکە نەبوە و لەسەر ئاینی ئەوان نەبووە ، بەردەباران کردنی زینا کەران لەتەراتا هەیە ، هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە هەر شتێ بێ و هەرچۆنێ بێ هەموو ئەو کەسانە ئەگرێتەوە دروشمێ هەڵگرن و بڕوای پێ بهێنن و بیکەن بە گورزی دەستی خۆیان .

بەچاوی خۆمان ئەی بینین زۆر کەسان هەن پڕوپاگەندەی چەپەڵ ئەکەن . بۆ نمونە ئەو کەسەی ستەمکارانە جەنگ خوازن ئاگری خوێن ڕێژی خۆش ئەکەن بەملیۆن ئادەمیزاد ئەکوژن بەگومانی گڵاوی خۆیان یاریدەیئاشتی ئەدەن ، ئەو خوێن خۆرانە خوێنی ڕەش پێستەکانی ئەفریقیا ئەمژن و ئەڵێن : ئێمە بڕوامان بەڕاستی هەیە و دادپەروەرین !! ئەو

جولەکانەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بانگی ئەکردن بۆلای بڕیاردان بەتەورات و ڕویان وەرئەگێڕا و پشتیان ئەکردە فەرمودەکەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ . زایۆنی‌یەکان خوێنی فەلەستینیەکان ئەڕێژن. ئەوانەی خوێنی ئەفغانیەکانیان ئەرێژا و ئێستا خۆیان خوێنـــی یـەکتری ئـەرێژن . ئەمـەریکا پەلاماری لیبیا ئەدا ، ئەو کەسانەیش جەنگی نێوان عـێراق و ئێرانیـان هەڵگیرسـاند ، ئـەو رژێمەی کوردەکانی بەناو ئەنفال کرد و نیو ملیۆن کوردی کوشت و دەربەدەری کردن و دێهاتەکانی ڕوخاند ، هەموویان بەبیروڕای پیسی خۆیان دادپەروەر و ئاشتی خوازن .

﴿ ثم یتولی فریق منهم وهم معرضون ﴾ لەپاشا پشتیان وەرگـێڕا لـەداواکاری پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ تاقمێ لـە خاوەن نامەکان کە بریتی بوون لەو جولەکانە خۆیانیان بەزانا دائەنا ، ئەو تاقمەن ڕویان وەرگێڕا و گوێی خۆیانیان کەڕ کـرد لەبیسـتنی ڕاسـتی ، ئـەو جولەکانـەن ڕەوشتیان لەهەموو سەردەمێکا هەر گـوێ نەگرتنـە لەڕاسـتی کـە پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ داوای ئەکرد .

﴿ ذلك بأنهم قالوا لن تمسنا النار إلاّ أیاماً معدودات ﴾ ئەو ڕوو وەرگێڕانەیان لەڕاستی و گوێ نەگرتنیان لـە پێغەمەر و هەڵنەسانیان بەفەرمانی تـەورات بـەو بۆنەیـەوە بـوو وکـە بەڕاستی ئەوان ئەیان ووت : لەمەو دوا تووشی ئێمە نابێ ئاگر لـەدۆزەخدا مەگـەر چـەند ڕۆژێکی کەم و ژمێرراو ، بەئەندازەی پەرستنیان بـۆ گوێرەکـە . ئـەو جوولەکانـە ئەگـەر بڕوایان بەئاین و فەرمانی تەورات و دادپەروەری ببوایە ، ئەو هەموو بوختانەیان نەئەکرد .

﴿ وغرّهم في دینهم ماکانوا یفترون ﴾ وەئەو تاقمە فریویدابوون لەبەردەوامیان لەسـەر ئەو ئاینەی خۆیان شتێ ئەوان بەبوختان و درۆ ئەیان ووت : سزای خوا بۆ ئەوان ئاسـانە ، باوك و باپیرەکانمان بۆمان ئەپاڕێنـەوە لای خـوا و لێمـان خـۆش ئـەبێ ، ئێمـە کـوڕان و دۆستانی خواین . زۆر ڕاست و بێگومانە باوەڕ بەگەیشتن بەخزمـەتی خـوا لەپاشـە ڕۆژدا کۆنابێتەوە لەگەڵ ئەو بیرو باوەڕە خراپانەدا .

بەڕاسـتی خـوا لەنامـەی بـەرزی خۆیـا زۆر شـــتی نـاڕەواو نالـەباری دەربـارەی جوولەکەکان نووسیوە : کوشتنی پێغەمەرەکانیان ، پەرسـتنی گوێرەکـە ، گومانیـان وایـە

جگە لـە جوولـەکە کەسی تر ناچێتە بەهەشت ، ئەوان کوڕی خوان ، ئاگر ماوەیەکی کــەم تووشیان ئەبێ .

خاوەنی تەفسیری ( مەنار ) لەمامۆستای خۆیەوە موحەمەد عەبدەوە ئەگێڕێتەوە لـەنامەی جوولـەکەکانی ئێستادا کە باون باسی موژدەدان و هەڕەشەی خوای بۆ کـردەوەی چـاك و خراپ نەنوسراوە.

زۆربەی زانایان ئەگێڕنەوە جوولـەکــەکان باوەڕیـان بەپاشـەڕۆژ نیـە یانـێ ئەوانـە لـەم سەردەمەدان ، زۆر نزیکە و ڕاســتە پێشـووەکانیان بڕوایـان بـەخوا هـەبووە ، بـەگوێرەی فـەرموودەی هـەندێ لەئایەتـەکان ، بەتایبـەتی ئـەو ئایەتـەی ڕابـورد . بـەڵام نـەوەکانیان دەستکاری نامەکانیان کردووە ئەوانەیان بڕوایان بەڕۆژی دوایی نیە ، ئەو باسـانەی بوونـی ڕۆژی دواییان لابردووە .

زانایانی ئەوروپایی دەریان خستووە کە تەورات لـەپاش موسا بەچەند سـاڵێ نوسـراوە ، لـەهەموو شتێ خراپتر ئەمەیە : بــەپڕ و پاگـەندەی جوولـەکـەکان خـوا لایـەنگری ئەوانـە ، بەتەنها خوا هەر خوای ئەوانە ، جگە لـەوان وەك ئاژەڵ خوا بۆ سوودی ئـەوانی دروسـت کردووە ، ناوی خۆیان ئەبەن بەگەلی هەڵبژاردەی خوا .

ئەوانە هەموویان ناچنە سەر و پووچن بــەگوێرەی ئـەقڵ ، بەردێکـە و بـەرە و بۆشـایی فڕێ ئەدەن ، ئەو جولـەکانە وەك بەسەر خوادا بخوڕن ، هیچ کارێکی نادیـاری بەجگـەی پەیامی خوا نازانرێ ، لـەگەڵ ئەوەیشدا خوا نەفرەتی لـەو جوولـەکانە کردووە ، ئەفەرموێ: سزایان ئەدەم ، ئەفەرموێ :

﴿ فکیف إذا جمعناهم لیوم لاریب فیه ﴾ دوایی چۆنبێ بەسەرهاتی ئەو جوولـەکانە کاتێ ئێمە کۆیان ئەکەینەوە بۆ ڕۆژێ گومان لـەو ڕۆژەدا نیە بۆ پرسیار و وەڵام و داد پـەروەری لـەنێوان ئادەمیزادا .

﴿ ووفیت کل نفس ما کسبت وهم لا یظلمون ﴾ وەبەتەواوی ئەدرێ بەهــەموو کـەس شتێ کردویانە ، پاداشت و تۆڵەیان وەرئەگرن ، وەئـەوان ستەمیان لێ نـاکرێ ، نەبەکـەم کردنەوەی پاداشتی چاکەکانیان ، نەبەزۆرکردنی سزای خراپەکانیان .

بەڵام پێویستە بزانین هەموو کاتێ سـزا نابـێ بـۆ تۆڵـە کردنـەوەی خراپـە و لـەوانەیـە کەمتربێ یا خوا لـەوان خۆش ببێ و بەمیهرەبانی بەمەرجی باوەڕ هێنان .

ئێمەی موسوڵمان بڕوای تایبەتی خۆمان وایە ، هەر کەسێ لـەجیهاندا هەر بەتەمای خـوا بێ و بەتەمای کەسی تر نەبێ لـەهەموو ڕوێکەوە و لـەهەموو ڕوداوێکا پشت بەخوا ببەسـتێ لـەهەموو کارێکا بێـت و بـڕوا ، بـاوەڕی وابـێ جگـەی خـوا ناگاتـە فریـای ، بەهـەموو فـەرمودەکانی خـوا و پێغەمـەر باوەڕەکـەی بنجـی داکوتابـێ لـەدەروونیدا ، ئەوکەسـە بەگوێرەی بڕوای خۆی پاداشتی خۆی لای خوا دەست ئەکەوێ ، بەئەو پەڕی دڵخۆشیەوە بەمەرجێ لـەم جیهانەدا بەکاری چاکە هەڵسابێ لـەگەڵ ئەو باوەڕە تەواوەدا .

کاتێ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ڕۆیشت بۆ مەکە دەستی بەسەردا گرت مۆژدەی بە موسوڵمانانەدا کەسامان و کۆشکی فارس و ڕۆم لـەمەو پاش داگیر ئەکەن ، جولـەکەکان و دوو ڕووەکان ووتیان : زۆر دوورە ئەو کارە لـەموحەمەدەوە سامانی ڕۆم و فارس چۆن داگیر ئەکا بـەو هەموو دەسەڵاتەوە هەیانە ، بەمەکە و مەدینە تێر ناخوا و بەتەمای کۆشکی فارس و ڕۆمـە ، بەو بۆنەیەوە خوا فەرمووی :

قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلۡمُلۡكِ تُؤۡتِي ٱلۡمُلۡكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلۡمُلۡكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُۖ بِيَدِكَ ٱلۡخَيۡرُۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٢٦﴾ تُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَتُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِۖ وَتُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَتُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتَ مِنَ ٱلۡحَيِّۖ وَتَرۡزُقُ مَن تَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴿٢٧﴾

﴿ قل اللهم مالك الملك ﴾ تۆ بڵێ ئەی خوایە خاوەنی هەموو سامان و پاشایەتی و دەستەڵات ، خاوەنی ئەو شتانەی لەئاسمانەکان و لەزەویدان ، تۆ هەڵسوڕێنەری کاروباری بوونەوەرانی .

﴿ تؤتي الملك من تشاء ﴾ تۆ ئەبەخشی سامان و دەستەڵات بەهەرکەسێ ئارەزوو بکەی لەپێغەمەرایەتی و پاشایەتی و ساماندارى و پلە و پایەی بەرز .خوا بەخشی بەموسوڵمانانی پێشوو دەستەڵات کاتێ وەڵامی بانگەشەی ئیسلامیان دایەوە و کاریان پێ کرد .

﴿ وتنزع الملك ممن تشاء ﴾ وەتۆ لائەبەی و دائەرنی توانا و سامان لەکەسێ ئارەزوت هەبێ . لات برد توانا و دەستەڵاتی فارسەکان و ڕۆم چونکە باوەڕیان بەخوا و بەراستی نەبوو .

﴿ وتعز من تشاء و تذل من تشاء ﴾ وە تۆ باڵادەست ئەکەی بەپلەو پایە و سامان کەسێ ئارەزوو بکەی و ، لاواز و سەر شۆڕ ئەکەی کەسێ ئارەزوو بکەی بەلابردنی پلە و پایە و سامانیان .

﴿ بيدك الخير انك على كل شيء قدير ﴾ بەدەستی توانای تۆیە هەموو چاکەیەك لە بەرز کردنەوەی باوەڕداران و ئاینی ئیسلام ، چاکەی زۆر ئەبەخشێ بەموسوڵمانان ، لەجیهاندا ، لەپاشە ڕۆژدا پلەی بەرزیان ئەداتێ . بەراستی تۆ بەسەر هەموو شتێکا دەسەڵاتت هەیە ، پلە و پایە لەبێ باوەڕأن وەرئەگری و ئەیبەخشی بەباوەڕداران .

بۆ زانین : لەو ئایەتەدا سێجار ووشەی ﴿ الملك ﴾ دووپات کراوەتەوە : یەکەمیان : هەموو دەستەڵاتێ ئەگرێتەوە ، دووانەکانی تر تایبەتن بەهەندێ لەو دەستەڵاتانەی یەکەم ئەیان گرێتەوە .

مانا و ناوەرۆکی ئەو ئایەتە سەرانسەر بەسەر موسوڵماندا ئەسەپێ ، لەیەکەم کاتی بانگەوازی ئیسلامدا بەجۆرێ بوون ، بوون بەخاوەنی دەستەڵات و پلە و پایە و دارایی و ڕێز ، لەکاتێکا ئاینی ئیسلام بەبێ کەس و بەبێ دەسەڵات خۆی ئەنواند و ئەترسان بیان

فڕێنن و لەناویان ببەن ، هاوکات فارس و ڕۆمەکان خاوەنی پلە و پایە و سامان و چەك و سەربازی زۆر بوون ، بت پەرستان خاوەنی دەسەلاتی زۆر بوون ، ئەوەبوو پاش بلاو بوونەوە و پەرەسەندنی ئاینی ئیسلام کار بەپێچەوانە گەڕا و موسوڵمانان بوون بەخاوەنی سامان و پلە و پایە و دەسەلات و کاربەدەست و سامان و پایتەختی فارسیان داگیر کرد و زۆربەی شوێنەکانی ڕۆمەکانیان داگیر کرد ، بوون بەسەرۆك و دوژمنان بوون بەژێر دەستە و بێ نرخ .

﴿ تولج اليل في النهار ﴾ تۆ شەو ئەبەیتە نێو ڕۆژەوە بەجۆرێ لەشەو کەم ئەبێتەوە ، ڕۆژ پەرەئەسێنێ هەتا ئەگاتە (١٥) کاتژمێر و شەویش ئەبێ بە (٩) کاتژمێر .

﴿ وتولج النهار في اليل ﴾ وەتۆ ڕۆژ ئەبەیتە نێو شەو ، بەجۆرێ لەشەو کەم ئەبێتەوە ، ووردە ووردە هەتا شەو ئەبێ بە (١٥) کاتژمێر و ، ڕۆژ ئەبێ بە (٩) کاتژمێر ، بەدوو جۆری تر مانای ئەو ڕستانە کراوە :

١- تۆ کاتی یەکێ لەشەو و ڕۆژ ئەبەیتە ناو ئەوی تریانەوە و ئەیخەیتە جێگەی ئەوی تر. کەواتە لەو کاتەدا لەعێراق شەوبێ لەئەمریکا ڕۆژە ، بەپێچەوانەیشەوە ئەوەیش بەلگەی بێگومانە لەخرێتی زەوی .

٢- تۆ یەکێ لەشەو و لەڕۆژ ئەبەیتە ناوی ئەوی تریانەوە ، یەکێکیان ئەڕوا و ئەوی تریان دێتە جێگەکەی .

مانای ئەو ڕستانە هەرچۆنێبێ مەبەستەکە ناگۆڕێ ، هەر خوا خاوەنی توانایە و ، توانای خۆی ئاشکرا ئەکا بەوە ئاسمانەکان بەتوانای خوا ئەجولێن و ئەگەڕێن بەدەوری هەندێ تریانا بەو بۆنەوە وەرزەکان پەیدا ئەبن .

﴿ وتخرج الحي من الميت ﴾ وەتۆ دەرئەهێنی و ئاشکرای ئەکەی زینوو گیانلەبەرێ لە مردویێ ، وەك ئادەمیزادێکی زیندوو لەتۆوێکی مردوو ،باڵندەیەك لەهێلکەیەك ، مرۆڤێکی زانا لەنەزانێ ، باوەڕدارێ لەبێ باوەڕێ ، دانەوێڵە لەزەوییەکی ووشك و بێ گیان .

﴿ وتخرج الميت من الحي ﴾ وەتۆ دەرئەهێنی مردویێ لــەزیندویێ ، تــۆو لــەئادەمیزاد ، هێلکە لەمریشك ، دانەوێڵە لەدرەخت و ڕووەك ، بێ باوەڕێ لــە بـاوەڕدار ، بــێ پلەیـە لەخاوەن پلەیە ، خراپێ لەپاکێ .

﴿ وترزق من تشاء بغير حساب ﴾ وەتۆ ڕۆزی و خواردەمەنی ئەدەی بەکەسێ ئارەزوو بکەی بەبێ ژمارە و کەس ئەندازەی نازانێ ، چاوەڕوان و پرسیاری بۆ ناکرێ .

ئەو ئایەتە ئەمەمان بۆ ڕوون ئەئکاتەوە : ئەو خوایە توانای هەبێ شەو ورۆژبهێنێ بەدوای یەکا ، زیندوو مردوو لـەیەکترى دەربهێنێ ، بێگومان ئەتوانێ مرۆڤێکی خاوەن هێز بێ هـێز بکا و یەکێ تر لـەجێگەیا دابنێ و دەسەڵاتی پێ ببەخشێ .

هەندێ لـەبێ باوەڕان وەك حەجاجی کوڕی عەمر و ئیبنو ئەبی حەقیق و قەیسی کـوڕی زەید لـەجوولـەکەکان لـەژێرەوە پــەیوەندیان بەچــەند کەســێ لـەیاریدەرانــەوە ئــەکرد ، بــۆ ئەوەی وەریان بگێڕن لـەئاینی ئیسلام . بەو بۆنەیەوە ڕەفاعەی کوڕی مونزیـر و عـەبدوڵای کوڕی جوبەیر و ســەعیدی کــوڕی خەســەمە بــەو یاریدەرانــەیان ووت : دۆســتایەتی ئــەو جوولـەکانە مەکەن و خۆتانیان لێ دوور خەنەوە ، چونکە لـەوانەیە وەرتــان گــێڕن لــەئاینی ئیسلام ، ئەوان گوێیان بۆ نەگرتن ، بۆیە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە و فەرموی :

لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ ٱللَّهِ فِى شَىْءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُوا۟ مِنْهُمْ تُقَىٰةً ۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٢٨﴾ قُلْ إِن تُخْفُوا۟ مَا فِى صُدُورِكُمْ أَوْ تُبْدُوهُ يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ ۗ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٩﴾

يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَرًا وَمَا عَمِلَتْ مِن سُوٓءٍ تَوَدُّ لَوْ أَنَّ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُۥٓ أَمَدًۢا بَعِيدًا وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٣٠﴾

﴿ لا يتخذ المؤمنون الكافرين أولياء من دون المؤمنين ﴾ نابێ باوەڕداران بێ باوەڕان بکەن بە دۆست بۆ خۆیان و نەیان کەن بەکار هەڵسوڕێنەری خۆیان لەجگەی باوەڕداران، بێ باوەڕان شایستەی ئەوە نین بکرێن بەدۆست .. ئەو هەڕەشەیە لەوەوە هاتوە کۆمەڵێ لەیاریدەرانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ سەرۆکەکانی جولەکەیان بۆ دۆستایەتی خۆیان دەست نیشان کردبوو ، پەیمانی برایەتیان لەگەڵدا بەستبوون ، خوای گەورە ئەو شتانەی لێ قەدەغە کردن و فەرموی :

﴿ ومن يفعل ذلك فليس من الله في شيء ﴾ وەهەرکەسێ ئەو دۆستایەتیەیە لەگەڵ دەژمنانی خۆی بکا ، هەواڵی نهێنی موسوڵمانانیان بۆ بێنێ و ژێر بەژێریان لەگەڵ بکەن ، دوایی ئەو کەسە بۆی نیە لەدۆستایەتی خوا هیچ شتێ .دۆستایەتی خوا و دوژمنی خوا دژی یەکترین . خوای گەورە قەدەغە کردنی دۆستایەتی بێ باوەڕان وێنەی درۆکردن و ناوی خەڵك بردن نیە ، بەڵکو ئەو دۆستایەتیەیە بەبێ باوەڕی داناوە ، دۆستی بێ باوەڕان پەیوەندی بەخوا و ئاینی ئیسلامەوە نامێنێ ، بەتەواوی پەیوەندی خۆی بەئاینەوە پچڕاندوە ئەو کەسە .

هەموو کەسێ بڵێ : ﴿ لا إلـه إلاّ الله محمد رسول الله ﴾ ئەو کەسانە بەموسوڵمان دائەنرێن ، بۆی هەیە شتێ بۆ موسوڵمان دیاری کراوە ، لەسەریێتی شتێ زیانی موسوڵمانی تێدابێ مەگەر لەچەند شتێکا نەبێ وەك ئەمانە :

١- ئەو کەسەی خۆشحاڵبێ بەدۆستایەتی بێباوەڕان و بەباوەڕیان ، بێگومـان ئـەو کەسـە بەموسوڵمان دانانرێ، چونکە ڕازی بوون بەبێ باوەڕی بێ باوەڕی‌یە .

٢- ئەو کەسەی خۆی نزیك بخاتەوە لەبێ باوەڕان لەسەر لاوازی ئیسلام ، دوایی مانـای قورئان و فەرمودەکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بکـا بەشـتێ ڕێـك بکـەوێ لەسـەر ئـارەزوی بـێ باوەڕانی دوژمن بـەخوا و پێغەمـەرن ﴿ﷺ﴾ بـەجۆرێ ئـەو مانایـە دژی بنچینـە و بـڕوای ئیسلامبێ ، ئەو کارە بکا بەزانین و بەدستیان قەست ، ئەو کەسە بێ باوەڕە.

پرسیار : بەڕاستی ئەو کەسەی خۆی نزیك بکاتەوە لەبێ باوەڕان و بڕوای بەئاینی ئیسـلام نەبێ بێگومان ئەو کەسە بەبێ باوەڕ ئەژمێرێ ، بەڵام ئەگـەر ئـەو کـارە بکـا لـەبێ موبالاتیەوە ئەو کەسە گوناهبارە و بێ باوەڕ نیە ، وەك وازهێنـان لـەکردنی نوێـژ و خواردنەوەی مەی و بڕوای بێگومانی هەبێ قەدەغەن ئەو کەسە بێ باوەڕنیە.

وەڵام : جیاوازی لەنێوان بێ باوەڕی و بێ موبالاتی لەلقەکانی ئیسلامدا هەیە ، وەك نوێـژ و خواردنەوەی مەی ، بەڵام لەشتێکا بگەڕێتەوە بۆلای بنچینەی ئـاین و بـڕوا، وەك یەکێتیخوا و پێغەمەرایەتی موحەمەد و شتی تر ، باوەڕ نەبوون بەشتێ لەوانە ئەبن بە هۆی بێ باوەڕی ، ئیتر بەبێ موبالاتی بێ یا بەبێ باوەڕی ، بەڕاستی بزانێ یـا گاڵتـە بکا .

٣- ئەو کەسانە ئەبن بەسیخوڕی بێ باوەڕان بەسەر موسوڵمانانەوە ، ئەگەر لەبەر پـارە و دارایی و پلە بێ بەتەنها ئەو کەسانە تاوانبار و گوناهبارە ، ئەگەر بیکا لەبەر خۆشەویسـتی بێ باوەڕان و ڕقی موسوڵمانان ، بێگومان ئەو کەسە بەبێ باوەڕ دائەنرێ .

٤- ئەو کەسەی دۆستایەتی بێ باوەڕان بکا ، بەبێ گومان بزانێ بێ بـاوەڕان لەجـەنگدان لەدژی ئیسلام ، کار ئەکەن لەسەر لاوازی موسوڵمانان و تالآن کردنی توانایان ئەو کەسە تاوانبار و گوناە کارە و هاوبەشی ستەمکارە لەستەمیدا ، با ئەو ستەمکارە موسوڵمانبێ .

٥- داوای یارمەتی و کۆمەك لەبێ باوەڕانی ئاشتی خوازی بێ وەی بـۆ دژایـەتی کردنـی ئەو بێ باوەڕانە لەجەنگدان لەگەڵ موسوڵماناندا ، ئەو داواکردنی یارمەتیە دروستە بەپێك

هاتنی هەموو موسوڵمانان . بەمەرجێ لەژێرەوە لەدژی موسوڵمانان نەکرابێ . خاوەن مێژووەکان ئەو کەسانەی مانای قورئانیان کردووە گێڕاویانەتەوە کە پێغەمەر هۆزی خوزاعەی کرد بە هاو سوێندی خۆی و بت پەرستیشبوون ، داوای یارمەتی کرد لە سەفوانی کوڕی ئومەیە بەر لەئیسلام بوونی بۆ جەنگ کردن لەگەڵ هۆزی هەوازینا . داوای یارمەتی کرد لەجوولەکەکانی بەنی قەیناع و بەشیشی دان بەهەندێ لەدارایی .

٦- دۆستایەتی موسوڵمان لەگەڵ بێ باوەڕدا لەبەر چەند شتێکی ئاسایی ، وەك دراوسێتی و خوێندن و بازرگانی و چەندین شتی تر و خراپەی بۆ ڕێزی ئایین تێدا نەبێ ، بۆ فێر بوونی بەکارهێنانی چەك ، ئەوانە هەموویان ڕەوان لای موسوڵمانان بەگشتی . بەو مەرجەی سەرنەکێشێ بۆ لاوازی موسوڵمانان ، بگرە زۆر جاران پێویستن ، تێکەڵاوی بێ باوەڕان و وائەبێ سوودی موسوڵمانی تێدابێ . خوا ئەفەرموێ : ﴿ عسى الله أن يجعل بينكم وبين الذين عاديتم مودة ﴾ . ئێمە بێگومانین بێ باوەڕی واهەیە ڕەوشتی چاکترە لەڕاستی و دەست پاکیدا لەکەسانێ ناوی خۆیان ئەبەن بەموسوڵمان ، دۆستایەتی ئەو بێباوەڕەچاکتر بۆ سوودی مرۆڤایەتی و چاکترە لەبەکرێگیراوێکی دەست پیس خۆی بەئایین و بە ئیسلامەوە دەرئەخا .

ئێمەی موسوڵمان بڕوامان وایە زۆر بەناو موسوڵمان لەم سەردەمەدا بەتایبەتی کاربەدەستان دۆستایەتی بێ باوەڕان ئەکەن و خۆیانی پێوە هەڵئەکێشن ، بۆ بەردەوامی ئەو دۆستایەتیە بەرهەمی نیشتمانی موسوڵمانانیان ئەدەنێ بە بەرتیل نەوەك گەورە بێ باوەڕەکانیان دڵیان بڕەنجێ ، لەهەمان کاتدا خاوەنی ئەو بەرهەمە ڕوتاڵ و برسی و ئاوارەن. هەموو هێزی خۆیان بەکار ئەهێنن بۆ ئەوەی گەورە ڕۆژئاوایی و ڕۆژ هەڵاتیەکانیان بەهەڵقە لەگوێی خۆیانیان بزانن و بڵێن: ئافەرین . بەتایبەتی ئەمەریکا و ڕوسیا ، بۆ نمونە ئەگەر هەموو موسوڵمانان بەدەستی جوولەکە و ئەمریکا و ڕوسیا بکوژرێن جێگەی خۆیەتی کاربەدەستانی بەناو موسوڵمان بەئاشکرا و بەنهێنی لایەن

گریانن. بەنەوت و بەرێگە دانیان لەسەر زەوی موسولمانان ، بۆ ئەو دەست درێژییە یارمەتیان ئەدەن . بەڵام ئەگەر تاکەکەسێ لەوان بکوژرێ جیهان ڕوخاوە و موسولمانان تیرۆریست و ڕوخێنەرن .

دەست درێژی ئەمەریکای خوێن ڕێژ بۆ سەرگەلی لیبیای موسولمان و بێ تاوان لە (١٩٨٦/٤/١٥) لەنیوەشەودا بەبۆردومانکردنی چل فرۆکەی جەنگی بەگەورەترین چەکی کاول کەر . کوشتنی زۆرتر لەپەنجا کەس و بریندار کردنی ز ۆر تر لەسەد کەس و ڕوخاندن و سوتاندنی دەیان خانووی دانیشتوانی بێ چەك ، زۆربەی کوژراوان ژن ومناڵ بوون ، ئەو دەست درێژییە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر خوێن ڕێژی ئەمەریکا بەسەرۆکایەتی (ڕۆناڵد ریگن)، بەیاریدەی بەریتانیای کۆنە پیرەژنی داگیر کەر بەسەرۆکایەتی کچەکەی تاتشر ، بەر لەوان ڕوسیای بێ ئاین پەلاماری گەلی ئەفغانی دا بەناڕەوایی ، سێ ملیۆن کەس لەو نیشتمانە کوژران و ئاوارەبوون ، دۆستایەتی بێ باوەڕان لەهەموو کات و جێگەیەکا قەدەغەیە . تێکەڵاوی ئەوان بەدۆستایەتی بەڕەوا نەدراوە .

﴿ إلا أن تتقوا منهم تقاةً ﴾ مەگەر کەئێوەی موسولمان بترسن لەوەی لەلایەنی بێ باوەڕانەوەنەوەك تووشی شتێ ببن پێویستبێ خۆپاراستن بۆی ، ئەو کاتە بۆتان هەیە دۆستایەتی ئەوان بکەن بەدەم و بەزمان نەك بەدڵ ، ئەوەیش بەر لەدەسەڵاتی ئیسلام بوەوبەردەوامیشە لەو جێگانەدا موسولمانان هێزیان نەبێ .

ئەو خۆپاراستن و دۆستایەتی موسولمانان بۆ بێ باوەڕان کاتێ دروستە موسولمانان ڕازی بن کە فەرمانی خوا و قورئان بکرێن بەیاسای ژیان و بەدەستور بۆ هەڵس و کەوتیان و پێویستە موسولمانان یاریدەی بێ باوەڕان نەدەن بۆ ئەو کارانە بەزەقی دژی یاسای قورئان بن چونکە ئەبێتە هۆی بێ باوەڕیو ئەمانیش ئەگەر دۆستایەتیان بکەن ، وەك لەمەوبەر باسمان کرد یەکەم جار موسولمانان بێ هێز بوون خوای گەورە پاراستنی خۆیانی

بۆ ڕەوا کردن لەکاتی ترسدا (التقیة) هەتا ئاین جێگەی خۆی گرت و هێزی سەند ئەو کاتە قەدەغە کرا بۆیان ، بەڵام ئەگەر موسوڵمانان لەجێگەیە لەجەنگدا گیریان خوارد و بێ باوەڕان دەستیان بەسەردا کێشا بوون خۆپاراستنیان بۆ دروستە .

﴿ الجصاص ﴾ لەنامەی خۆیا (أحکام القرآن) مانای ئەو ڕستەیەی بەو جۆرە کردوە ، ئەفەرموێ : خۆپاراستن لەکاتی ترسدا هەتاڕۆژی دوایی ، یانی مەگەر ئێوە بترسن لەخۆتان و لەئەندامێکی لەشتان ، لەو کاتەدا دۆستایەتی بێ باوەڕان دروستە بە بەڕواڵەت ، لەدڵتانا بەنهێنی بڕواتان پێ نەبێ ، ئەفەرموێ زۆربەی زانایان لەسەر ئەم بیروڕایەن .

پێشەوا (الرازی) لەتەفسیرە گەورەکەیا ئەیگێڕێتەوە لەپێشەوا (الحسن البصری) ئەفەرموێ : خۆپاراستن (التقیه) لەکاتی ترسدا دروستە هەتا ڕۆژی دوایی بۆ باوەڕ داران ، رازی ئەو فەرمودەیەی بەصری لا چاکترە ، ئەفەرموێ لای شافعیەکان ئەگەر گیروگرفتی زۆر نالەبار ڕووی دا لەنێو موسوڵمانان و بێ باوەڕانا خۆ پاراستن ڕەوایە بۆیان . دارایی و سامان هەروەك خۆیان وایە . بەکورتی خۆپاراستن بەشێوەیەکی گشتی لای هەموو موسوڵمانان دروستە ، بەمەرجێ بەدەم بێ نەك بەدڵ .

لەبەر ئەوەی خۆپاراستن لەوکاتانەدا بۆ ئەو کارانە پەیوەندی بەدڵەوە هەیە موسوڵمانان پێویستە لەنێو خۆیانا و خوادا ڕاست بکەن ، بزانن خوا ئاگای لەهەموو شتێکی نهێنی هەیە، بۆیە ئەفەرموێ :

﴿ ویحذرکم الله نفسه ﴾ وەخوا ئێوە ئەترسێنی لەخۆی و لەسزای خۆی ، دوایی ئێوە خۆتان مەکەن بەنیشانە بۆ بێ فەرمانی خوا و بۆ دۆستایەتی بێ باوەڕان ، خوا هەموو شتێ ئەزانێ ، توانای بەسەر هەموو شتێکا هەیە ، پاداشت و سزای هەموو کەسێ ئەداتەوە بەگوێرەی کردەوەی خۆیان .

﴿ وإلی الله المصیر ﴾ وەبۆ لای خوایە گەڕانەوەی ئێوە ، ئەو کاتە ئەدرێ بەهەموو کەس پاداشت و تۆڵەی ئەو شتانەی کردوتانە .

لەمەوبەر خوای گەورە باسی قەدەغە کردنی دۆستایەتی بێ باوەڕانی کرد و هەڕەشـەی کرد لەوکەسانەی بەنهێنی تێکەڵاوی دوژمنانیان ئەکەن ; بۆیە خوا ئەفەرموێ :

﴿ قل أن تخفوا ما في صدوركم أو تبدوه يعلمه الله ﴾ تۆ بڵێ ئەگەر ئێوە داپۆشن شـتێ لەناو دڵتانایە لەدۆستایەتی بێ باوەڕان یائاشکرای بکەن ئەو شـتە لەدڵتانایـە خـوا ئەوانـە هەمووی ئەزانێ و هیچ شتێ لەخوا وون نابێ .

﴿ ويعلم مافي السماوات وما في الأرض والله على كـل شـيء قديـر ﴾ وەخـوا ئـەزانێ بەشتێ لە نێو ئاسمانەکاندایە و بەشتێ لەنێو زەویدان خودا توانا و دەسەڵاتی بەسەر هـەموو شتێکا هەیە و هەموو شتێ ئەزانێ ، بۆیە پێویستە بێ فەرمانی خوا نەکەن .

﴿ يوم تجد كل نفس ماعملت من خير محضراً ﴾ تۆ بیری ئەو ڕۆژە بکـەرەوە و بترسـە، هەموو کەسێ دەستی ئەکەوێ شـتێ کردویـەتی لـەو ڕۆژەدا لەچاکـە دەسـتت ئەکـەوێ بەئامادەکراوی لەلایەن خواوە .

﴿ وما عملت من سوء تود لو أن بينها وبينه أمداً بعيداً ﴾ وە شتی کردوێتی لەخراپـە و بۆی ئەهێنری و لای دائەنرێ ، سزای هەموویان لەنامەی کرداری خۆیا ئەبینێ ، ئەو کەسە ئاوات ئەخوازێ کە لەنێو خۆی و ئەو کارە خراپەدا هەبوایە ماوەیەکی زۆر دوور بوونایـە لەیەکتری بەئەندازەی دووری خۆرهەڵات و خۆر ئاوا و ، زۆر تریش .

﴿ ويحذركم الله نفسه والله رؤوف بالعباد ﴾ وەخـوا ئێـوە ئەترسـێنێ لـەخۆی ، هـۆی دووپات کردنەوەی ئەو ڕستەیە: یەکەمیان بـۆ قەدەغـەکردنی دۆسـتایەتی بـێ باوەڕانـە و دووهەمیان بۆ هاندانە لەسەر کردنی چاکە و گەڕانەوە لەهەموو خراپەیـە ، خـوا خـاوەنی بەزەییە بەبەندەکانی ، یەکی لەو بەزەییە ئەوەیە ئێوە ئەترسـێنێ لەسـزای خـۆی هـەتا ئێـوە خۆتان بپارێزن لەبێ فەرمانی خوا .

جوولەکەکان ئەیان ووت : ئێمە کوڕ و خۆشەویستی خواین ، گاورەکان ئـەیان ووت: ئێمە ڕێزی عیسا ئـەگرین لەبەرخۆشەویسـتی خـوا ، بـت پەرسـتان ئـەیان ووت : لەبـەر خۆشەویستی خوا بتەکانمان خۆش ئەوێ ، وەبۆ دەم کوت کردنی ئەوان ، خوا ئەفەرموێ:

﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٣١) قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ (٣٢) ﴾ .

﴿ قل إن كنتم تحبون الله ﴾ تۆ بلێ به بێ باوەڕان : ئەگەر ئێوەی جوولەکە و گاور و بت پەرست خواتان خۆش ئەوێ ، پێویستە بزانن خۆشەویستی بەدەم نابێ و بەکردارە .

﴿ فأتبعوني يحببكم الله ﴾ کەواتە ئێوە پەیڕەوی من بکەن لەبەجێ هێنانی فەرمانەکانی خوا و پاراستنی خۆتان لەکارە قەدەغە کراوەکان ، ئەو کاتە خوا ئێوەی خۆش ئەوێ ، خوا پاداشتی خۆشەویستیتان ئەداتەوە ، پەیڕەوی‌کردنی منیش بەشێکە لەخۆششەویستی خوا ، ئەو کەسەی لافی خۆشەویستی خوا لێی ئەدا و دژی ڕەوشتی پێغەمەر بێ درۆزنە و خوا بە درۆ ئەخاتەوە .

﴿ ويغفر لكم ذنوبكم والله غفور رحيم ﴾ وەپەیڕەوی من بکەن خوا لەگوناهەکانی ئێوە خۆش ئەبێ جێگەی بەرزتان پێ ئەبەخشێ و لای ئەو ڕێزدار ئەبن . خوا لێ خۆش بوونی زۆرە بۆ ئەو کەسانە پەیڕەوی من ئەکەن و باوەڕ لەدڵیانا جێگەی خۆی گرتبێ ، زۆر میهرەبانە لەگەڵیان بەمەرجێ ئێوە واز لەخۆشەویستەکانی خۆتان بهێنن .

پرسیار : ئەگەر کەسێ بڵێ : نەزانین بەپێغەمەرایەتی موحەمەد بیانویەکە ئەبێتە هۆی ڕزگاری ئێمە ، ئەگەر بۆمان دەرکەوتایە پێغەمەرە باوەڕمان پێ ئەهێنا ؟

وەڵام : لەوەڵامدا ئێمە ئەڵێین : هەرگیز بیانو بۆ کەسێ نیە دوای هەوا و هەوەسی خۆی بکەوێ و لاسایی باو و باپیرانی خۆی بکاتەوە مەگەر دوای خۆماندوو کردن و

تەماشـاکردن بـۆ لای بەڵگـەکان لـەسـەر پێغەمەرایـەتی موحەمـەد ، هەرکەسـێ بـەو چاوەتەماشای ئەوبەڵگانە بکا و داد پەروەر بێ باوەڕ ئەهێنێ بەبێ گومان بە پێغەمەر .

ئەگێڕنەوە کاتێ خوای گەورە ئەو ئایەتەی پێشـووی نـاردە خـوارەوە هـەندێ لـەدوو ڕووەکان وتیان : موحەمەد پەرستنی خۆی وەك پەرستنی خوا داناوە بەبێ جیـاوازی وەك گاورەکان بۆ خۆشەویستی عیسا ، ئیتر بۆ ئەبێ ئەوەی گاورەکان بێ باوەڕی بێ و ئـەوەی ئەمان چاکبێ بۆیە خوا فەرموی :

﴿ قل أطيعوا الله والرسول ﴾ تۆبڵێ ئێوە فەرمانبەرداری خوابن ، ، خوا بـەتاك و تەنـها بزانن و بێ هاوبەش و بێ وێنە بێ لاتان ، فەرمانبەرداری نێردراوی خـوا بـن لـەو یاسـا و دەستورانەدا کە بە ئێوەی ڕائەگەیەنێ ، نەك وەك گاورەکان ئەڵێن عیسـا کـوڕی خوایـە ، بەڵام من فروستادەم بەتەنها .

﴿ فإن تولوا فإن الله لا يحب الكافرين ﴾ دوایی ئەگەر ئێوە پشت بکەنە پەیڕەوی خوا و نێردراوی خوا ، بەفەرمانەکانیان هەڵنەسن ، دوایی بەڕاستی خوا خۆشی ناوێ بێ باوەڕان، واز هێنان لەخۆشەویستی وبێ فەرمانی پێغەمەر بێ فەرمانی خوایە ، ئەو کەسـانەی خـوا و پێغەمەر بەدۆسـتی خۆیـان بزانـن بـەنیازی پاکـەوە جێگـای سـوپاس و شـایانی چاکـەن . بەپێچەوانەوە ئەبنە هۆی سەر شۆڕی و ناسوپاسی بۆ ئەوان .

ئەو ئایەتانەی پێشوو بەڵگەن لەسەر ئەوەی هەڵسان بەدژی فەرمانی خوا بێ باوەڕیـە هەرچەندە گومانیان وابێ خوایان خۆش ئـەوێ ئەوکەسـەی لەهـەواڵ و مێـژووی خـاوەن نامەکان وورد بێتەوە بۆی دەرئەکەوێ زۆربەیان فروستادەیی و ڕاسـت گۆیـی پێغەمـەریان سەلماندووە ، بەڵام نەهاتونەتە ڕیزی ئیسلامەوە ، کەواتە ئەبێ بزانین بە تەنها ناسینی پێغەمەر بەس نییە ، بەڵکو ئیسلام بریتیە لەناسین و مل کەچ کـردن و کارپـێ کـردن و هەڵسـان بەهەموو فەرمانەکانی خوا و پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ .

ئلینی ئیسلام شێوازێکی تایبەتی خۆی هەیە پێك نایە بەبێ ئەو شـێوازە ئـەویش بریتییـە لەپەیڕەوی دەستوری خوا و پێغەمەر ، گەڕانەوەی تەواو بۆلای قورئان لە هەموو ڕووداوو

کاری ڕۆژانەدا . بەتایبەتی خوا بەتاك و تەنها دابنرێ و پەرستنی هەر بۆ ئەو بێ ، هەر ئـەو بەهەڵسوڕێنەری بوونەوەران دانرێ لەم گەردوونەدا و جگە لەخوا چاوەڕوانی کەسـی تـر نەبین ، هەموو کەسێ بەگوێرەی خۆی کاری بۆ دیاری کراوە .

پێغەمـەران لەهـەموان ئـەرکی سەرشـانیان زۆرتـرە ، دوای ئـەوان زانایـان دواتـر موسوڵمانان ، جگەی خوا ئەوانە هەموویان شایانی پەرستن نین ، ئازار و سوود نەبۆ خۆیان و نەکەسی تر ناگەیەنن ، ئەوشتەی خوا نەیانداتێ ناتوانن سەربەخۆ بۆخۆیانی بکەن .

خوای گەورە پاش ئەوەی ڕوونی کردەوە کە خۆشەویستی خوا بەتەنها جێگـەی خـۆی ناگرێ بەبێ پەیڕەوی کردنی پێغەمەران ، بەتایبەتی پێغەمەر ڕوونی ئەکاتەوە کـە هـەموویان پلەیان بەرزە و چینەکانیان بەرێزن لای خوا ، بۆیە خوا ئەفەرموێ :

إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحٗا وَءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمۡرَٰنَ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٣﴾ ذُرِّيَّةَۢ بَعۡضُهَا مِنۢ بَعۡضٖۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ إِذۡ قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ عِمۡرَٰنَ رَبِّ إِنِّي نَذَرۡتُ لَكَ مَا فِي بَطۡنِي مُحَرَّرٗا فَتَقَبَّلۡ مِنِّيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا وَضَعَتۡهَا قَالَتۡ رَبِّ إِنِّي وَضَعۡتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا وَضَعَتۡ وَلَيۡسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلۡأُنثَىٰۖ وَإِنِّي سَمَّيۡتُهَا مَرۡيَمَ وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٣٦﴾ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ

حَسَنٍ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا ۖ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا ۖ قَالَ يَٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا ۖ قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾

﴿ إن الله أصطفى آدم ﴾ بەڕاستی خوا ئادەمی هەڵبژاردوە کە باوکی هەموو ئادەمیزادە بۆ ئەوەی ناوی هەموو شتێك و سودیان بەو فێر بکا ، فریشتەکان ڕێزی لێ بگرن و کوڕنووشی بۆ ببەن ، وەخوا بیکاتە جێگە نشینی خۆی لەزەویدا و بیکا بەباوکی هەموو ئادەمیزاد و پێغەمەران .

﴿ و نوحاً ﴾ وخوا نوحی هەڵبژاردوە و کردویەتی بەباوکی دووهەمی ئادەمیزاد ، تەمەنی درێژ کردووە ، فێری کەشتی دروست کردنی کردووە .

﴿ وآل ابراهیم ﴾ وەخوا هەڵی بژاردوە منالەکانی ئیبراهیم وەك ئیسماعیل باپیرەی پێغەمەر و ئیسۆحاقی باپیری هەموو پێغەمەرانی جوولەکەکان و ، باوکی هەموو پێغەمەرانە.

﴿ وآل عمران ﴾ وخوا هەڵیبژاردووە منالەکانی عیمران ، وەك موسا و هارونی کوڕانی یەسهوو ، هەندێ لەزانایان ئەوڵێن مەبەست لەعیمران بری‌تیە لەعیمرانی باوکی مریەمی دایکی عیسا ، خوا ئەوانەی هەڵیبژاردوون بۆ پێغەمەرایەتی و ڕێزی داون بەسەر ئادەمیزادەکانی خۆیان و بەسەر :

﴿ علی العالمین ﴾ هەموو بوونەوەراندا ، کردونی بەخانەوادەی پێغەمەرایەتی ، کۆتایی هێناون بەپێغەمەری ئیسلام ، هەریەکە لەو پێغەمەرانە گەورە ترن لەهەموو ئادەمیزادی سەردەمی خۆیان ، پێغەمەری ئیسلام لەهەموویان گەورەترە بەگوێرەی فەرموودەی خوا : ﴿ وَما أرسَلناكَ إلاّ رحمةً للعالمین ﴾ وەئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە مەگەر بەخۆشی بۆ هەموو بوونەوەران .

ئەوئایەتە بەڵگەیە بۆ ئەوزانایانە کە پێـك هـاتوون لەسـەر ئـەوەی ئـادەمیزاد بەگشـتی گـەورەترن لەجنۆکـەکان . زۆربـەی زانایـان ئـەڵێن : ئـادەمیزاد بەشـێوەیەکی گشـتی لەفریشتەکان گەورەترن ، نەك یەکەیەکەی ئادەمیزاد لەوان گەورەترن . بـەڵام پێغەمـەران هەموویان لەفریشتەکان و جنۆکە گەورەترن .

ئەو ئایەتە باسی ئادەم و نوحی کردووە بەتەنها کە هەریەکەیان بۆ خۆیان هـەڵبژاردون ، باسی ئیبراهیم و عیمرانی کردووە بینە بنچینە بۆ هەڵبژاردنی کەسانی تر ، لەبەر ئەو ئایەتـە لەگەڵ زۆربەی ئایەتە پێشووەکان و ئایەتە داهاتووەکـانی تـر دەربـارەی عیسـا هاتوونەتـە خوارەوە وامان بۆ دەرئەخەن ئەو عیمرانە لەو ئایاتەدا باسی کراوەعیمرانی باوکی مریـەمی دایکی عیسایە . نەك عیمرانی باوکی موسا و هارون .

کەواتە خوای گەورە لەنەتەوەی عیمرانی باوکی مریەم عیسـای هـەڵبژاردووە کەبـەبێ باوك لەمریەمە پەیدا بووە کەلەپاش ئادەم شتی وا بۆ کەسی تر نەکراوە ، لەنێوان ئـەو دوو عیمرانەدا ماوەکەی (١٨٠٠) ساڵە ، هەندێ لەزانانیان لایان وایە ئەو عیمرانەی نـاوبراوە بریتیە لە باوکی موسا کەلەنەوەی ئەو موسا و هارون هەڵبژێراون . ئەو عیمرانەی بـاوکی موسا کوڕی (یصهر) کوڕی (فاهث) کوڕی (لاوی) کوڕی (یعقوب) کـوڕێ (ئیسـحاق) کوڕی (إبراهیم) .

عیمرانی باوکی مریەم کوڕی (ماتان) کوڕی (العادر) کوڕی (أبی هـود) کـوڕی (رب بابل) کوڕی (سالبان) کوڕی (یوحنا) کوڕی (أوشـا) کـوڕی (آمـوزر) کـوڕی (میشـك) کوڕی (خارقا) کوڕی (یونام) کوڕی (عرزیـا) کـوڕی (بـوزان) کـوڕی (سـافط) کـوڕی (إیشا) کوڕی (راجیم) کوڕی (سلیمان) کـوڕی (داود) کـوڕی (إیشـا) کـوڕی (عویـل) کوڕی (سلمون) کوڕی (یاعز) کوڕی (یخشـون) کـوڕی (عمیـاد) کـوڕی (دام) کـوڕی (خضروم) کوڕی (فارض) کوڕی (یعقوب) کوڕی (ئیسحاق) کوڕی (ئیبراهیم) ە .

﴿ ذرية بعضها من بعض ﴾ منداڵەکانی ئیبراهیم و عیمران بریتـین لـە توخـم و بێچـوی هەندێکیان لەهەندێ تریان ، بنەماڵەکانی ئیبراهیم و عیمـران لـەیـەك بنچینـەن ، خۆیـان و

باوك و باپیریــان پەســەند و دلــێر و بەرێزن . ئیــبراهیم و منالــەکانی لەنــەوەی نوحــن ، منالەکانی عیمران لەنەوەی ئیبراهیمن ، ئیسماعیل و ئیسحاق لەئیبراهیمن ، نوح لەنـەوەی ئادەمە ، هەروەها ئەو زنجیرەیە بەپاکی هاتوونەتە خــوارەوە ، هـەموو پێغەمـەران بەموسـا و بەعیسا و بەپێغەمەری ئیسلامەوە ئەچنەوە بۆ سەر ئیبراهیم .

﴿ والله سميع عليم ﴾ وەخوا ئەبیستێ گفتوگۆی پڕوپوچی جوولەکـەکان کـە ئـەڵێن : ئێمە کوڕو خۆشەویستانی خواین ، گاورەکان ئەڵێن ، عیسا کوڕی خوایە یا هەر خوایەی، یاسێ هەمی سێ خوان ، ئەزانێ چ کەسێ شایانی ئەوەیە هەڵبژێردرێ بۆ پێغەمەرایەتی .

﴿ إذ قالت إمرأة عمران ﴾ تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە کە (حنە)ی کچی (فاقوز)ی ژنی (عیمران) ی کوڕی (ماتان) لەکاتی دووگیانیدا ووتی :

﴿ رَبِّي إِنِّي نَذَرتُ لَكَ ما في بَطني ﴾ ئەی پەروەردەکەری مـن بەراسـتی مـن پێویستیم کرد لەبەرگەورەیی تۆ شتێ لەنێو سکمایە بەئازادکراو و پوختە بۆ خزمەتی تۆ و پەرســتنی تۆ ، لەهیچ کارو فرمانێ تر جگە لەخزمەتی بەیتولموقەدەس بەکاری نەهێنم .

﴿ فتقبل مني إنك أنت السميع العليم ﴾ دوایی وەری بگرە لەمن ئەو شــتەی پێویســتم کردووە لەسەر خۆم کەبیکەم بە خزمەتکاری بەیتولموقەدەس . بەڕاســتی تـۆ هـەموو شتێ ئەبیستی لە پاڕانەوەی بوونەوەران ، هەموو شتێ ئەزانی ، لەشاراوەی دڵــی هـەموو کـەس ئاگاداری .

پوختەی مانای ئەو ئایەتە و ئەو ڕووداوە بەم جۆرەیە : (قوقـاز) ی کـوڕی (قبیـل) دوو کچی هەبوو ، یەکێ لــەو کچانـە نـاوی (حنـە) بـوو ، عیمـران کەزانایـەکی بـەناویانگی جوولەکەکان بوو مارەی کرد (مریەم) ی دایکی عیسای لێ پەیدا بوو ، کچەکــەی تریـان ناوی (إیشاع) بو زەکەریا مـارەی کـرد (یـەحیا)ی لێ پـەیدا بـوو ، واتـە مریـەم و یـەحیا پوورزای یەکترین لەدایکەوە.

﴿ فلما وضعتها ﴾ دوایی کاتێ ژنەکەی عیمران منالەکەی دانا بۆی دەرکەوت کچە ، بەگوێرەی دام ودەزگای ئاینی جولـەکەکان ئەو کەسانەی خزمــەتی کەنیســەیان بکردرایـە پێویستبو نێرینە بێ ، بۆیە دایکی مریەم بەخەفەتەوە :

﴿ قالت ربي إني وضعتها أنثى ﴾ ووتـی : ئـەی پەروەردەکـەری مـن ، لـەدڵی خۆیـا شەرمەزار و خەفەتبار و داوای لێبوردنی کرد کە بـەئاواتی خـۆی نەگەیشـتووە ; چونکـە مناڵەکە نێرینە نی‌یە بۆیە ووتی ، بەڕاستی ئەو شتەی لەسکما بـوو دامنـاوە مێینەیـە ، ئـەو ڕاونیازە لەکاتێکا بوو عیمرانی مێردی کۆچی دوایی کردبوو ، بەڵێنی دایکـی مەریـەمیش بەو جۆرە بوو کە ئەو بێچوەی ئەی بێ بیکا بە خزمـەتکاری بەیتولموقـەدەس ، ئـەو جـۆرە بەڵێنە دروست و بایەخدار بوو لای ئاینی جوولەکـەکان ، بـەڵام لـەئاینی ئیسـلامدا ڕەوا نی‌یە ، دوای چاوەڕوان کردن کەکوڕی بێ هەتا بتوانێ بەڵێنەکەی خۆی بباتە سەر و بیکـا بەخزمەتکاری مزگەوت کەبۆی دەرکەوت بەشەرمەوە ووتی :

﴿ والله أعلم بما وضعت ﴾ وەخوا زاناترە لەمن و لەهەموو کەسی تر بەو شـتە مـن دام ناوە . ئەو مانایە کاتێ بەو جۆرە ئەکرێ ڕستەکە ﴿ وضعتُها ﴾ بێ بەتای بۆردار.

هەندێ لەزانایان ئەڵێن : ئەو ڕستەیە پەیوەندی بەپێشـەوەی خـۆی نیـە و تەواوکـەری گفتوگۆی ژنی عیمران نی‌یـە ، بـەڵکو پەیوەسـتە بەڕسـتەی دوای خۆیـەوە سـەربەخۆن و فەرمودەی خوان ، ماناکەی بەم جۆرەیە : وەخوا زاناترە لەهەموو کەس بـەو شـتەی ژنـی عیمران داویناوە ، هەر خوائەزانێ کە خۆی ئەزانێ ئـەو مناڵـە بـەچ بلیمـەتێ ئـەکا و بـەچ نیشانەیەکی سەسوڕێنەری ئەکا بۆ هەموو ئادەمیزاد ئەو کچە بەبێ مێرد عیسـای لێ ئـەبێ ، ژنی عیمران نازانێ بەو کارانە بۆیە خەفەتبارە بەوەی کچی بووە ، نهێنی زۆر گـەورە لـەو کچەدایە ژنی عیمران نایزانێ .

﴿ وليس الذكر كالأنثى ﴾ وەئەو نێرینەیە ئەو داوای کردووە وێنەی ئـەم مێینەیـە نی‌یـە من بەوم بەخشیوە ، بەڵکو ئەو کچە لەزۆربەی پیاوان گەورەتر و بەڕێزترە ، یەکێکە لـەو چوار ژنە کەگەورەترینی هەموو ژنـانن ، • فاتیمـەی زەهـراء ، ئاسیەی ژنـی فیرعـەون ، خەدیجەی دایکی پێغەمەر ،مەریەمەی کچی عیمران ) ، فـەرموودی خـوا کۆتـایی پێهـات دووبارە دایکی مەریەم دێتەوە کایە و ئەڵێ :

﴿ وإني سميتها مريم ﴾ وەبەڕاستی مناوی ئەو کچەم نا مەریەم ، مانای ووشەی مەریـەم بەزمانی عیبری پارسا و خوا پەرست ، یا کار گوزارێ بۆ خوا ئیش بکا ، بەو نیازەی خـوا بیپارێزێ و خۆی وەك ناوەکەی دەربچێ و ببێ بەخوا پەرست .

﴿ وإني أعيذها بك و ذريتها ﴾ وەبەڕاستی من پەنای پێ ئەگرم ئەو کچەی ناوم نـا بـە مەریەم بەهۆی چاودێری تۆوە خوایە خۆی و بەچکەکەی ئەی هاوێژمە سێبەری میـهرەبانی خۆتەوە بیانپارێزی .

﴿ من الشيطان الرجيم ﴾ لەشەیتانی دوور خراوە لەقاپی میهرەبانی تۆ ، خوای گـەورە نزاکەی وەرگرت . زۆربەی دایك و منالْ شەیتان کاریان تێ ئەکا ، جگەی مەریەم و عیسا خوا پاراستنی لەشەیتان بەهۆی نزای دایکی مەریەمەوە .

﴿ فتقبلها ربها بقبول حسـن ﴾ دوایـی پـەروەردگاری مەریـەم مەریـەمی وەرگـرت و دەستوری فەرموو بەوەرگرتنی لەبری ئـەو نـەزرە و لـەجێگـەی نێرینـە داینـا بـۆ خزمـەتی مزگەوت بە وەرگرتنێکی زۆر شیرین کـە وەرگرتنـی بـوو بەخزمـەتکاری بەیتولموقـەدەس لەجیاتی ئەو کوڕەی دایکی مەریەم بەتەمای بوو .

﴿ وأنبتها نباتـاً حسـناً ﴾ وەپەروەردەکەرەکـەی مەریـەمی دروسـت کـرد و ڕوانـدی بەڕواندنێکی چاك و شـیرین ، پـەروەردەی کـرد بەڕەوشـتێکی خـاوێن و داوێـن پـاکی و گەشەی پێ کرد بەبێ کەم و کوڕی و زۆر بەڕێزەوە و بەسەر بەرزیەوە .

﴿ وكفلها زكريا ﴾ وە زەکەریا مەریەمەی بردەلای خۆی بۆ بەخێو کردنـی ، زەکـەریا لەبنەمالّەی هارونە، زەکەریا ئەو کاتـە سـەرۆکی هەیکـەلی جوولەکـەکان بـوو ، مێردی پووری بوو ، زۆر گرنگی بەبەخێو کردنـی ئـەدا ، هەیکـەل ئـەو جێگەیـە دیـاری کـراوە لەلایەن سەرۆکی کەنیسەوە بۆ وەرگرتنی ئـەو شـتانە لەسـەر خۆیانیـان پێویسـت ئـەکرد لەئاژەلّ و دارایی و شتی تر ، زەکەریا دایەنی بۆ مەریەم گـرت بـۆ شـیر پێدانـی و بـەخێو کردنی .

﴿ كلما دخل عليها زكريا المحراب ﴾ هەموو كاتێ زەكەریا بچوایە بۆ لای مەریەم لەهۆدەكەیا ، میحراب جێگەیە بوو لەمزگەوت كەمەریەمەی لێدائەنیشت ، ئەو ووشەیە بەمانای جەنگ كردنە لەگەڵ شەیتان ، بەرێز ترین جێگەیە لەمزگەوتا . بەمانا جێگەیە لەمزگەوتا ، بەمانای جێگەی سەربڕین هاتووە كەزەكەریا ئەچو بۆلای مەریەم بۆ هەواڵ پرسینی :

﴿ وجد عندها رزقاً ﴾ دەستی ئەكەوت و ئەیبینی لای مەریەمە خواردەمەنی شایانی ئەو كاتە ، ئەو خواردەمەنی‌یە هەرشتێ بێ گرنگ نی‌یە ، بەلاّم بەشێوەیە بۆی ئەهات ئەوەندە گرنگ و بەرێز بوو جێگەی سەرسوڕمان بوو ، بۆیە زەكەریا ئەی ووت :

﴿ قال يامريم أنى لك هذا قالت هو من عند الله ﴾ زەكەریا ووتی : ئەی مەریەم لەچ جێگەیەكەوە بۆ تۆ دێ ئەو خواردەمەنی‌یە لەم ناوەختەدا ، مەریەم ووتی : ئەو خواردەمەنی‌یە لەلایەن خواوە بۆم دێت .

﴿ إن الله يرزؤق من يشاء بغير حساب ﴾ بەڕاستی خوا ڕۆزی و خواردەمەنی ئەدا بەكەسێ ئارەزوی هەبێ بەبێ ژمارە و بەبێ چاوەڕوان كردن بەمیهرەبانی خۆی ، جێگەی سەرسوڕمان نی‌یە هیچ كارێ بۆ خوا .

لەوكاتەدا زەكەریا ئەو ڕووداوەی بینی لەمەریەمەوە بەو جۆرە باسكرا بەدڵیا هات و ئاواتی خواست كە خوا منداڵێكی بداتێ ببێتە جێگە نشینی بۆ هەڵسوڕاندنی كاروباری ئاینی و سەرۆكایەتی هەیكەلی سولەیمان ، چونكە ئەترسا پاش خۆی جوولەكەكان پشت بكەنە ئاین و دەست بكەن بەستەم كردن و بلاّوكردنەوەی گێرەشێوێنی لەهەژاران ، بەتایبەتی كەس و كاری خۆی و ئامۆزاكانی و ئامۆژگاری كەرانی ئایین ، ژنەكەیشی نەزۆك بوو ، كەچی نەبوو بەكۆسپ لەبەردەما بۆئەوەی بەتەمای منالّ نەبێ ، چونكە دلّی بە توانا و میهرەبانی خوا توند بوو ، بۆیە لەخوا پاڕایەوە بۆ ئەو مەبەستە ، وەك ئەفەرموێ :

هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٨﴾ فَنَادَتْهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٌ يُصَلِّي فِي ٱلْمِحْرَابِ أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ مُصَدِّقًۢا بِكَلِمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٣٩﴾ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٌ وَقَدْ بَلَغَنِيَ ٱلْكِبَرُ وَٱمْرَأَتِي عَاقِرٌ قَالَ كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ﴿٤٠﴾ قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّيٓ ءَايَةً قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا وَٱذْكُر رَّبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِٱلْعَشِيِّ وَٱلْإِبْكَٰرِ ﴿٤١﴾ وَإِذْ قَالَتِ

﴿ هُنالِكَ ﴾ لەوکاتەدا زەکەریا ئەو خواردەمەنی و میوەیەی بینی لەجگەی کاتی خۆیا کە شایانی ئەو کاتە نەبوو ، یا لەو جێگەیەدا مەریەم و زەکەریا دانیشتبون زەکەریا بەچاوی خۆی بینی ئەو کارە بەکەس نەکراوە لەبەردەم مەریەمەدا ئارەزوی بۆ منالێ جولا وێنەی مەریەمە بێ ، بڕوای بەتینی هەبوو باپیریشبێ خوای گەورە بەتوانای خۆی منالێکی پێ ببەخشێ .

﴿ دعا زكريا ربه ﴾ زەکەریا پاڕایەوە لەپەروەردگاری خۆی لەو جێگای پەرستنەدا بەدلێکی پڕ لەباوەڕەوە .

﴿ قالَ رَبِّ هِبْ لي من لَدُنْكَ ذُريّة طيبة ﴾ زەکەریا ووتی : ئەی پەروەردەکەری مـــن ، تۆ ببەخشە بە من لەلایەن خۆتەوە وەهــەر بـەتوانای خـۆت بـەبێ هۆیـەکی تـری ئاسـایی منالێکی بەفەڕ و پیرۆز و ڕەوشت خاوێن ، وێنەی ئەو منالەی بەخشیت بە حەنەی دایکــی مەریەم کە ئەو هەموو کارە نائاسایی‌یەی لێوە پەیدا بووە .

﴿ إنك سميع الدعاء ﴾ بەڕاستی تۆ بەبەخشندەیی خـۆت ئەبیسـتی پاڕانـەوە و وەڵامـی ئەدەیتەوە .

﴿ فنادته الملائكة وهو قائم في المحراب ﴾ دوایی فریشتەکان بـانگی زەکـەریایان کـرد ، ئەو فریشانە هەر کەسێ بێ و ژمارەیان هەرچەندێ بێ مەبەستەکە نـاگۆڕێ ، لـەو کاتـەدا زەکەریا ڕاوەستابوو لەمزگەوتا نوێژی ئەکرد ، یا لەهۆدەکەی مەریەم دا وەستابوو بۆ نوێژ کردن .

﴿ إن الله يبشرك بيحي ﴾ بەڕاستی خـوا مـوژدە ئـەدا بـەتۆ بـەمنالێ نـاوی یەحیایـە ، منالێکی وایە ناو و ئۆجاخی باوکی زیندوو ئەکاتـەوە ، ئەبێتـە هـۆی زینـدوو کردنـەوەی ئاینەکەی و پەرە پێدانی .

﴿ مُصَدِقاً بِكَلِمَةٍ مِنَ اللهِ ﴾ لەکاتێکدا ئـەو منالـە بەڕاسـت ئـەگیرێ و بـاوەڕ ئـەهێنێ بەبوونی ئەو پێغەمەرە بەفەرموودەیە لەلای خواوە پەیدا دەبێ بەبێ باوك بەڕستەی ﴿ كُنْ ﴾ هەندێ لەزانایان ئەڵێن : ووشەی ﴿ كلمـة ﴾ یـاریدەی ئـەوە ئـەدا بـۆ هـەموو نیشـانە و فەرمانێکی خوا بێ نەك تەنها بۆ عیسا .

﴿ وسيّداً ﴾ وەلەکاتێکا ئەبێ بەپیاوێکی گەورە لەزانست و ئایین پەروەری و ڕەوشـت بەرز لەنێو خزمەکانیدا ، بەئارام و خوا ترس ، بەو بۆنەوە خوا یـەحیای کـرد بەپێغەمـەر و سەرۆکی هۆزەکەی بەجۆرێ بیری لەگوناە نەکردەۆتەوە و بەدڵیا هاتوچۆی نەکردووە .

پرسیار / بۆ خوای گەورە بەیـەحیای فـەرمووە : ﴿ سـيّد ﴾ وە بەپێغەمـەری فـەرمووە ﴿ عبد ﴾ ؟

وەلاَم / بێژرا بەیەحیا بۆ ژن ناهێنی و گوێ درێژێ نــاکرێ و خانویــە پەیداناکــەی بـۆ خۆت ، ووتی : من نامەوێ پێم ببێژرێ ســەیدی گوێدرێـژ و خــانوو ، نـاوی گـەورەییم ناوێ. خوای گەورە بەبۆنەی ئەوانەوە ناوی برد بەسەید ، وەخوا ناوی پێغەمــەری بـردووە بەبەندە و بەستویەتی بەخۆیەوە بەفەرموودەی ﴿ سبحان الذي أسرى بعبــده ﴾ وەدروسـت نیيە بلێ ﴿ أســرى بسـيده ﴾ ، بــەلاَم پێغەمــەر ﴿ﷺ﴾ نـاوی خـۆی بـردووە بەسـەيد و ئەفەرموێ : ( أنا سيد ولد آدم ولا فخر ) .

﴿ وحصوراً ونبياً مــن الصــالحين ﴾ وەلــەکاتێکا یــەحیا پیــاوێکی خۆگـر و خـۆ پـارێز لەئارەزواتی جیهانی و هەرگیز بــیری بـۆ نەئـەکرد ، نزیکــی ژنــان نەئەکـەوت ، لـەگـەڵ ئەوانەدا یەحیا پێغەمەرێ ئەبێ پەیدا ئەبێ لەتۆوی پیاو چاکان و پێغەمەران .

﴿ قال ربي أنى يكون لي غلام ﴾ زەکەریا ووتی: ئەی پەروەردگار من لـەکوێ و چــۆن بۆم پەیدائەبێ کوڕ ؟ بەگوێرەی تاقی کردنەوە بەدووری زانی منالّبون بۆی .

﴿ وقد بلغني الكبر وأمرأتي عاقر ﴾ وەبەڕاستی تووشی من بــووە پـیری و تەمــەنم زۆرە بەجۆرێ لەکاتی ئەو سەردەمەدا ئەو تەمەنە شایانی ئــەوە نــەبوو منــاڵی تێدا پــەیدا ببــێ . تەمەنی زەکەریا چەند بووبێ گرنگ نیيە ، هەندێ لەزانایان ئەڵێن : تەمەنی خۆی یا (٩٩) یا (١٢٠) ساڵ بوو ، تەمەنی ژنەکەی (٩٨) ساڵ بوو .

﴿ وأمرأتي عاقر ﴾ وەژنەکەیشم نەزۆکە و مناڵی نابــێ ، نـازانم جـوان ئەبێتــەوە هــەتا مناڵی ببێ یا هەر بەپیری مناڵی ئەبێ ؟

﴿ قال كذلك الله يفعل ما يشاء ﴾ خوا فەرمووی : هەر بەوجۆرە هەن و تەمەنتان زۆرە کوڕتان پێ ئەبەخشم ، هەموو شتێ لای من ئاسانە ، گران بێ لای ئێوە یان نە ؟ خـوا ئــەو شتەی ئارەزوی بکا ئەیکا ، ئاسایی بێ بەگوێرەی تاقی کردنــەوەی ئــادەمیزاد یــان نــە ! ، لەبەرئەوەی پەیدابوونی مناڵ لەمنداڵداندا کارێکی نهێنیــە ، زەکــەریا وای پێخـۆش بــوو لەپەیدا بوونی ئەو مناڵەدا خوا ئاگاداری بکا ، بۆیە .

﴿ قال ربّ إجعل لي آية ﴾ زەکەریا ووتی : ئەی پەروەردەکەری مـن تـۆ بۆمنـی دانـێ نیشانەیە لـەسەر دروست بوونی ئەو منداڵە لـەمنداڵدانی ژنەکـەمدا و بـزانم بـەکاتی پـەیدا بوونی :

﴿ قال آيتك أن لا تكلم الناس ثلاثة أيام إلا رمزا ﴾ فەرمووی نیشانەی پەیدابوونی ئـەو منالّە بۆتۆ ئەوەیە کە گفتوگۆ لـەگەڵ ئادەمیزاد ناکەی سێ ڕۆژ و زمانت لـەو سـێ ڕۆژەدا ناچەرخێ بۆ گفتوگۆ کردن مەگـەر بەئیشـارەت . بـەلاّم زمـانت ئەچـەرخێ چۆنـت پـێ خۆشبێ بۆ پەرستن و سوپاسی خوا ، بۆیە خوا ئەفەرموێ :

﴿ وأذكر ربك كثيراً ﴾ وەتۆ یادی پەروەردەکرەی خۆت بکەرەوە بەزۆری لـەوکاتانەدا کە تۆ ناتوانی گفتوگۆ لـەگەڵ ئادەمیزادا بکەی و زمـانت بەسـتراوە ، خـوا بـۆ ئـەو یـادە زمانت پاراو و ڕەوان ئەکا ، مەبەستەکەی هەر بۆ گفتوگۆیە لـەگەڵ ئادەمیزاد .

﴿ وسبح بالعشي والأبكار ﴾ وەتۆ خـوا بەگـەورە بگـرە و پـاکی بکـەرەوە لەهـەموو ناتەواوی و نوێژ بکە لـەنێوەڕۆدا هەتا ئێوارە ، وەلـەبەیانیـەوە هـەتا چێشـتەنگاو ، زەکـەریا پاش ئەو سێ ڕۆژە زمانی کرایەوە و موژدەی دا بەخێزانەکەی بەپەیدا بوونی منداڵ .

پرسیار / زەکەریا داوای بەخشـینی منـالّی کـرد لـەخوا پرسـیاری شـتێکی گونجـاوی کردوە، دوایی چۆن بەدووری زانی کاتێ فریشتەکان موژدەیان پێدا ؟

وەلاّم / ئەو گفتوگۆیە بەگومان دووری نەبوو ، بەڵکو بەگەورە زانینـی توانـای خوایـە کە لـەسروشت و تاقی کردنەوەوە دوورە .

هەندێ لـەزانانیان ئەڵێن : گفتوگۆ نەکردنی زەکەریا لـەگەڵ ئـادەمیزاد لـەبـەر فـەرمانی خوا بوو بەتەنها ، بۆ ئەوەی خەریکی پەرستن و سوپاسی خوابێ ، زمانی نەبەسـترابوو ئـەو گفتوگۆیەی زەکەریا لـەگەڵ خوای گەورە بێ ڕاستەوخۆ ، یا بەهۆی جبرەئیلەوە بـێ لـەو ڕووداوە هیچ شتێ ناگۆڕێ ، ئەوەی گرنگبێ ئەو ڕووداوە پەیدا بووە .

خوای گەورە کەباسی ژنی عیمرانی فەرموو لـەگەڵ باسی ڕێزگرتنـی مەریەمـەی کچـی بەکورتی ، بۆ جارێ تر باسی ئەکاتەوە بەدرێژی ، ئەفەرموێ :

وَإِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصْطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٢﴾ يَٰمَرْيَمُ ٱقْنُتِى لِرَبِّكِ وَٱسْجُدِى وَٱرْكَعِى مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ۚ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَٰمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٤﴾

﴿ وإذ قالت الملائكة يامريم ﴾ موحەمەد تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە هەندێ لەفریشتەکان ووتیان : ئەی مەریەم ، ئەو گفتوگۆیەی فریشتەکان لەگەڵ مەریەم ڕاستەوخۆ بوو ، ئەوەیش ئەوەناگەیەنێ کەمەریەم پێغەمەر بێ ، ئەوەیش بیروڕای هەموو زانایانە کەژن نەکراوە بەپێغەمەر . خوا ئەفەرموێ : ﴿ وما أرسلناك من قبلك إلا رجالاً نوحي إليهم ﴾ ئێمە ڕەوانەمان نەکردووە لەپێش تۆ مەگەر پیاوان ئێمە سروشمان ناردووە بۆ لایان ، ئایەتی (١٠٩) لەسورەتی یوسفدا ، خوای گەورە جگە لەئادەمیزاد وەحی بەکارهێناوە، وەك سروش بۆ لای دایکی موسا و بۆلای مێش هەنگ و هیچ کەسێ نەی ووتووە پێغەمەرن ، بەڵام بەبێ گومان مەریەم دۆستی خوایە یانی (ولیة) ، ناوەرۆکی ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر پەیدا بوونی کاری بەهەموو کەس نەکراو لەسەر دەستی مەریەم ، یانێ (کرامت) بەڵگەیشە لەسەر ئەوەی مەریەم دۆستی خوایە ، بۆیشمان ڕوون ئەبێتەوە باوەڕنەکردن بەبونی

دۆستانی خـوا بەشـێوەیەکی گشـتی ، بـاوەڕ نـەکردن بـەکارێ بەهـەموو کـەس نـەکراو لەدۆستانی خواوە هەندێ جار دەرچوونە لەئیسلام.

﴿ إن الله أصطفاكِ ﴾ بەڕاستی خوا تۆی هەڵبژاردووە بۆ وەرگرتنی تۆ بەئازاد کردنـت بۆ خزمەتی خانەی خوا لەمەوبەر کەهەر بۆ پیاوان درووستبووە ، خواردەمەنی و میوەی بۆ سازاندنی بەبێ ماندوو بوون .

﴿ وطهرك ﴾ وەخوا تۆی پاککردۆتەوە لەپیسـایی حـەیز و لـەکاری بـێز لێ کـراوە و شایەتیت بۆ ئەدرێ کە تۆ پاك و داوێن پـاکی و لەهـەموو گومانـێ دووری لـەبارەی ئـەو منالّەتەوە .

﴿ وأصطفاك على نساء العالمين ﴾ وەخوا تۆی هەڵبژاردووە و ڕێزیداوی بەسەر هەموو ژنانی سەردەمی خۆت ، پێغەمەرێکت لێ پەیدا ئەبێ بـێ چوونـە لای پیـاوان بـۆ لای تـۆ ، ڕاگوێی کردووی و فریشتەکانی ناردووە بۆ لای تۆ و ڕزگاری کردوی لەبوختان ، خۆت و کوڕەکەتی کردووە بە نیشانەی زۆر گەورە بۆ هەموو ئادەمیزاد .

لەو ڕستانەوە وا دەرئەکەوێ کە مەریەم گەورەترینی ژنانی هەموو ئادەمیزادە ، هەندێ لەزانایان ئـەڵێن : فاتیمـەی کچـی پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ لەهـەموو ژنـان گـەورەترە ، چونکـە پارچەیەکە لـە پێغەمەر ، کەواتە مەریەم گەورەترینی ژنانی سەردەمی خۆیەتی ، هـەرچۆنێبێ موسوڵمانان بەگشتی پێك هاتوون لەسەر ئەوەی چوار ژن هەن لەهەموو ژنـانی ئـادەمیزاد گەورەترن (ئاسیەی کچی موزاحیم ژنی فیرعەون ، مەریەمەی کچی عیمران دایکی عیسا، خەدیجەی هاوسەری پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ، فاتیمەی کچی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ) .

ئاینی پیرۆزی ئیسـلام بـەهۆی ئـەو ئایەتانـەوە گـەورەترین بەڵگـەی داوە بـە دەسـت نوێنەرانی گاورەکانی نەجرانەوە دەربارەی خاوێنی و داوێـن پـاکی مەریـەم و عیسـا هـەتا هەتایە . بەپێچەوانەی جولەکەکان کەبەدەیان بوختانیان بۆ دروست کردوون .

لەبڕبڕەی ئاینی ئیسلامە خاوێنی و بێ گەردی مەریـەم ، پـەلاماردانی مەریـەم بـەکاری خراپ دەرچوونە لەئاینی ئیسلام ، بەپێچەوانـەی بـڕوای جوولـەکـەکان کـە پـەلاماردانی

مەریەم و عیسا بەگومانی خراپ لـــەکانگای بـاوەڕی ئاینیانـەوە دەرئـەچێ و دەسـتی پـێ کردووە .

﴿ یامریم اقنتي لربك ﴾ ئەی مـــەریەم تـۆ پەرسـتن بـۆ پەروەردەکـەری خـۆت بکـە و فەرمانبەرداری ببە بەنیازی پاکەوە .

﴿ وأسجدي وأركعي مع الراكعين ﴾ وەتۆ سەر بنێرە سەر زەوی بـۆ نوێـژ کـردن و ، کوڕنوش ببە بۆ خوا بەترسەوە بۆ خوا لـەگەڵ کوڕنوش بەران بەکۆمەڵ .

بەو ئایەتە خوا فەرمانی داوە بەمەریەم بۆ پەرستنی خوا ، بۆ ئەوەی خۆی ووریا بکاتـەوە و خۆی ئامادە بکاو چاوەڕوانی ڕووداوێکی زۆر گرنگ بکـا کەلـەدایك بوونـی عیسـای کوڕی لـە خۆی بـەبێ بـاوك ، ڕوون و ئاشـکرایە بۆهـەموو کـار و ڕووداوێکـی گرنـگ پێویستە خۆی بۆ ئامادە بکرێ بەر لەپەیدابوونی ، ئەویش لـەدایك بوونی عیسایە لــێرەدا ، خوای گەورە ڕوو ئەکاتە پێغەمەر :

﴿ ذلك من أبناء الغيب ﴾ ئەو شتەی تۆ ئەیخوێنیتەوە بەسەر ئادەمیزاد بەگشتی و بەسەر نوێنەرانی گاورەکـان بەتایبـەتی ، وەك چـیرۆکی مەریـەم و دایکـی مەریـەم ، بەسـەرهاتی زەکەریا و یەحیا کەلەهیچ نامەیەکا نەت خوێندووەتەوە و نەت بیستوە لـەهیچ کەسێکەوە لەهەواڵە نادیارییەکان ، بەهۆی پەیامەوە زانینیان بۆهاتووە کارێ بەکەس نەکراوە

﴿ نوحيه إليك ﴾ ئێمە بەسروش و بەخورپەی دڵ بـەهۆی جبرەئیلـەوە ناردوومانـە بـۆ لای تۆ .

ئەوانەی باسکران بەڵگەی بەهێزن لـەسەر فروستادەیی تۆ بۆ سەرشۆڕکردنی دوژمنـانی تۆ ، لـەسەر ڕاست گۆیی تۆ ، بۆیە نوێنەرانی گاورەکانی نەجران نـەیان توانـی بەرپـەرچت بدەنەوە .

﴿ وما كنت لديه إذ يلقون أقلامهم أيهم يكفل مريم ﴾ وەتۆ موحەمەد لەلای زاناکـانی جوولەکەکان نەبووی لە بەیتولموقەدەس کاتێ فڕێ ئەدەن تیرەکانیـان بـۆ دیـار کردنـی چ

کەسێ لەوان بەخێو بکا مەریەم و بیگرێتە لای خۆی و پەروەردەی بکا ، زانایان هەریەکەیان بیرێکی تایبەتیان هەیە لەمەبەست لە ( أقلام) ئەوەی شایانێ بریتیە لەو دارانە فڕێیان ئەدا بۆ دیاری کردنی هەریەکە لەمالومەکان بۆ پەروەردەکردنی مەریەم .

﴿ وما كنت لديهم إذ يختصمون ﴾ وەتۆ لەلای ئەوان نەبووی کاتێ ئەوان ناکۆکی و ئاژاوەیان ئەکرد لەگەڵ یەکتری لەسەر بەخێو کردنی مەریەم ، بەڕاستی هەواڵدانی تۆ بەو ڕاستیانە لەبارەی مەریەم و زەکەریا کە تۆ نەت خوێندووە لەهیچ نامەیەکا و نەت بیستووە وائەگەیەنێ تۆ خۆت لەوێ بووی کەچی نێوانی تۆ و ئەوان چەند سەد ساڵێکە ، دیارە خۆ تۆ لەوێ نبووی ، کەواتە بەسروش لەلایەن خواوە بۆ تۆ هاتووە .

پوختەی فڕێدانی ئەو دارانە بۆ دیاریکردنی کەسێ کەمەریەم بەخێو بکا بەم جۆرەیە :

بەڕاستی کاتێ کە حەنەی ژنی عیمران مەریەمەی لێ پەیدا بوو ، پێوبستی کردبوو بیکا بەخزمەت گوزاری بەیتولموقەدەس ، مریەمەی لێ پەیدا بوو دوای مردنی باوکی ، دوایی زاناکان و هەواڵدەران بەڕووداوی ڕابوردوو کەوتنە پێش بڕکێ لەنێوان خۆیانا بۆ بەخێوکردنی مەریەم ئەو کارە پیرۆز بوو لایان چونکە باوکی مەریەم سەرۆك و گەورەی مالومەکان بوو ، دوای فڕێدانی دارەکان پشك بەناو زەکەریاوە دەرچوو کە مێردی پوری بوو ، ئەو کاتە مالومەکان وازیان هێنا و مەریەمەی بردە لای خۆی و بوو بە بەڕێوەبەری کار و فەرمانی ئەو .

ئەوەی شایانی باسێ بلاو کردنەوەی ئەو دەنگ و باسانە لەلایەن پێغەمەرەوە کە گەورەترین کاری بەزۆربەیی کەس نەکراو بەڵگەیە لەسەر فروستادەیی پێغەمەر و سروشە لای خواوە بۆی هاتووە .

إِذْ قَالَتِ

ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ

عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْآخِرَةِ وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾
وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٤٦﴾
قَالَتْ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ قَالَ كَذَٰلِكِ
ٱللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٧﴾
وَيُعَلِّمُهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴿٤٨﴾
وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنِّي قَدْ جِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ
أَنِّىٓ أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ
فَيَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَأُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ
وَأُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ
فِي بُيُوتِكُمْ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٤٩﴾
وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم
بَعْضَ ٱلَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ وَجِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ

﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ (٥٠) إِنَّ اللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ (٥١) ﴾

بەر لەوەی بچینە سەرماناکردنی ئایەتەکانی سەرەوە پێویستە بزانین ئەو شتانە پەیدا بوونیان گونجاو نیە بەگوێرەی تاقی کردنەوەی ئادەمیزاد ، نەیش گونجێ پەیدا بوونیان لەمەو پاش دووبابەتن :

١- ئەو شتەی گونجاو نی‌یە لەخۆیا بەگوێرەی ئەقڵ و تاقی کردنەوە ، قەدەغەبێ پەیدا بوونی لەهەموو کات و جێگەیەکا بەهەموو شێوەیەك ، وك کۆبوونەوەی دووشتی دژ بەیەکتری ، مرڤێ لەیەك کاتا باوەڕدار بێ و بێ باوەڕیش بێ ، کوێرێ لەیەك کاتا نابینابێ و بینەریشبێ . بۆ ئەو شتانە ئەقڵ و تاقی کردنەوە پێك هاتوون لەسەر قەدەغە بوونیان .

٢- شتێ قەدەغەبێ و نەگونجاو بێ پەیدابوونیان لەخۆیانا بەگوێرەی ئەقڵ و تاقی کردنەوە. بەڵام لەوانەیە پەیدا ببێ لەهەندێ کاتا ، وێنەی ئەو شتانەی لەقورئاندا زۆرن : بەوێنەی دانیشتنی ئیبراهیم لەناو ئاگردا بێ ئەوەی ئازاری پێ بگا ، گۆڕانی داردەستی موسا بەمارێکی گەورەی تیژڕەو ، وەستانی ئاوی دەریا سووربونی بەوێنەی کێو لەکاتی پەڕینەوەی موسا و خزمەکانی ، نەرمبوونی ئاسن و پۆڵا بۆ داود بەوێنەی مێو ، گفتوگۆ کردنی سولەیمان لەگەڵ باڵندە و مێرولە ، زیندو بونەوەی عوزەیر لەم جیهاندا پاش مردنی بە سەد ساڵ ، لەدایك بوونی عیسا بەبێ باوك ، گفتوگۆکردنی لەگەڵ ئادەمیزاد و دوای لەدایکبوونی کوتوپڕ ، زیندوو بونەوەی مردووان بۆی ، ڕزگار کردنی کوێر و بەڵەکاوی بەبێ دەرمان ، ئەوانە هەموویان هەرچەندە قەدەغەیە پەیدابونیان بەگوێرەی ئەقڵ و نەبینراون . بەڵام ئەگونجێ پەیدابوونیان ، بەلای ئەقڵەوە خراپەیە ڕوونادا لەپەیدا بوونیان، ئەگەر خراپەیە ڕووی بدایە پەیدا نەئەبوون لەسەر دەستی پێغەمەران . کەواتە ئەو

ڕووداوانە لەخۆیانا لەوانەیە پەیدا بن ، لەبەر ئەوەی پەیامی خوا هـەواڵی بەپـەیدابوونیان دا، وەپێویستە هەموو موسوڵمانان باوەڕیان بەپەیدابوونیان هەبێ بەبێ جم و جوڵ .

٣- ئەوەی ڕاستی بێ خوای گەورە توانای بەسـەر هـەموو شـتێکا هەیـە ، یـەکێ لەوانـە دروست کردنی عیسایە بەبێ باوك بەووشەی ﴿ کُنْ ﴾ واتە خوافەرمووی:ببە ﴿ فیکون ﴾ ئەویش پەیدا بوو لەنەبوونەوە ، ئێمەی بەندەی خوا زۆرمان لێ ناکرێ بنج و بنـەوانی ئـەو ڕووداوانە لەلایەن خوای گەورەوە بزانین چۆن ئەبێ بزانرێ و ئەقڵی ئێمە ڕێگەی پێ ببـا ، بۆ نموونە : گیان ( الروح ) ئێمە ڕێگەی پـێ نابـەین . بـەڵام نیشـانەی دەرکـەوتوو بۆمـان دەرئەخا گیان هەیە . بۆ ئێمە ئەو ئەندازەیە بەسە ، لەسەر ئەوبنەڕەتانە مانـای ئـەو ئایەتانـە ئەکەین کە هاتوونەتە خوارەوە بۆ عیسا و جگەی عیسا لەهەموو جێگەیەکی قورئاندا .

﴿ إذ قالت الملائکة یامریم إن الله یبشرك بکلمة منه ﴾ موحومـەد تـۆ بـیری ئـەو کاتـە بکەرەوە هەندێ لەفریشتەکان ووتیان : ئـەی مەریـەم : بەڕاسـتی خـوا مـوژدە ئـەدا بـەتۆ بەهۆی فەرمودەیەکی خۆیەوە کە بریتیە لە ﴿ کن فیکون ﴾ ، یا بـەهۆی جبرەئیلـەوە کـە کوڕێکت بداتێ ئەبێ بەبلیمەت ترینی مرۆڤی سەردەمی خۆی .

﴿ إسمه المسیح عیسی ابن مریم ﴾ ناوی ئەو کوڕە مەسـیحە عیسـای کـوڕی مەریـەم . مەسیح نازناوی عیسایە .ووشەی (المسیح) بەزۆرمانا هـاتووە ، خـاوەنی تەفسـیری (البحـر المحیط) ناوی حەوتیان بردووە ، هەموویان ئەگەڕێنەوە بۆ لای ئەوە کە بەمانا فـەڕە ، بـەمانا ڕاست وێژ هاتووە . کەم جار بەمانی درۆزن هاتووە وەك دەجال بێژراوە مەسیح واتـە ئـەو ووشەیە هاوبەشە لەنێوان دوو مانای دژ بەیەکتری . ووشەی ﴿ إبن مریم ﴾ ئاماژە بۆ ئەوە ئەکا بێ باوکە .

﴿ وجیهاً في الدنیا والآخرة ومن المقربین ﴾ لەکاتێکا عیسا مرۆڤێکی خاوەن پلە و پایەیە لەجیهاندا بەوەی ئادەمیزاد بەپیرۆزی ئەزانن و ڕێزی لێ ئەگرن هەتا ڕۆژی دوایی ، لـەدوا ڕۆژدا لەبەر بەرزی و پایەی ، ئەبێ بەپێغەمەر لەجیهاندا ، پاشەڕۆژ ئەپارێتەوە لای خوا بـۆ

گوناهباران و ، لەو کەسانەیە نزیك ئەخرێنەوە بۆلای خوا بۆ وەرگرتنی پایەی بەرز لەبەهەشتا لەریزی پێغەمەرانی تردا کەپلەیان زۆر بەرزە .

﴿ ویکلم الناس في المهد و کهلاً من الصالحین ﴾ وە گفتو گۆ ئەکا بەمناڵی لەبێشکەدا لەگەڵ ئادەمیزاد و ، گفتوگۆیش ئەکا لەگەڵ ئادەمیزاد لەکاتێکا تەمەنی زۆرتربوو لە (٣٠) ساڵ و کرا بەپێغەمەر ، بۆ ئەوەی دایکی دوور بخاتەوە لەو بوختانانەی درابووە پاڵ دایکی کە ئەبێژرا عیسی لە یوسفی نەجارە .

زانایان ئەڵێن : ئەو گفتوگۆیە ماوەیەکی کەمبوو لەمناڵیدا لەپاشا گفتوگۆی نەکردووە هەتاکاتێ منالانی تر گفتوگۆیان ئەکرد . گاورەکان گومانی نارەوایان وایە کە بەمناڵی گفتو گۆی نەکردووە .

﴿ ومن الصالحین ﴾ وەموژدە بێ عیسا لەپیاو چاکانە و یەکێکیە لەپێغەمەرەە گەورەکان، زانایان هەندێ لەوان ئەڵێن : لەتەمەنی (٣٠) ساڵیدا بوو بەپێغەمەر لەتەمەنی (٣٣) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە .

﴿ قالت ربي أنی یکون لي ولد ولم یمسني بشر ﴾ مەریەم ووتی لەرووی بەگەورە دانانی توانای خواوە : ئەی پەروەردەکەری منَ چۆن مناڵ بۆمن ئەبێ ، دەستی لەمن نەکەوتووە هیچ ئادەمیزادێ منالبون بەبێ مێرد نابێ .

﴿ قال کذلك یخلق الله من یشاء ﴾ جبرەیل بەمەریەمی ووت : هەر بەو جۆرە پێت بێژراوە بەبێ دەست لێدانی ئادەمیزاد خوا دروستی ئەکا هەرشتێ ئارەزوی هەبێ و خوا منالت ئەداتێ .

﴿ إذا قضی أمراً فیقول کن فیکون ﴾ هەر کاتێ خوا فەرمان بدا بەبوونی هەرشتێ ، دوایی بەراستی ئەڵێ بەو شتە: تۆ ببە ، دوایی ئەو شتە ئەبێ ، کەواتە مەریەم بەبێ مێرد منالی ئەبێ .

﴿ ویعلمه الکتاب والحکمة والتوراتة والأنجیل ﴾ وەخوا فێری عیسا ئەکا ئەو نامەیە ناردویەتی بۆ لای پێغەمەرەکانی تر ، وەك نامەی شیس و ئیبراهیم و داوود و ئادەم .

هەندێ لەزانایان ئەڵێن: ووشەی (الکتاب) لێرەدا بەمانای نووسینە ،چونکە باسی تەورات و ئینجیل پاڵپشتە بۆ ئەو مانایە ، خوا فێری عیسا ئەکا دانانی هەموو شتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا و زانینی هەموو کاری چاك و ، فێری تەورات و ئینجیلی ئەکا ، ئەو ئایەتە بەڵگەی بێگومانە کە تەورات بنچینەی یەکەمە بۆ ئاینی مەسیح ، ئینجیل درێژە پێدانی ئەو ئاینەیە لەگەڵ هەندێ گۆڕان ، وەك ڕەواکردنی هەندێ شت قەدەغە کرابوون لەسەر بەنی ئیسرائیلیەکان .

﴿ ورسولاً إلى بني إسرائيل ﴾ وەلەکاتێکا عیسا نێردراوێکە بۆلای بەنی ئیسرائیلیەکان و پێغەمەری ئەوانە . بێگومان پێغەمەری ئیسلام نێردراوە بۆ لای هەموو ئادەمیزاد .

﴿ اني قد جئتكم بآية من ربكم ﴾ نێردراوێکی خوام بەوەی کەبەڕاستی من هاتووم بۆلای ئێوەی کوڕانی یەعقوب بەنیشانەیەکی زۆر گەورە لەلای پەروەردەکەری ئێوەوە لەم شتانەی خوارەوە :

١- ﴿ إني أخلق لكم من الطين كهيئة الطير فأنفخ فيه فيكون طيراً بإذن الله ﴾ بەڕاستی من ئەسازێنم بۆ ئێوە و نەخشەی ئەکێشم لەقوڕ شتێ بەوێنەی باڵندە ، دوایی فووئەکەم بەو باڵندەیەدا ، دوای ئەو فووە ئەو قوڕە ئەبێ بە باڵندە بەدەستووری خوا و گیانی ئەکرێ بەبەردا ، ئەو باڵندەیە هەر باڵندەیە بێ مەبەستەکە ناگۆڕێ ، لەبەر ئەوەی خوا باسی نەکردوە چاك وایە ئێمە لێی بێ دەنگ بین . هەرچەندە هەندێ زانایان ئەڵێن : ئەو باڵندەیە شەمشەمە کوێرەیە بەشەودا ئەگەڕێ .

٢- ﴿ وأبرىء الأكمة ﴾ وەمن ڕزگاری ئەکەم کوێری دایك زادە و ئەبێ بەبینەر ، ئەو جۆرە نەخۆشیە هیچ پزیشکێ ناتوانێ چاکی بکاتەوە .

٣- ﴿ والأبرص ﴾ وەمن مرۆڤی بەڵەکاوی ڕزگار ئەکەم لەبەڵەکەکانی ، کەپزیشك لابردنی ئەو نەخۆشی‌یەی بۆ چارەسەر ناکرێ .

٤- ﴿ وأحيي الموتى بإذن الله ﴾ وەمن مردوان زیندوو ئەکەمەوە بەپاڕانەوەم لای خوا و بەدەستوور و فەرمانی خوا ، ووشەی ﴿ بإذن الله ﴾ بۆئەوەیە گومانی خراپی گاورەکان

پووچ بکاتەوە کەلایان وایە عیسا خوایە . عیسا بەبێ ویستی خوا ناتوانێ هیــچ شــتێ بکــا وەك بەندەکانی تری خودا.

٥- ﴿ وأنبئكم بما تأكلونَ وما تَدخرون في بيوتكم ﴾ وەمن هــەواڵ ئــەدەم بــەئێوە بەشــتێ ئێوە ئەیخۆن لـەخانەی خۆتانا بەنــهێنی و جگــە لــەخۆتان کــەس نایزانــێ و ، بەشــتێ ئێــوە لەگەنجینەی خۆتانا هەڵی ئەگرن .

٦- ﴿ إن في ذلك لآية لكم إن كنتم مؤمنين ﴾ وەلەو پێنج شتەدا نیشانەیەکی گــەورە بــۆ ئێوە هەیە ئەگەر ئێوە باوەڕدارن .

پێویستی سەرشانی ئێمە نی‌یە خۆ ماندوو بکەین بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو کارە نهێنیانە و لەناوەرۆکی ئەو نیشانە گەورانە هەتا بزانین چۆن گیان و زیندوێتی ئەگەڕیتــەوە بــۆ لــەشــی ئەو مردووانە ، ئەو نەخۆشیانە چۆن ڕزگاریان بووە بــەبێ داو دەرمــان ، گــەڕان بەشــوێنی دۆزینەوەیاندا هیچ شتێکمان بۆ سەوز نابێ جگە لەسەر گــەردانی ، کەواتــە پێویسـتە مــل کەچی فەرموودەی خوابین .

هەواڵدانی عیسا بەو کارە نهێنیانە بەهۆی پەیامی خواوە بوو بەو هەواڵە بەهەموو کــەس نــەکراوەی عیســا ئەبێتــە هاوبەشــی پێغەمــەرانی تــر ، نــەك هەربەتەنــها بــۆ عیســا ، وەك دروستکردنی کەشتی لەلایەن نوحەوە بەر لـەپەیدابوونی لافــاوی گشــتی ، ئاگــادارکردنی شوعەیب بەپاشەڕۆژی ناهەمواری گەلەکەی خۆی ، هــەواڵدانی پێغەمــەر بەســەر کــەوتنی ڕۆم بەســەر فارســدا ، ســەرکەوتنی موســوڵمانان بەســەر فــارس و ڕۆمــدا ، هــەروەها پێغەمەرەکانی تر کاری بەهەموو کەس نەکراوی زۆریان کردووە .

﴿ ومصدقاً لما بين يدي من التوراة ﴾ وەمن هاتووم بەڕاست بگێڕم و باوەڕبکەم بەشــتێ بەر لـەمن هاتووە لەتەورات و نامەی پێغەمەرەکانی تر .

﴿ ولأحل بعض الذي حرّم عليكم ﴾ وەهاتووم بۆ ئــەوەی ڕەوا بکــەم هــەندێ ئــەوەی قەدەغە کرابوو لـەسەر ئێوە بۆ تەمێ کردنتان لــەو کاتانــەدا بێ‌فــەرمانی خواتــان ئــەکرد . ئەوانەی قەدەغە کرابوون وەك خواردنــی گۆشــتی هــەندێ لــەزیندەوەران و کارکردنیــان لەڕۆژی شەممەدا کە لـەوەو بەر قەدەغە بوو لـەسەریان .

﴿ وجئتكم بآية من ربكم ﴾ وەمن هاتووم بۆ لای ئێوە بەنیشانەیەکی گەورە لەلای پەروەردەکەری ئێوەوە کە بەڵگەیە لەسەر ڕاستی و فردۆستادەیی من .

﴿ فأتقوا الله وأطيعوني ﴾ دوایی ئێوە خۆتان بپارێزن لەگوناه و لەخوا بترسن پاش ئەو هەموو بەڵگانەو کارە پەك خراوەنەو ، ئێوە پەیڕەوی من بکەن و فەرمانبەرداری من بن دەربارەی ئەو شتانەی ڕەواکران بۆتان و ئەوانەی قەدەغەن لەسەرتان ، دوای ئەو نیشانە گەورانە ، عیسا ئادەمیزاد بەگشتی بانگ ئەکا و ئەڵێ :

﴿ إن الله ربي وربكم فأعبدوه هذا صراط مستقيم ﴾ بەڕاستی خوا پەروەردەکەری منە و ، پەروەردەکەری ئێوەیە ، دوایی ئێوە خوا بپەرستن بەتەنها و هاوبەشی بۆ دامەنێن ، ئەوەیە ڕێگەی ڕاست و گەیەنەری ئادەمیزادە بەئەنجامی ئاواتی خۆیان کەباوەڕ بەخوا و فرۆستادەی خواو پەرستنی خوا .

ئەو کەسانەی خاوەنی ژیری تەواون بەرەنگاری ڕاستی ناکەن و ڕێزی شتی پووچ نادەن بەسەر ڕاستیەکاندا ، خۆیان ئەپارێزن لەچوار شت و نایان کەن بەیانوو بۆ خۆیان: فیزی دەروون خۆ بەگەورە گرتن ، گومانی مێشك ، نەزانین و ڕێگە نەبردن بەبەڵگە وکەموکوڕی بەڵگە ، چونکە ڕوون و ئاشکرایە بەڵگەی پێغەمەران ئەوپەڕی گرتووە لەسەر ڕاستی ناردنی خۆیان لەلایەن خوای گەورەوە لەهەموو ڕوویەکەوە وەگومان تەفرو تونا ئەکا ، بە وێنەیە بەڵگە بۆ نەسەلماندنی دوژمنان نایەڵێ کە ڕیکەرێك بکەن . کەواتە ئەو چوار بەڵگەیە نرخیان نەما ، ئەگەر وانەبێ نابێتە هۆی مل کەچ کردنی بێ باوەڕان لەخزمەت خوا و پێغەمەراندا ، ئەوکەسەی بروا و بگەڕی بەشوێن ئەو شتانەدا ئەبنە هۆی فێڵ کردنی فێڵبازان لەگەڵ پێغەمەران و نەسەلماندنی ڕەوانەکردنیان لەلایەن خوای گەورەوە ئەو کەسە لەکۆتاییدا هیچ شتێکی دەست ناکەوێ جگە لەسوودی تایبەتی و پاراستنی پلە و پایە و سامان و چاوچنۆکی ، کەواتە پیاوانی خاون ئەقڵ ئەزانن جگە لەسوودی تایبەتی شتی تر نی‌یە بیکەن بەبەڵگە بێ باوەڕان بۆ خۆیان کە باوەڕ ناهێنن ، فەرموودەی خوا و پێغەمەران و مێژوو نووسانی داد پەروەر پڕن لەو باسانە ، بۆ نمونە

یاخیە ساماندارەکانی خزمی هوود بەرەنگاری هودیان کرد لەبەر قازانج و کارگەکانیان . خزمانی شوعەیب ئەیان ووت : ئەتەوێ بەو نوێژەی خۆت کار بکەیتە سەر سامانمان . قارونی خزمی زۆر نزیکی مووسا لەبەر پاراستنی سامانەکەی بوختانی بۆ مووسا ساختە هێنا.

خزمەکانی پێغەمەری ئیسلام لەمەکە و دووروەکان لەمەدینە هەر لەبەر ترسی نەمانی سامان و پلە و پایەکانیان بۆیە دژایەتی پێغەمەریان ئەکرد ، هەروەها هەموو پێغەمەرەکانی تر. کەوابوو ڕەگەز پەرستی و فیزی دەروون و گومانی مێشك باوی نیە و کارناکاتە سەر بێ باوەڕان کەلادەن لەبێ باوەڕی و ڕەگەز پەرستی .

کاتێ خوای گەورە باسی مژدەدانی کرد بۆ مەریەم کەعیسای ئەداتێ ، عیسا دوای بوونی بەپێغەمەر چوو بۆ لای جوولەکەکانی ڕەگەزی خۆی ، بەو نیشانە گەورانە و بەڵگەی ڕوونی زۆر بۆڕێدان ، ئەوانیش لەترسی نەمان و پلە و پایەکانیان بڕیاریان دا عیسا بکوژن ، عیسا کەبۆی دەرکەوت بێ باوەڕان ئەیانەوێ پیلانی بۆ دروست بکەن بەو بۆنەیەوە خوای گەورە فەرمووی :

فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ ٱلْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٥٢﴾ رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلْتَ وَٱتَّبَعْنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٣﴾ وَمَكَرُوا۟ وَمَكَرَ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ﴿٥٤﴾

﴿ فلما أحسَّ عیسی منهم الكفر ﴾ دوایی کاتێ عیسا هەستی کرد لەجولەکەکانەوە بێ باوەڕی و شتێ ببێتە هۆی بێ باوەڕی ئەوان ، عیسا کە دەستی کرد بەڕاگەیاندنی فەرمانەکان جوولەکەکان کۆبوونەوەیەکیان کرد و بڕیاریان دا عیسا بکوژن ، عیسا کەبەوەی زانی بەفەرمانی خوا کۆچی کردو لە نێو خزمەکانی دەرچوو ، بەوێنەی پێغەمەری ئیسلام کە کۆچی کرد بۆ مەدینە کاتێ هەستی کرد بەپیلانی خزمەکانی بۆی .

﴿ قال من أنصاري إلی الله ﴾ عیسا ووتی چ کەسێکە لەیاریدەدەرانی من بۆ لای خوا و بڕۆین بۆ لای و لەچ جێگەیەکن باوەڕداران یاریدەی ئـایینی خـوا بـدەن ، پـاش مـن ڕای بگەیەنن بەئادەمیزاد و ئاین بپارێزن و بڵاوی بکەنەوە بەنێو ئادەمیزادا .

﴿ قال الحوریون نحن أنصار الله ﴾ قوتابیە پـاك و تایبەتیـەکانی عیسـا ووتیـان ، ئێمـە یاریدەدەرانی ئاینی خواین ، ئەو قوتابییانە چ کەسێکن و ناویـان چیـە و ژمارەیـان چـەندە خوا ڕوونی نەکردۆتەوە ، بەڵام ئێمە پێویستە باوەڕمان وابێ ژمارەیـە لـەهاوڕێکانی عیسـا پەیمانیان دا بەعیسا کە خۆیان بەخت بکەن لەڕێگەی ئـەو ئایینـەدا ، بەوێنـەی هاوڕێکـانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کەبڕیاری بەو جۆرەیان دا بەپێغەمەر و بەجێیان هێنا .

﴿ آمنا بالله وأشهد بأنا مسلمون ﴾ ئێمە باوەڕمان هێنا بەخوا ببینە هۆی یاریدەی ئـایینی خوا و پاراستنی دۆستانی خوا و جەنگ بکەین لەگەڵ دوژمنانی خوا و ، تـۆ شـایەتی بـدە بەو کەئێمە موسوڵمانین و خستومانەتە ئەستۆی خۆمان پاراستنی ئاینی خـوا ، مـل کـەچی ویستی خواین وویستی تۆین کەداوای یاریدەی ئایینە ، ئەو ڕستەیە بەڵگەیـە لـەسـەر ئـەوە ئاین لـەسەرەتای هاتنی ئادەمەوە هەتا هاتنی ڕۆژی دوایی ، هەموو ئاینـێ پـێ ی ووتـراوە ئیسلام ، وەك لـەقورئاندا لـەزۆر جێگـەدا ڕوون کراوەتـەوە کەهـەموو گـەلی پێغەمـەران خۆیانیان بەموسوڵمان داناوە . لەپاشا هاوڕێکانی عیسا لەخوا ئەپاڕێتەوە و ئەڵێن :

﴿ ربّنا آمنا بما أنزلت وَأتبعنا الرّسـول ﴾ ئـەی پەروەردەکـەری ئێمـە ، بەڕاسـتی ئێمـە باوەڕمان هێناوە بەشتێ تۆ ناردووتەتـە خـوارەوە بـۆ لای عیسـا کـە ئینجیلـە و ، وەئێمـە

پەیڕەوی ئەو فرۆستادەیە ئەکـەین . لـەو کاتـەدا هاوڕێکـانی عیسـا داوای سـەرکەوتن و پاداشتیان کرد لـەخوا و ووتیان :

﴿ فاکتبنا مع الشاهدین ﴾ دوایی تۆ ئێمە بنووسە بەپێنووسی میهرەبانی خـۆت لەگـەڵ ئەو کەسانە شایەتی ئەدەن لـەسەریەکێتی تۆ لـەپێغەمەران و ئەو کەسانەی باوەڕیان بەهـەموو ئەو شتانە هەیانە فەرمانت پێداون بۆ ئەوەی ئێمە ڕزگـارمـان بـیێ وێنـەی ڕزگـار بوونـی ئەوان .

﴿ ومکروا ﴾ وەبێ باوەڕانی بەنی ئیسرائیل لەوانـەی عیسـا هەسـتی کردبـوو کـەبێ باوەڕن و پیلان و فێڵیان سازاند بۆ کوشـتنی عیسـا ن نـەوەبوو کۆبونەوەیـەکیان کـرد و بڕیاریان دا کە بەهەر جۆرێ بێ عیسا بکوژن ، هەروەك خزمەکانی پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ پێـك هاتن خۆیان ڕزگار بکەن لـەپێغەمەر ، بۆ ئەو مەبەستە لـەهەر هۆزێك لاوێکی ئازا دابنێن و بچن پێغەمەر بکوژن لـەخەودا ، بەیەك جـار شمشـێرەکەیان بکێشـن بەلـەشـی پێغەمـەردا و خوێنەکەی بلاو ببێتەوە بەناو هەموویانا و هەموویان بگرێتەوە .

﴿ ومکر الله ﴾ وەخوا پاداشتی پیلانی ئەوانی دایەوە و پووچی کردەوە بـەجۆرێ ئـەو پیلانە بەزیانی خۆیان گەڕایەوە ، کاتێ چوون عیسـا بکـوژن خـوا وێنـەی عیسـای کێشـا بەسەر یەهوزای پیلان گێڕ و کوشتیان و عیسا ڕزگـاری بـوو ، هـەروەك خـوا پێغەمـەری ڕزگار کرد لـە پیلانی خزمەکانی خۆی .

﴿ والله خیر الماکرین ﴾ وەخوا چاکترینی تۆڵـە سێنەرانە ، پاداشتی پیلانەکەیانی دابەسەر پیلان گێڕاندا و بەزیانی خۆیان تەواو یوو وە سەرشۆڕ بـوون . بەوێنـەی سەرشـۆڕی بـت پەرستانی قوڕەیش و کۆچ کردنی پێغەمەر و کوێر بوونی لاوەکانی قوڕەیش و پێغەمـەریان چاو پێ نەکەوت ، بۆ ڕوون کردنەوەی ڕزگار بوونی عیسا خوا ئەفەرموێ :

إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَـٰعِيسَىٰٓ إِنِّى مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ

إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ فَوْقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ۖ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٥٥﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَأُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٥٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٧﴾ ذَٰلِكَ نَتْلُوهُ عَلَيْكَ مِنَ ٱلْءَايَٰتِ وَٱلذِّكْرِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٥٨﴾

﴿ إذ قال الله ياعيسى إني متوفيك ﴾ تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە لەوکاتەدا بێ باوەڕانی جوولەکە ویستیان پیلان بگێڕن بۆ کوشتنی عیسا خوا فەرمووی : ئەی عیسا بەڕاستی من ماوەی تەمەنی تۆ تەواو ئەکەم و دوای ئەخەم بۆ کاتێ دانراوە بۆ مردنی تۆ ، ئەتپارێزم لەکوشتنی ئەوان و لەزەویدا نات هێڵم و ئەت بەم بۆ جێگەیە خۆم ئەیزانم .

﴿ ورافعك إلي ﴾ وەتۆ بەرز ئەکەمەوە بۆ لای جێگەی ڕێزگرتنی خۆم و بارەگای فریشتەکان ، بۆ جێگەیە ئازاری کەست تووش نەبێ ، دەسەڵاتی کەسی تیانەبێ جگەی خوا .

چۆنێتی بەرز کردنەوەی عیسا کارێکی نهێنیە و جگە لەخوا کەس نایزانێ ، گەڕان بەشوێنیا بێ هودەیە ، یاسای ئیسلام داوای زانینی لەموسوڵمانان ناکا ، هەر کەسێ

بەوڕێگەیەدا بڕوا جگە لەکوێرەوەری تووشی هیچ شتێ نابی و دڵی ئارام ناگرێ . چاك وایە هەواڵەی زانستی خوای بکەین و خۆمان ماندوو نەکەین بۆی .

﴿ ومطهرك من الذين كفروا ﴾ وەتۆ پاك ئەکەینەوە و دوورت ئەخەینەوە لەپیسی و پۆخڵی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە لەشتێ ئەیانەوێ دەربارەی تۆ بیکەن .

ئادەمیزاد بیرو بۆچونی زۆریان هەیە لەبارەی دروستبوونی عیسا و چۆنێتی سروشتی ئەو هەندێکیان ئەڵێن : عیسا هەر درووست نەبووە ، جگە لەپاڵەوانی چیرۆك و ڕازی شەوان هیچ شتێ تر نەبووە و دروست نەکراوە ئەو بیرو نیازە خراپە و پوچە لەخولی نۆزدەهەمدا لەئەڵمانیا و فەڕەنسا سەری شکاوی بەرزکردەوە ، ئەو بیر و بۆچوونە خراپە ، خراپترە لەو بابەتەی بیێژرێ کە نەموسوڵمان و نەگاور بڕوایان بەعیسا نییە .

هەندێ تر لەئادەمیزاد ئەڵێن : عیسا خوایە ، گاورەکانی کلێسای ئەم سەردەمە خواییتی عیسا بنچینەی ئاینیانەو لایان پەسەندە ، ئەو بیروباوەڕە لەکەسێ ناوەشێتەوە بڕوای بەخوا هەبێ ، ئەگەر خوابێ چۆن ئەکوژرێ ، کەچی هەموو گاورەکانی ئێستا لایان وایە جوولەکەکان عیسایان کوشتووە ، بەپێچەوانەی بیروباوەڕی پاکی موسوڵمانان .

هەندێ تر ئەڵێن : عیسا ئادەمیزادە وەك هەموو کەسی تر لەهەموو ڕوێکەوە ، ئەو بیروباوەڕە باوەڕی هەموو موسوڵمانانە .. هەندێ تر ئەڵێن : عیسا ئادەمیزادە و خوایشە لەیەك کاتا . ئەو بیروڕایە لەوبابەتەیە بیێژرێ بون و نەبوون لەیەك کاتا کۆ ئەبنەوە لەیەك شتا ، زۆر ناپەسەندە لای ئەو کەسانە باوەڕیان بەپاکی خوا هەبێ .

جوولەکەکان دەربارەی عیسا و دایکە داوێن پاکەکەی شتی وا خراپ و ناهەموار ئەڵێن هەموو گەردونی پێ بلەرزێ .

موسوڵمانان لەنێو خۆیانا بیرو بۆچوونی جۆراوجۆریان هەیە دەربارەی عیسا : زۆربەی زانایانی موسوڵمان ئەڵێن : عیسا نەمردووە ، بەڕاستی زیندووە لەگەردوندایە و لەجێگەیەکی نادیاری بەلەش و بەگیان ، لەڕۆژی دواییدا دێتە ئەم سەر زەویە ، لەپاشا خوا گیانی ئەکێشێ بەڕاستی ئەی مرێنێ .

زۆریش لەموسوڵمانان ئەڵێن : عیسا مردووە و بەڕاستی خوا گیانی بەرزکردۆتەوە بۆ ئاسمان نەك لەشی ، جوولەکەکان نەیان کوشتووە هەڵیان نەواسیوە .

ئەو بیرو بۆچوونانە هەموویان سودێ لەو باسانەوە وەرناگیرێ ، چونکە مردنی عیسا بەرز کردنەوەی نەلەبنچینەی ئایینە و نەیاسا و دەستووری ئیسلامە ، نەشێوە و جۆری پەرستنە ، هەموویان دەرەکین و پەیوەندیان بەژیانی نزیك و دووری ئێمەوە نییە ئیتر پێویستە خۆمانیان بۆ ماندوو نەکەین .

﴿ وجاعل الذين أتبعوك ﴾ بەڕاستی من ئەگێرم کەسانێکی ئەوتۆ پەیڕەوی تۆیان کردووە لە یەکێتی و بێ هاوبەشی منداو بڕوایان بەفەرمان و فەرموودەی هەموو پێغەمەریان هێناوە کەتاقمێ موسوڵمانن و هەر ئەوان بڕوایان بەهەموو پێغەمەرانە هەر لەئادەمەوە هەتا پێغەمەری ئیسلام و بڕوایان وایە یەك ئاینیان هەیە و سەرچاوەیان هەریەکە.

﴿ فوق الذين كفروا ﴾ گێڕاومە لەسەروی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە لەتەرازوی خوادا بەتۆ و بەیەکێتی خوا ، بێگومان هەتا ئێستا هەر لەسەرەوەی چوە بێ باوەڕەکانەوەن .

﴿ إلى يوم القيامة ﴾ هەتا ڕۆژی هەڵسانەوەی مردووان لەگۆڕەکانیانا ، چونکە دروشم و ئاڵای ئاینی خوا بەڕاستی ئەبەن بەڕێگەوە . کەواتە مەبەست لەسەرەوە لێرەدا : سەرەوەی دەروونی و تەواوییە لەبارەی ڕەوشتا . نەك سەرەوەی دارایی و سامان و پلە و پایەی ئەمڕۆ ، ئەوەتا ئەبینرێ ئەوان لەسەرەوەن . لەکاتی گفتوگۆدا بەڵگەی موسوڵمانان لەسەرەوەی بەڵگەی بێ باوەڕانەوەیە ، هەر موسوڵمانانن پەیڕەوی عیسا ئەکەن بەڕاستی هەموو کاتێ .

﴿ ثم إلي مرجعكم فأحكم بينكم فيما كنتم فيه تختلفون ﴾ لەپاشا بۆلای منە گەڕانەوەی ئێوە هەمووتان بەعیسا و باوەڕدار و بێ باوەڕانەوە ، دوایی من فەرمان ئەدەم لەنێوان ئێوەدا لەشتێ ئێوە دژایەتی و ناکۆکیتان هەیە لەو شتەدا دەربارەی عیسا و دیاری کردنی

چونێتی سروشتی . جوولەکەکان بڕوایان بەعیسا و موحەمەد نی‌یە ، گاورەکان بڕوایان بەموحەمەد نی‌یە ، ئێمەی باوەڕدار بڕوامان بەهەموویان هەیە ، خوای گەورە پاداشتی هەموومان ڕوون ئەکاتەوە و ئەفەرموێ :

﴿ فأما الذين كفروا فأعذبهم عذاباً شديداً ﴾ دوایی من سزای کەسانێکی ئەوتۆ ئەدەم بڕوایان نەهێناوە بەسزایەکی سەخت .

﴿ في الدنيا ﴾ لەجیهاندا پلەی بێ باوەڕان نزمترە لەزۆربەی یاسای ئیسلامدا ، لەوانەیە بێ باوەڕان ناوبردنیان بەخراپە دروستە لەنهێنیدا (غيبة) ، بێ باوەڕان بەکوشتنی باوەڕداران ئکوژرێن ... بەڵام باوەڕداران بەکوشتنی بی باوەڕان ناکوژرێن ، بەلای زۆربەی زانایانەوە خوێنیشی نادرێ ، ئەگەر بشدرێ کەمترە لەخوێنی باوەڕداران لای هەندێ زانایان .

﴿ والآخرة ﴾ وەلەڕۆژی دواییدا سزای گران و سەختیان ئەدرێ بەئاگری دۆزەخ .

﴿ وما لهم من ناصرين ﴾ وەنیە بۆ بی باوەڕان هیچ یاریدەدەرانێ نەپێغەمەر و نەهیچ کەسی تر . بەتایبەتی نەعیسا و نەموحەمەد و نە مووسا .

﴿ وأما الذين آمنوا وعملوا الصالحات ﴾ دوایی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە و ، کردەوە چاکەکانیان کردووە ، باوەڕیان بەهەموو پێغەمەران هێناوە بەبێ جیاوازی و بەهەموو فەرمانەکانی خوا هەستاون .

﴿ فيوفهم أجورهم والله لايحب الظالمين ﴾ دوایی خوا بەتەواوی پاداشتی کردەوە چاکەکانی خۆیانیان ئەداتێ و ، خوا ستەمکارانی خۆشناوێ ، ئەو کەسانەی شتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دانانێن ومافی جگەی خۆیان زەوت بکەن .

﴿ ذلك نتلوه عليكم من الآيات والذكر الحكيم ﴾ ئەوانەی باسیانکرا لەهەواڵی دایکی مەریەم و زە کەریا و یەحیا و عیسا و قوتابیەکانی لەئایەتەکانی قورئان و لەو قورئانەی قەدەغەیە شتی پوچی تێدا بێت ، هەموویان بەڵگەن بۆ تۆ بۆ سەرشۆڕکردنی نوێنەرانی

نەجران و جگەی ئەوان دەربارەی عیسا ئێمە ئەی خوێنینەوە و بەسەر تۆدا ، بەڵگەیشن لەسەر پێغەمەرایەی تۆ کە بەنەخوێنەواری و بەبێ کەسی هەواڵێ بدا بەتۆ ئەو باسانەیان بۆ ڕوون ئەکەیتەوە .

نوێنەرانی گاورەکانی نەجران ووتیان بەپێغەمەر : بۆ تۆ جنێو ئەدەی بەعیسا ، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : چۆن ، ووتیان : عیسا بەندەی خوایە ، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : بەڵێ بەندە و فروستادەی خوایە . بۆ بۆردان و سەرشۆڕکردنیان خوای گەورە فەرمووی:

إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿٦٠﴾ فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا۟ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦١﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْقَصَصُ ٱلْحَقُّ ۚ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٦٢﴾ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٦٣﴾

﴿ إن مثل عيسى عند الله كمثل آدم ﴾ بەڕاستی وێنەی دروست کردنی عیسا بەبێ باوك لەلای خواو توانای خوا بەوێنەی دروست کردنی ئادەمە کە زۆر سەرسوڕێنترە

لەدروست کردنی عیسا کە هیچ کەسێ گومانی لەبوونی ئادەمدا نی‌یە ، هیچ کێشە بازێ کێشەی تێدا ناکات ، خوای گەورە باسەکەمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە کە ئادەم بەبێ باوك و بەبێ دایك دروست کراوە کەچی کەس ناوی نەبردووە بە خوا و بەکوڕی خوا ، جێگەی سەرسوڕمانە کە عیسا بەبێ باوك دروست بووە ، بۆچی ئەبێ کوڕی خوا بێ و ئادەم کوڕی خوا نەبێ ؟

﴿ خلقه من تراب ثم قال له کن فیکون ﴾ خوا ئادەمی دروست کردووە لەخاك و یەکەمین مرۆڤە لەخاك دروست کرابێ ، هەروەك عیسا یەکەمین کەسە بەهۆی فوێکەوە دروست کرابێ بەڵام لەمنداڵدانی دا یکیا ، لەپاشا خوا فەرموی بەئادەم کە وێنەکەی لە خاك کێشراو بوو ببە بەمرۆڤێکی زیندوی گیان بەبەردا کراو ، دوایی کو توپڕ بووبە ئادەم و زیندەوەرێکی خاوەن گیان ، بەوێنەی عیسا خوا فەرمووی : ببە بەعیسا لەمنداڵدانی مەریەمەدا بەهۆی ئەو فویەوە جبرەئیل کردی بەدەرونی مەریەمەدا کوتوپڕ عیسا دروست بوو بەبێ باوك و بەبێ دواکەوتن .

﴿ الحق من ربك فلا تکن من الممترین ﴾ ڕاست و بێگومانە ئەو هەواڵەی لەلایەن پەروەردەکەری تۆوە بۆ تۆ هاتووە لەقورئانی پیرۆزدا ، دوایی لەو کەسانە مەبە خاوەنی گومانن و بەردەوامن لەسەر بێ باوەڕی .

پرسیار / بەڕاستی ناگونجێ پێغەمەر گومانی هە بێ کەشتێ خو اهەواڵێ پێدابێ ، چۆن خوا ئەفەرموێ بەپێغەمەر: تۆ لەو کەسانە مە بە خاوەن گومانن .

وەڵام / ئەو زانایانە مانای قورئانیان کردووە و وەڵامی ئەو پرسیا رەیان داوەتەوە :

١- ئەو فەرمانە بەڕواڵەت ڕووی پێکاروە بۆ لا ی پێغەمەر و لەناوەرۆکا مەبەست لە پەیدا بوونی ئەو گومانە جگەی پێغەمەرە، بۆ ئەوەیشە پێغەمەر بەردەو امبێ لە سەر بێگومانی و بڕوای بەتین .

٢- بەڕاستی خوا پێغەمەران لەگوناە ئەپارێزێ ، بەڵام ئەو فەرمانە بەو جۆرە ئەبێ هەر لەلای خواوە بێ بۆ پێغەمەران، نەك لەجگەی خواوە، پێویستە بزانین پێغەمەران و

ئادەمیزادان خۆیان لەخۆیانا شتێکی سروشتی و نەگونجاو نی‌یە گوناه نەکەن چونکە ئادەمیزادن ئەوەی نەگونجا و بێ بۆ پێغەمەران ئەوەیە گوناهیان لێ پەیدا ببێ ، بێگومان هەرگیز گوناهیان نەکردووە هەرچەندە ئادەمیزادن، بۆیە جێگەی ڕێز و گەورەیین زۆرتر لەهەمووکەس لەقورئانی پیرۆزدا هەن لەو بابەتە ، وەك ئەفەرموێ ﴿ ولا تطع الكافرين ﴾

﴿ فمن حاجك فيه من بعد ماجاءك من العلم ﴾ دوایی هەرکەسێ لەگاورەکان ئەیانەوێ تۆ وەرگێڕن لەبەڵگەی ڕوونی خۆت و دوژمنایەتی تۆ ئەکەن لەبارەی عیساوە گومانیان وایە بەو جۆرە نیە بۆتۆ باسکراوە لەدوای شتی هاتووە بۆ لای تۆ لەزانینی بێگومانی ئەو شتەی کە گوایا عیسا کوڕی خوایە لای ئەوان و تۆ لا ت وایە کوڕی خوانی‌یە .

﴿ فقل تعالوا ندع ابناءنا وأبناءكم ﴾ دوایی تۆ بڵێ : ئێوە وەرن بائێمە بانگ بکەینە کوڕانی ئێمە و کوڕانی ئێوە . ئەو ڕستەیە وائەگەیەنێ کە کوڕی کچ کوڕی مرۆڤە ، چونکە پێغەمەر حەسەن و حوسەینی برد بۆ ئەو پاڕانەوەیە .

﴿ ونساءنا ونساءكم ﴾ وەبانگ کەینە ژنەکانی ئێمە و ژنەکانی ئێوە ، مەبەستی پێغەمەر لەژنانی خۆی فاتیمەی کچێتی بەتەنها، چونکە وەك نەیسابووری ئەفەرموێ : عایشە ووتی کە فاتیمە هات پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فاتیمەی خستە پشتی خۆیەوە ، بەکۆمەڵ بێژراوە لەبەر هاوسەری ﴿ نساءكم﴾ .

﴿ وأنفسنا وأنفسكم ﴾ وەبانگ کەینە خۆمان و خۆتان و خزمانی زۆر نزیکمان ، ئاشکرایە پێغەمەر خزمی نزیکتری لەعەلی نەبووە . بەکورتی نەیسابووری لەعایشەوە ئەگێڕێتەوە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ حەسەن و حوسەین و فاتیمە و عەلی خستە دوای خۆی بۆ ئەو مەبەستە کەواتە مەبەست لەو ئایەتە ئەوانەن . هەندێ لەزانایان ئەڵێن : مەبەست هەموو باوەڕدارانە بەگشتی .

﴿ ثم نبتهل فنجعل لعنة الله على الكافرين ﴾ لەپاشا ئێمە زۆر بەنیازی پاکەوە بپاڕێینەوە لەخوا ، یا لەپاشا ئێمە نەفرەت بەکاربهێنین بۆ یەکتری ، دوایی ئێمە بگێڕین نەفرەتی خوا

و دوری لەبەزەیی خوا بۆ سەر ئەو کەسانە درۆزن و بێ باوەڕن لەئێمە و لەئێوە دەربارەی عیسا.

کورتەی ئەم باسە بەم جۆرەیە : کاتێ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە ڕوونانە هێنایەوە بۆ نوێنەرانی گاورەکانی نەجران کە چی ئەوان لەسەر نەزانین و بێ باوەڕی بەردەوام بوون . لەکۆتاییدا خوا فەرمانی پێدا ئەگەر ئەو بەڵگانە وەرنەگرن نەفرەت بەکاربهێنێ لەگەڵ نوێنەرانی گاورەکان ، یانی بپاڕێتەوە لەخوا درۆزن بێ بەش بێ لەبەزەیی و میهرەبانی خوا . لەو کاتەدا نوێنەرانی گاورەکان ووتیان :ئێمە ئەگەڕێینەوە بۆ نیشتمانی خۆمان هەتا لێکۆڵینەوەی تێدا بکەین ، لەپاشا ئەگەڕێینەوە ، بۆیە ووتیان بەسەرۆکەکەی خۆیان تۆ لەم بارەوە چ شتێ ئەڵێی ، ئەویش ووتی : ئێوە خۆتان ئەزانن موحەمەد فرو ستادەی خوایە بێگومان هەرشتێ ئەو فەرموی ڕاستە ، سوێندم بەخوای گەورە هەرنەتەوەیە ڕووبەڕوی هەرپێغەمەرێ نەفرەت بەکاربهێنێ ، گەورە و بچووکیان لەناو ئەچن ، ئەگەر ئەتانەوەێ لەسەر ئاینی خۆتان بەردەوام بن کات باشی لەگەڵ موحەمەد بکەن و بچنەوە بۆ وولاتی خۆتان ، بۆیە گەڕانەوە بۆ خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ، لەو کاتەدا پێغەمەر هاتبوە دەرەوە بۆ نەفرەت کردن حوسەینی بەباوەشەوە بوو ، وە دەستی حەسەن و فاتیمەی گرتبوو ، عەلی لەپشتی فاتیمەوە بوو ، پێغەمەر فەرمووی کە من پاڕامەوە ئێوە بڵێن ﴿ ئامین ﴾ قەشەی گاورەکان ووتی : ئەو دەم و چاوو ڕوومەتانە بەوانەوە هەن ، ئەگەر بپاڕێنەوە ئەو کێوە لەجێگەی خۆی نەمێنێ ئەو کێوە نامێنێ ، ئەگەر ئێوە نەفرەت بکەن لەسەر زەویدا ڕەگەزی گاور نامێنێ هەتا ڕۆژی دووایی ، بۆیە گاورەکان بەپێغەمەریان ووت ، ئێمە نەفرەت بەکار ناهێنین .

﴿ إن هذا لهو القصص الحق ﴾ بەڕاستی ئەو هەواڵانە باسیان کراوە دەربارەی عیسا و دایکی و جگەی ئەوان ئەوانە هەواڵی ڕاستن و جگەی ئەو هەواڵانە پڕو پوچن .

﴿ وما من إله إلاّ الله ﴾ وەهیچ خوایە نی‌یە شایانی پەرستن بێ مەگەر خوای تەنها و تاك، پەرستنی ئەو جێگەی خۆی ئەگرێ ، بەو ڕستەیە ئەزانرێ عیسا خوا نی‌یە ،

بەگوێرەی گومانی گاورەکان کە عیسا خوایە ، هەر بەو ڕستەیە گومـانی بـت پەرسـتان و ئەو کەسانەی عیسا ئەکەن بەسێهەمی سێ خوا پووچ ئەبێتەوە و بۆمان دەرئەکـەوێ عیسـا بەندەیە و فرۆستادەی خوایە .

﴿ وإن الله لهو العزيز الحكيم ﴾ وەبەڕاستی خـوا زۆر گـەورە و بەدەسـتەڵاتە ، هـەموو شتێ لـەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ و زانستی خوا هەموو شتێ ئەگرێتەوە .

﴿ فإن تولوا فإن الله عليم بالمفسدين ﴾ وەدوایی ئەگەر ئەوان پشت بکەنە فەرمانی خوا و واز لـەیەکێتی خوا بهێنن و بڕوایان بەو هەواڵانە نـەبێ و عیسـا بـەکوڕێ خـوا بزانـن ، دوایی بەڕاستی خوا ئەزانێ بەخراپـەکاران کەپەرسـتن بـۆ جگـەی خـوا ئەکـەن و بـانگی ئادەمیزاد ئەکەن بۆ لای پەرستنی جگەی خوا .

مەبەست لـەهاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە پیرۆزانە ی ڕابـووردن پشـتگرتنی ئـایینی پـاکی ئیسلامە بۆ سەلماندنی مرۆڤایەتی و ڕەوانە کردنـی پێغەمـەر بـەجۆرێ هیـچ زانـین و زانایـە ڕێگەی پێ نەبردووە ، هیچ کەسێ جگـە لـەخوا توانـای بەسـەریدا نیـیە ، کـەچی بـەناو زاناکانی ئەم سەردەمە بەئاسانی مانای ئایەتەکان وەرناگرن و بڕوای پێ ناکەن .

ئەو ئایەتانە پەیوەندییان بەساڵی نۆهـەمی کۆچییـەوە هەیـە کـە هـەموو لایـەکی نێـو دورگەی عەرەب نوێنەری خۆیان ئەنارد بۆ خزمـەت پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ بـۆ ڕاوێـژ کـردن و ڕاکێشانی دۆستایەتی پێغەمەر بۆ لای خۆیان . یەکێ لـەو نوێنەرانـە نوێنـەری گاورەکـانی نەجرا بوون کە لـەنێو ئەواندا فەرمانڕەوا و گەورەکـەیان عبدالمسـيح ، پـرس پـێ کـراو و خاوەن بیرو زانایان ئەلقەی هەب کەقەشەی گەورە و خاوەن ڕێز و پلەی گـەورە بـو لای گاوەرەکان ، بۆ نمونە پاشای ڕۆم کلێسا و قوتابخانەیەکی بۆ دروست کردبوو .

ئەو نوێنەرانە کە گەیشتنە مەدینە لـەلایەن پێغەمـەرەوە ﴿ﷺ﴾ ڕێزیـان لێ گـیرا . پاش حەسانەوەیان کەوتنە گفتوگۆ لـەگەڵ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ دەربارەی عیسا ، جارێ ئەیان ووت: بەگومانی خۆیان ، عیسا خوایە ، جارێ ئەیان ووت : کـوڕی خوایـە ، جـارێ تـر ئـەیان

ووت: سێهەمی سێ خوایە ، چەندین بەڵگەیان بەگومانی خۆیان ئەهێنایەوە ، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ یەك بەیەك پوچی ئەکردنەوە کەبۆی دەرکەوت نوێنەرانی نەجران بەردەوامن لەسەر گومانی خۆیان پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : وەرن نەفرەت لەدرۆزن بکەین .

نامەدانراوەکانی فەرموودەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەگشتی ، بەتایبەتی موسلیم و تورمزی و تەفسیرەکانی قورئانی پیرۆز بەگشتی ، بەتایبەتی تەبەری و بەحرولموحیت و غەرائیبولقورئان و روحلبەیان و روحولمەعانی و تەفسیری کەبیری رازی و ئەلمەنار و ئەلمەراغی و ئەلجەواهیر، ئەوانە هەموویان ئەگێڕنەوە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هاتە دەرەوە بۆ نەفرەت کردن پارچە قوماشێکی ڕەشی بەدوراویی بەسەرەوە بوو کە گاورەکانی نوێنەرانی نەجران بۆیان دەرکەوت پێغەمەر بەردەوامە لەسەر نەفرەت کردن ، ئەوان لەنەفرەت دوورکەوتنەوە ، داوای ئاشتیان لەپێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کرد لەسەر ئەوەی هەموو ساڵێ سەرانە بدەن بە پێغەمەری ئیسلام ﴿ﷺ﴾ ، لەپاشا نوێنەرانی گاورەکانی نەجران بەمل شۆڕی گەڕانەوە بۆ نیشتمانی خۆیان . بەڵام لەو نوێنەرانە زۆریان موسوڵمان بوون .

پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کە نوێنەرانی گاورەکانی نەجرانی بۆڕدان بەبەڵگەی جۆراوجۆری بەهێز، داوای نەفرەتی لێکردن ، ئەوان ترسان و نەیان کرد ، بەڵێنی سەرانەیان بۆ دا ، لەگەڵ ئەوەیشدا هێشتا پێغەمەر پێی خۆش بوو باوەڕ بهێنن لەو کاتەدا خوا فەرموی : ئەی موحەمەد واز لەو ڕێگەیە بهێنە و ڕێگەی تر بگرە کە هەموو ئادەمیزادێ ژیر و سروشت پاکێ ئەزانێ ئەو ڕێگەی ترە هەر ئەو چاکە ئەویش ئەمەیە :

قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا

مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تُحَآجُّونَ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمَآ أُنزِلَتِ ٱلتَّوْرَىٰةُ وَٱلْإِنجِيلُ إِلَّا مِنۢ بَعْدِهِۦٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٥﴾ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ حَٰجَجْتُمْ فِيمَا لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ فَلِمَ تُحَآجُّونَ فِيمَا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾ إِنَّ أَوْلَى ٱلنَّاسِ بِإِبْرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا ٱلنَّبِىُّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٨﴾

**﴿ قل يا أهل الكتاب ﴾** موحەمەد تۆبڵێ ئەی خاوەن نامەکان ، بەلای زۆربەی زانایانەوە مەبەست لەو خاوەن نامانە گاورەکانە وەك لەمەو بەر باسیان کرا ، هەندێ لەزانایان ئەڵێن : مەبەست هەموو خاوەن نامەکانە گاوربن یا جوولەکە .

**﴿ تعالوا إلى كلمة سواءٍ بيننا وبينكم ﴾** ئێوە وەرن بۆ لای فەرمودەیە یەکسانە لە نێوان ئێمە و ئێوەدا و دادپەروەریە و هەمومان ئەگرێتەوە ، لەو گفتوگۆیەدا نەئینجیل و نەتەورات دژایەتی یەکتر ناکەن ، ئەوەیش سێ شتن :

١- ﴿ أن لا تعبدوا إلاّ الله ﴾ کە ئێمە هیچ کەس نەپەرستین مەگەر خوایەکی تەنها و جگەی خوا شایانی پەرستنی نیە ، ئەو ڕستەیە تاوانج و ئاماژەیە بۆ جوولەکەکان وگاورەکان کە عیسا و عوزەیر ئەپەرستن .

٢- ﴿ ولا نشرك به شيئاً ﴾ وەئێمە نەکەین بەهاوبەشی خوا هیچ شتێ بۆ پەرستن کە شایانی پەرستن نەبێ لەبوونەوەران ، هاوبەش بۆ خوا لەلای جوولەکەکان و گاورەکان زۆرن .

٣- ﴿ ولايتخذ بعضنا بعضاً أرباباً من دون الله ﴾ وە وەرنەگرین هەندێکمان هەندێ ترمان بەچەندین خوا و پەروەردگار بۆ خۆمان جگەی خوا .

جوولەکەکان بڕوایان بەخوا و بەتەورات هەیە ، گاورەکان بڕوایان بەتەورات و ئینجیل هەیە ، موسوڵمانان بڕوایان بەتەورات و بەئینجیل و بەقورئان هەیە ، بەڕاستی ئەو سێ نامانە پێك هاتوون لە سەرئەوەی لەپشتی بوونەوەرانەوە بەڕێوەبەرێکی واهەیە هەموو شتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ ، بەڵام گاورەکان ئەوپەڕی خراپەیان گرتووە ، دایان ناوە بۆ خوا هاوبەش و ، کوڕیان بۆ خوا داناوە ، جوولەکەکان زاناکانیان خۆیانیان کردووە بە خوا ، بۆ خۆیان لە جگەی خوا شتیان بۆ ڕەوا ئەکەن و بۆیان قەدەغە ئەکەن و لەهەڵە و گوناهیان خۆش ئەبن ، ئەفرۆشن چەندین گەزێ لەئاسمان ، ئەگێڕنەوە کەعەدی کوڕی حاتەم ووتی بەپێغەمەر : خوا ئەفەرموێ لەقورئاندا ﴿ إتخذوا أحبارهم ورهبانهم أرباباً من دون الله ﴾ وەریان گرتوە زاناکان و پارساکانیان بەچەندین خوا ، کەچی گاورەکان زانا و پارساکانی خۆیان ناپەرستن ، دوایی پێغەمەر فەرمووی : ئەوان شتیان بۆ ڕەوا وقەدەغە ناکەن و گفتوگۆیان وەرناگرن ، عەدی ووتی :بەڵێ. پێغەمەر فەرمووی ، ئەوانە بەدەست خوایە بەتەنها .

ئێمە لەخولی بیستهەمداین ، ڕۆژنامە ئەخوێنینەوە کەپاپا فەڕی بەخشی بەفلان کەس هەروەك کاردیناڵ و بەتریکەکان فەڕ ئەبەخشن ، بەڵام موسوڵمانان بڕوایان وایە بەڕاستی فەڕ هەرگیز نەبووە و نابێ مەگەر هەر لەلایەن خواوە .

﴿ فإن تولوا فقولوا أشهد وابأناً مسلمون ﴾ دوایی ئەگەر خاوەن نامەکان پشتیان کردە فەرمانی خوا و وازیان هێنا لەو فەرموودەیە تۆ بانگیان ئەکەی بۆ لای خوا پەرستن و هابەش دانەنان وەرنەگرتنی هەندێکیان بەخوا ، دوایی ئێوە بلێن بەوان : ئێوە شایەتی بدەن بەوەی ئێمە بەڕاستی موسوڵمانین و مل کەچی فەرمودەی خواین .

بەو ئایەتە خوا ئادەمیزاد بانگ ئەکا هەندێکمان هەندێ ترمان نەکەین بەخوا ، بەتەنها خوا بپەرستین و هاوبەشی بۆ دانەنێین لەئادەمیزاد و بەردو درەخت و گا و فریشتەکان و پێغەمەران ، بەداخەوە لەنێو موسوڵمانانا هەیە لاسایی گاورەکان ئەکەنەوە و زۆر ڕۆ چوون لەخۆشەویستی پیرەکانیانا بەڕادەیە ئەیان کەن بەهاوبەشی خوا ، بۆ نمونە بیستومە لەهەندێکیانەوە گیا و ڕووەك بەبێ دەستوری پیر سەوز نابێ و شتی تریش ئەڵێن ، جگەی خوا لەپێغەمەران و زانایانی خوا و دۆستانی خوا و فریشتەکان هەموویان بەندەی خوان و هەڵبژێراوی خوان و داوایان لێ ئەکرێ نامەی خوا بەئادەمیزاد بگەیەنن ، نەك بکرێن بەخوا و بەپەروەردگار .

بۆمان ڕوون بووەیەوە هەر ئاینی ئیسلامە ئازادی و سەربەستی ئاینی بگەیەنێ بەئادەمیزاد دوورە لەوە ئادەمیزاد بپەرستن ، هەر پەیڕەو و پرۆگرامی ئیسلامە ئەو ئازادی و سەربەستیە چەسپاندوە ، بێگومان زۆربەی پەیڕەو و پرۆگرامی سەرزەوی جگەی ئیسلام هەندێکیان هەندێ تری ئادەمیزادیان کردووە بەپەروەردەکاری خۆیان لەجگەی خوا ، بەچاوی خۆمان ئەبینین ئەو پەیڕەوە بەناو پێشکەوتووانەی گەلانی بەناو پێشکەوتووی جیهان کە خۆیان بەدیموکراتی دائەنێن و هەندێکیشیان دیکتاتۆرین ، هەندێکیان هەندێ تریان بەبەندەی خۆیان دائەنێن و خۆیانیان کردووە بەپەروەردگاریان . بۆ نمونە کۆمەڵێ بەناوی نوێنەرانی زۆربەی گەل کۆئەبنەوە یاسا دائەنێن بەبێ ئەوەی هەموو گەل ئاگای لێ بێ و بەزۆر ئەیسەپێنن بەسەریانا بۆ سوودی کۆمەڵێکی کەمی تایبەتی ، کەواتە ئەوە پەرستنی جگەی خوایە ، پەرستن هەر تەنها بریتی نیە لەکۆڕنۆش بردن.

ئاینی ئیسلام بەوجۆرەی کەلای خواوە هاتووەهەر ئەو ئاینەیە بۆ پێغەمەران هاتووە ، یاسای ئیسلام هەموو کەس ئەگرێتەوە و سوودی بۆ هەمووانە و خوا داینـاوە . ئـاینی ئیسلام بەو جۆرەی لای خواوە هاتووە بۆ ئەوەیەئادەمیزاد رزگار بکات لەپەرستنی جگەی خوا و لـەستەمی هەندێ ئادەمیزاد رزگاریان بکا ، لەکۆیلەیی دووریان خاتەوە .

بەڵام بەداخەوەکەسانی بـەناو موسـوڵمان سـەرچاوەی پـاکی یاسـای ئیسـلامیان لێـڵ کردووە ، دوژمنانی ئیسلام لەوانەوە تەماشای ئیسلام ئەکـەن ، ئەوکەسـەی پشـت بکاتـە یاسـای ئیسـلام بەموسـوڵمانی راسـت دانـانرێ ، هەرچـەندە ناسـنامەکەی بەموسـوڵمان پرکرابێتەوە ، برِوبیانو یان بێ هوودەیە .

ئێمەی موسوڵمان بەشانازیەوە برِوامان وایە خوا هاوبەشی نیە و عیسا کـورِی خـوا نیە ، خاوەنی خواردن و خواردنەوەیە و ئەمرێ ، بەڵگەیشمان ئەوەیـە گاورەکـان لایـان وایە جوولەکەکان عیسایان کووشتووە و هەڵیان واسیوە بـەدارێکا ، وێنـەی ئـەو دارایـان کردووە بەدروشمی خۆیان و بیرەوەری کوشتنی عیسا ، زۆر جێگەی سەرسورِمانە یۆحـەننا پۆڵـس کـە پاپـای گاورەکـان بـوو لەسـاڵی (١٩٨٦) لەگفتوگۆیـەکیا ووتـی : ئێمـە و موسوڵمانان سەرچاوەی ئاینیمان یەکە ، بەڵام بەداخەوە موسوڵمانان عیسا بە کورِی خـوا دانانێن ... ئیتر چۆن ئەبێ کورِی خوا بکوژرێ .

بـۆ زانـین : لـەداواکردنی موسـوڵمانان لـەخاوەن نامـەکان شـایەتی بـدەن کـە ئێمـە موسوڵمانین ئەم سوودانە رەچاو ئەکرێن :

١- موسوڵمانان جیا ئەبنەوە لەجگەی خۆیان بەپەرستنی خوای تاك و تەنها ، هیچ کەسێ لەخۆیان ناکەن بەپەروەردگاری خۆیان لەجگەی خوا ، بۆ هیچ کەسێ نیە جگـەی خـوا لەهەر پلەیەکابێ بتوانێ رەواکردن و قەدەغەکردن بکا بەپیشەی خـۆی ، شایسـتەی ئـەوە نیە لەگوناهی هیچ کەسێ خۆش بێ باپێغەمەرانیش بن .

٢- ئاگادارکردنی هەموو بێ باوەرِانە و ئاماژەیـە بـۆ ئـەوەی موسـوڵمانان جیـا ئەبنـەوە لەجگەی خۆیان کە گرنگـی نـەدەن بـەبێ بـاوەرِان و بـێ باوەرِیـان ، موحەمـەد و ئـەو

کەسانەی لەگەڵ ئەون باوەڕ بەڕاستی ئەهێنن و بەڕاستی کاری پێ ئەکەن ، ئیتر بادانیشتوانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا باوەڕ نەهێنن .

قەشەی گاورەکان و مالومەکانی جولەکە کەوتنە گفتوگۆ لەگەڵ پێغەمەردا دەربارەی ئیبراهیم ، جوولەکەکان ئەیان ووت : ئیبراهیم جوولەکەیە ، گاورەکان ئەیان ووت : ئیبراهیم گاور بووە ، خوای گەورە بەدرۆی خستنەوەو فەرمووی :

﴿ يا أهل الكتاب لم تحاجون في ابراهيم ﴾ ئەی خاوەن نامەکان : لەبەر چ شتێ ئێوە گفتوگۆ ئەکەنو بەڵگە ئەهێنن لەبارەی ئیبراهیمەوە ؟ هەریەکەتان داواتان وایە ئیبراهیم لەسەر ئاینی خۆتانە . یانی جولەکەکان ئەڵێن ئیبراهیم لەسەر ئاینی جولەکە بووە ، گاورەکان ئەڵێن : لەسەر ئاینی گاور بووە .

﴿ وما أنزلت التوراة والأنجيل إلا من بعده أفلا تعقلون ﴾ وەنەنێردراوەتە خوارەوە تەوراتی نامەی موسا و ئینجیلی نامەی عیسا مەگەر لەدوای ئیبراهیم ، ئایا ئێوە بۆ بیر ناکەنەوە و شتێکی نەگونجاو ئەڵێن ، چۆن ئەبێ ئیبراهیم لەسەر ئاینی ئێوە بێ ؟ کەچی تەورات هاتووەتە خوارەوە بۆ سەر موسا بە (٥٧٥) ساڵ پاش ئیبراهیم ، ماوەی نێوان موسا و عیسا (١٦٣٢) ساڵە ، ماوەی نێوان ئیبراهیم و عیسا (٢٢٠٧) ساڵە ، ئیبراهیم بەر لەو دووپێغەمەرانە هاتبێ چۆن دەگونجێ لەسەر ئاینی جولەکە و گاورەکان بێ ؟ هەندێ تر لەزانایان ماوەی نێوان ئیبراهیم و ماوەی نێوان موسا و عیسا بەجۆرێ تر دایان ناوە ، بەهەرچۆنێ بێ مەبەستەکە ناگۆڕێ .

﴿ ها أنتم هؤلاء حاججتم فيما لكم بە علم ﴾ ئاگاداربن ئێوەی خاوەن نامە ئەو کەسانەن گفتوگۆتان ئەکرد و بەڵگەتان ئەهێنایەوە لەشتێکا بۆ ئێوە هەبوو زانستی بەو شتە لەنامەکانی خۆتانا ڕوون کرابۆوە لەبارەی موسا و عیساوە ، ئەتان ووت ئێمە لەسەر ئاینی ئەوانین ، ئێوە بۆتان ئەگونجا گفتوگۆی تێدا بکەن چونکە شارەزاییتان هەبوو لەو بارەوە .

﴿ فلم تحاجون فیما لیس لکم به علم ﴾ دوایی لەبەر چی و چۆن گفتوگۆ ئەکەن و دوژمنایەتی ئەکەن لەشتێکا بۆ ئێوە نیە زانینی ئەو شتە کە ئاینی ئیبراهیمە ، کەواتە بۆتان نیە بەهیچ جۆرێ گفتوگۆی تێدا بکەن ، چونکە ئێوە ئاینی ئیبراهیم نازانن چۆن بووە .

﴿ والله یعلم وأنتم لا تعلمون ﴾ وەخوا ئەزانێ ئاینی ئیبراهیم چۆن بووە و بەگفتوگۆ و دوژمنایەتی ئێوە ئەزانێ ، ئێوە لەبنج و بنەوانی چۆنێتی ئیبراهیم نازانن بەهیچ جۆرێ ، ئیتر ئێوە گفتوگۆ مەکەن و پرسیار لەزاناکان بکەن و ئەوان ئاگادارییان پێ دراوە ، بۆ نازانن ؟ .

﴿ ماکان إبراهیم یهودیاً ولا نصرانیاً ﴾ ئیبراهیم نەجوولەکە بووە و نەگاور ، ئەو ڕستەیە بۆمان ڕوون ئەکاتەوە کە موسا جولەکە نەبووە ، چونکە جولەکەیی دوای ئیبراهیم هاتووە ، موسایش لەم جولەکانە نیە ، لەسەر بیرو باوەڕی ئەوان نیە ، لەبەر ئەوەی ئاینی موسا لەنەوەی یەهودا نیە ، هەروەها ئیبراهیم گاور نەبووە ، پەیوەندی بەم ئاینەی ئەوانەوە نیە لەبەر ئەوەی دەستکاری کراوە ، کەواتە هەردوو لایان گومڕان .

﴿ ولکن کان حنیفاً مسلماً وما کان من المشرکین ﴾ وەبەڵام ئیبراهیم مرۆڤێ بووە لای داوە لە هەموو ئاینێ بۆ لای ئاینی ڕاست و پاك ، خوای بەتاك و تەنهای زانیوە ، موسوڵمان بووە . ئیبراهیم لەو کەسانە نەبووە هاوبەشی بۆ خوا دانابێ ئەو ڕستەیە ئاماژە بۆ ئەمە ئەکا گاورەکان و جوولەکەکان هەردوو لایان لەو کەسانەن هاوبەشیان بۆ خوا داناوە، گاورەکان ئەڵێن : عیسا خوایە و کوڕی خوایە ، جوولەکەکان ئەڵێن : عوزەیر کوڕی خوایە .

پرسیار / قورئان دوای ئیبراهیم هاتوەتە خوارەوە ، کەواتە چۆن ئەبێ موسوڵمان بێ ؟

وەڵام / ئیبراهیم ئەگەر بەمانای ناسراو موسوڵمان نەبێ لەناوەرۆکا ئاینی ئیبراهیم لەگەڵ ئیسلامدا یەك ئەگرن ، لەمەو پێش باسی ئەوەمان کرد هەموو پێغەمەران موسوڵمانن .

﴿ إن أولى الناس بإبراهيم للذين اتبعوه ﴾ بەڕاستی نزیکترین کەس و سزاوارترین ئادەمیزاد بەئیبراهیم کەسانێکی ئەوتۆن پەیڕەوی ئیبراهیمیان کردووە لەکاتی خۆیا و فەرمانبەرداری بوون و یاریدەیان داوە بۆ چەسپاندنی فەرمانەکانی و سەرکەوتنی بەسەر دوژمناندا .

﴿ وهذا النبي والذين آمنوا معه ﴾ وەئەم پێغەمەرەیە ناوی موحەمەدە و یاریدەی دەستوری ئیبراهیم ئەداو ، کەسانێکی ئەوتۆن باوەڕیان لەگەڵ ئەو پێغەمەرەدان کە موسوڵمانن .

ئەو سێ تاقمەن شایانی ئەوەبن بڵێن : ئێمە لەسەر ئاینی ئیبراهیمین و لەگەڵ ئاینی ئیسلاما یەك ئەگرنەوە .

﴿ والله ولي المؤمنين ﴾ وەخوا دۆست و یاریدەدەری باوەڕدارانە . کەواتە باوەڕداران تاقمی خوان و پەیوەندییان بەخواوە هەیەو ، لەژێر سێبەری بەیداخی خوادان ، جگە لەخوا هیچ کەسێ بەپشتیوان و دۆستی خۆیان نازانن ، موسوڵمانان یەك بنەماڵەن ، یەك نەتەوەن ، لەهەر نەتەوە و خولەکێکا بن ، لەهەر جێگە و نیشتمانێ بن ، لەهەر ڕەگەزێ بن ، لەهەر شار و خانەیەدا بن .

لەمەو پێش باسی هاتنە خوارەوەی ئەو چوار ئایەتەی دواییمان کرد بەر لەمانا کردنی ئایەتەکان . بەڵام هەندێ لەزانایان ئەڵێن : هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتانە گفتوگۆیەکی نەجاشی پاشای حەبەشەیە ، ئەوەیش ئەمەیە : کاتێ هەندێ لەموسوڵمانان کۆچیان کرد بۆ حەبەشە ، بت پەرستەکانی عەرەب عەمری کوڕی عاس و عەبدوڵای کوڕی ئەبی ڕەبیعەیان نارد بەهەندێ دیارییەوە بۆلای نەجاشی ، بۆ ئەوەی موسوڵمانەکانیان بدەنە دەست ، بۆ ئەو مە بەستە نەجاشی کۆڕێکی فەراهەم هێنا لەخۆیان و لەهەردوو لا یەنەکە . جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب لەگەڵ عەمری کوڕی عاس کەوتنە گفتوگۆ ، لەکۆتاییدا عەمری کوڕی عاس بۆڕی خوارد ، لەپاشاو نەجاشی فەرمانی بەجەعفەری کوڕی ئەبی تالیب دا

هەندێ قورئانیان بەسەردا بخوێنێتەوە ، ئەویش سورەتی مەریەمی بەسەردا خوێندن ، کـاری تێ کردن ، بۆیە نەجاشی و قەشەکان دڵیان گەرم بوو ، دایانە پرمـەی گریـان ، نەجاشـی فەرمانی بۆ دەرکردن و فەرموی : مەترسی لەسەر موسوڵمانان نی‌یە لەخاکی حەبەشـەدا ، چونکە تاقم پەیڕەوانی ئیبراهیمن . عەمری کوڕی عـاس ئـاڵۆز بـوو ، ئـەم ڕووداوە خـوا پێغەمەری لێ ئاگادار کرد ، ئەو چوار ئایەتە هاتنە خوارەوە .

کاتێ جوولـەکـەکان حوزەیفـەی کـوڕی یـەمان و مـەعازیان بـانگ کـرد بیـان کـەن بەجولەکە خوای گەورە فەرموی :

وَدَّت طَّآئِفَةٌ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَوۡ يُضِلُّونَكُمۡ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ﴿٦٩﴾ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَأَنتُمۡ تَشۡهَدُونَ ﴿٧٠﴾ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَلۡبِسُونَ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٧١﴾

﴿ ودّت طائفة من أهل الكتاب ﴾ ئاواتیان خواست و پێیان خۆش بوو تاقمێ لـەخاوەن نامەکان ، دڵی پیسی خاوەن نامەکان بەرانبـەر بـە کۆمـەڵگای ئیسـلام ڕقێکـە پـەیوەندی بەبیروباوەڕیانەوە هەیە ، تێکەڵاوی خوێنیان بووە ، بەڕاستی ئەوان خـەمبارن ئـەم نەتـەوەی ئیسلامە ڕانموی وەرگرن ، لایان گرانە بـاوڕی تایبـەتی ئیسـلام بـەهێزبێ ، بۆیـە خـاوەن نامەکان لەکۆششدان بۆ وەرچەرخانی موسوڵمان لەو پەیڕەوە پیرۆزە هەیانـە کەواتـە ئـەو

ئارەزوە خراپەیان لەدەرونیانەوە هەلقولاوە ، بۆیە بەبێ وچان بەردەوامن لەسەر فێڵـێ بـۆ دروستکردنی گومان لەدڵی موسوڵمانانەدا .

﴿ لو یضلونکم ﴾ کە ئەوان ئێوە لەڕێگەی خۆتان لادەن و گومڕاتان بکەن و لـەناوتان ببەن بەهەر فڕو فێڵێ بێ ، پێویستە ئێوەی موسـوڵمان بزانـن ، ئاینەکـەتان لـەکیس چـوو مانای نەمانتانە ئەتان کەن بەژێر دەستەی خۆیان .

﴿ وما یضلـون إلاّ أنفسـهم ومـا یشـعرون ﴾ وەئـەوان گومڕاناکـەن مەگـەر خۆیـان گومڕابکەن هەرتەڵەکەیە بەکار بهێنن خۆیان ئەگرێ و ئەوان هەستی پێ ناکەن بـەم زوانـە تووشیاون ئەبێ .

مەبەست لەتائیفە لەو ئایەتەدا کۆمەڵێ لەسـەرۆکی ئاینەکەیانـە ، بەتـەواوی ئەچەسـپێ بەسەر موژدەدەرەکانی گاوەرەکان کە ئەوپەڕی کۆششی خۆیان ئەخەنە کار کە موسوڵمان بکەن بەگاور ، ئەگەر ئەوەیان بۆ نەکرێ هـەوڵ ئـەدەن گومڕایـان بکـەن و گومانداریـان بکەن لەئاینی ئیسلامدا ، ئەوەندەیان بەسە بێ ئاین بن ، بـەڵام بـەو کـارە زیـان بـەخۆیان ئەگەیەنن و ، هەستی پی ناکەن ،ئاینی ئیسلام ئادەمیزاد ڕوپـێ ئـەکا بـۆلای بونـی کەسـێ بەڕێوەبەری هەموو بوونەوەران بێ ، هەموو شتێ لەجێگـەی شـیاوی خۆیادابنـێ ، لاوازی ئاینی ئیسلام لاوازی هەموو ئاینەکانە و ، لاوازی ئەو سەرۆکانەی ئـەو تۆیـە بـەرەو ئـاین برۆن ، هەندێکن لەوانە ئاینی گـاور بـەرێوە ئەبـەن ، کەواتـە نـاوەرۆکی ڕسـتەی ﴿ ومـا یضلون إلا أنفسهم ﴾ بەئاشکرایی قەشەکان ئەگرێتەوە هەرچەندە زانایانی پێشـوو ئـەڵێن : مەبەست لەڕێگەلادانی خۆیان سزای ڕۆژی دواییە .

بەهەرحاڵ . ئاینی ئیسلام بەهۆی بنچینەکانی و پەیرەوەکانی‌یەوە بەهێزترە لەوەی ئـاینی گاورەکان و جگەی ئەویش لەئاینی تر بتوانن نەی هێڵن ، بەڕاستی ئەوەتا کۆمەڵ کۆمـەڵ بت پەرستەکان و خاوەن نامەکان بەبڕوای بەهێزەوە دێنە نـاو ئـاینی ئیسـلاۆمەوە ، لـەنێو ئەوانا هەیە چەندین زانا و ڕۆشنبیر، هەرگیز نەمانزانیوە مرۆڤێکی وریـا و ڕۆشـنبیر وازی لەئاینی ئیسلام هێنابێ ، دوای موسوڵمان بوونی و زانینی ڕاستی‌یەکەی .

کونتی فەڕەنسا ، هنیدیی کاستری لەنامەکەی خۆیا ( الاسلام سوانح و خواطر ) لەباسی جەزائیردا ( الاسلام في الجزائر ) ئەڵێ : بەڕاستی ئێمە ئیسلامان چاو پێ کەوت بەڵگە لەسەر هێز و مانەوەی خۆی هێناوەتەوە ، بەهۆی هێنانی بت پەرستەکانی ئەوفریقیا بۆ لای خۆی ، کردنیان بەسەر باز لەژێر ئالآی قورئاندا ) ، لەنێو خاوەنی ئیسلاما کەسێ نیە بڕوا بۆ لای جگەی ئیسلام ، زۆر گران ئەکەوێ لەسەر گاورەکان کەموسوڵمانێ بکەن بەگاور ، هۆی ئەوەیە موسوڵمان زۆر خۆشحاڵە بەبوونی خۆی لەتاکە پەرستنی خوا.

بەوبۆنەیەوە ئاماژە بۆ ئەم ڕووداوە جوانە ئەکەم ، لەنزیکەی (١٩٣٠) دا کۆمەڵێ لە موژدەدەرانی گاورەکان چوونە پارێزگای عەمارەی عێراق بەنیازی ئەوەی دانیشتوانەکەی یا هەندێکیان بگۆڕن بۆ لای گاوری ، بۆ ئەو مەبەستە خوێندنگا و خەستەخانەیان دروست کرد ، پڕو پاگەندەیان بلاّو کردەوە ، کۆڕیان بەرپا کرد ، دارایی زۆریان بەخشی ، خوتبە خوێنەکەیان چووە سەر مینبەر و کاری بەکەس نەکراوی عیسای دووپات ئەکردەوە، هەموو کاتێ باسی عیسای ئەکرد دانیشتوان بەدەنگی بەرز ئەیان ووت ( صلاّوات لەسەر موحەمەد ) کارەکانی ئەوان بێ سوود بوو بەزەرەر مەندی چوونەوە بۆ وولاّتی خۆیان .

﴿ يا أهل الكتاب لم تكفرون بآيات الله وأنتم تشهدون ﴾ ئەی خاوەن نامەکان لەبەر چ شتێ ئێوە باوەڕ ناهێنن بەئایەتەکانی خوا وبەڵگەکان لەسەر پێغەمەرایەتی موحەمەد و ڕاستی قورئان و پایەی بەرزی ئیسلام و ئێوە خۆتان شایەتی ئەدەن لەنامەکانی خۆتانا ئەو ئایەتانە ڕاستن و شێوازی پێغەمەریان تێدا نوسراوە و مالومەکانتان شاردویانەتەوە.

هەندێ لەخاوەن نامەکان هێشتا واز ناهێنن و فێڵ وبوختان بۆ مەسەڵمانان و ئاینەکەیان ئەسازێنن ، ئەدەنە پاڵ پێغەمەر و موسوڵمانان و قورئانەکەیان بوختان و درۆ ، بۆ وێنە درۆیەکی زۆر گەورەی بەکەس نەکراو ، کەس نەی دیوە : کە موحەمەد بانگی ئادەمیزادی کردووە بۆلای پەرستنی خۆی لەشێوەی بتێ لەزێڕ دروست کرابوو ، موحەمەد تەپڵ و چەقەنەی لێداوە، دەمارەکانی تێك چووە و ئەقڵ لەرزۆکە ...

دکتۆر زەکی مەحمود لەنامەی (أيام أمريكا) ئەڵێ : ئامادەی تەمسیلێ بووم لەوولاتە یەکگرتووە کانی ئەمریکا سەرانسەر گاڵتە بەقورئان و خراپەگرتن لەئیسلام و سوکایەتی کردن بەموحەممەد بەبێ شەرمیەوە ئەو وولاتەیە وولاتی ڕووناکی و شارستانیەت و گومان ئەبا دروشم و ئالای ئاینی هەڵگرتووە و بەناوی جەنگ کردن لە بێ ئاینی بۆ بنا فرێ ئەدا بەسەر هەژاراندا .

﴿ يا أهل الكتاب لم تلبسون الحق بالباطل ﴾ ئەی خاوەن نامەکان : لەبەر چ شتێ ئێوە تێکەڵاو ئەکەن ڕاستی بەپووچی و بەناڕاستی ، نامەکانی خوا ئەگۆڕن و ئەوەی پووچ و ناڕاستە دەری ئەخەن لەشێوەی ڕاستیدا .

﴿ وتكتمون الحق وأنتم تعلمون ﴾ وەلەبەر چ شتێ ئەشارنەوە ڕاستی و فەرموودە ڕاستەکانی تەورات و ئینجیل ؟ ئێوە خۆتان ئەزانن ئەیان شارنەوە ، جگە لەکینەی دەروونی پیستان بەڵگەی ترتان نی‌یە .

ئەو هەڕەشە سەختەی خوا ئەیکا لەخاوەن نامەکان ئەمەیان پیشان ئەدا ئەو کارە ناڕەوایانە پیشەی ئەو خاوەن نامانەیە لەکۆنەوە هەتا ئەم سەردەمە ئەوە ڕێبازیانە بەدرێژایی مێژوو ... جولەکەکان لەیەکەم جاردا کاری زۆری بێ شەرمانەیان ئەکرد دەربارەی ئیسلام ، لەپاش ئەوان خاچ پەرستەکان و هەڵقەڵەگوێکانیان بەدرێژایی هاتوو چۆی مێژوو... بەداخەوە بیروباوەڕی خراپیان خستۆتە نێو کەلەپوری ئیسلام بەجۆرێ لای زۆربەی ساویلکەکانی موسوڵمانان وائەزانن لەدەستوری ئیسلامەوە هاتوون ، ڕێگەی ئاشکرا کردن و ڕوون کردنەوەی ئەو بیر وباوەڕە چەوتانە کۆشش و ماندوو بونی زۆروی ئەوێ هەتا ئاینی ئیسلامیان لێ پاك بکرێتەوە ، زۆر شتی ناپەسەندی وایان فرێ داوەتە نێوان لاپەڕەکانی نامە ئاینی‌یەکانەوە بوەتە هۆی تێکدانی مێشکی ساویلکەکان ، جگە لەقورئانی پیرۆز کەنەیان توانیوە دەست کاری بکەن ، ئەویش هۆکەی ئەوەیە خوا بەڵێنی داوە بیپارێزێ .

مێژووی پاکی ئیسلام و ڕووداوەوکانی و ڕوی گەش و سپی کەڵەپیاوانی ئیسلامیان تۆزاوی کردووە ، دەستکاری فەرموودەکانی پێغەمەریان کردووە بەزۆری بەچەندین شتێکی دەست هەڵبەست ، هەتا خوای گەورە کۆمەڵێ مرۆڤی پڕ زانین و نەخەڵەتاوی دروست کرد ، تەتەڵەی فەرمودەکانی پێغەمەریان کرد ، فەرموودە ڕاستەکانی پێغەمەریان ڕوون کردەوەو کردیانن بەیاسا ، پووچەکانیان لێ فڕێ دا ، بەگوێرەی بێ هاوتای خۆیان ... هەروەها مانای ئایەتەکانی قورئانیان بەجۆرێ کرد ڕێك بکەوێ لەگەڵ بیرو باوەڕی خراپیان زۆر شتی پڕوپووچیان خستە نێو تەفسیرەکانی قورئان بەجۆرێ زانا هەڵکەوتووەکانی ئیسلام نەبوایە ڕێگەی بەرزی قورئانمان لێ وون ئەبوو .

بائەمەیشمان لەبیر نەچێ وێنەی مرۆڤە ڕۆژ هەڵات ناسەکان و شاگردە بێ شەرمەکانیان پلەی زۆر بەرزیان لەبەڕێوە بردنی وولاتا داگیر کردووە ، کاروباری نیشتمانی موسوڵمانان بەڕێوە ئەبەن ، بەتایبەتی هەڵسوڕانی پەروەردە و فێرکردنی خوێندنی بالاو بەڕێوەبردنی زانکۆ و کۆلیجەکان ، جگە لەوانەیش بەڕێوە بردنی کاروباری دەرەوەی وولات و بەڕێوە بردنی ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیری .

دانیشتوان ئەڵێن : ئێمە موسوڵمانین کەچی بەدەیان مرۆڤی خاوەن کینە و دڵ پیسیان داناوە بەسەر موسوڵمانانەوە ، کردونیان بەپاڵەوانی دەستکردی خۆیان و نێردراون لەلایەن زایۆنی و خاچ پەرستانەوە بۆ ئەوی خزمەتی دوژمنانی ئیسلامیان پێ بکەن ، ڕێگەی دۆزینەوەی ئەو پیلانە کۆششی زۆری ئەوێ ، چونکە نێردراون بەجۆرێکی نهێنی هەتا خزمەتی دوژمنانی ئیسلامیان پێ بکەن ، بەرگی موسوڵمانان بکەنە بەرخۆیان ، خۆیان مەلاس بدەن هەتا بتوانن ئەو خزمەتە بکەن ، بەجۆرێ دوژمنان خۆیان ناتوانن بیکەن ، کەواتە ئێمەی موسوڵمان ئەبێ مێشکی خۆمان بەئاوی یاسای قورئان ئاو بدەین کە خوا پاراستوێتی لەدەستکاری ، دەست بکەین بەشۆڕشی دادپەروەرانە بۆ ئەوەی بەڕوونی و بێ گەردی ئاوی پاکی بێ خەوش لەسەرچاوەی قورئان هەڵگۆزین بەهەموو دانیشتوانی سەر زەوی ڕاگەیەنین وێنەی یەکەم جاری خولی یەکەمی کۆچی بێتەوە کایە بۆ بەڕێوە بردنی بوونەوەران .

هەندێ لەخاوەن نامەکان کە بۆیان دەرکەوت کینە و فێڵـە پێشـووەکانیان بـێ سـوود دەرچوو ، هاتن پەلاماری پیلانی تری زۆر خراپتریان دا ، ئەوەیش مالوم و سـەرۆکەکانیان بەهەندێ لەژێر دەستەکانی خۆیانیان ووت : سەر لەبەیانیان برۆن و بـاوەڕ بـهێنن بـەئاینی ئیسلام ، لەکۆتایی ئەو ڕۆژەدا واز لەباوەڕ بهێنن و پەشیمان ببنەوە ، بـەڵکو موسـوڵمانان بکەونە گومانەوەو ئەوانیش واز لەئاینی ئیسلام بهێنن . بۆ ڕوون کردنەوەی ئـەو مەبەسـتە خوا فەرمووی :

وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ ءَامِنُوا۟ بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَجْهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكْفُرُوٓا۟ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَا تُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّا لِمَن تَبِعَ دِينَكُمْ قُلْ إِنَّ ٱلْهُدَىٰ هُدَى ٱللَّهِ أَن يُؤْتَىٰٓ أَحَدٌ مِّثْلَ مَآ أُوتِيتُمْ أَوْ يُحَآجُّوكُمْ عِندَ رَبِّكُمْ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْفَضْلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾

﴿ وقالت طائفة من أهل الكتـاب آمنـوا بـالذي أنـزل علـى الذين آمنـوا ﴾ وەتاقمـێ لەمالوم و سەرۆکەکان لەخاوەن نامەکان ووتیان بەهەندێ لەژێر دەستەکانیان ئێـوە بـاوەڕ بهێنن بەوەی ئەوتۆ نێردراوە بۆ سەر کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە .

﴿ وجه النهار واكفروا آخره لعلهم يرجعون ﴾ لەیەکەم کاتی ڕۆژدا و بێ باوەڕ بن لەکۆتایی ئەو ڕۆژەدا ، بۆ ئەوەی باوەڕداران ، گومان پەیدا بکەن هەموویان بگەڕێنەوە بۆ لای بێ باوەڕی و چاو لەئێوە بۆکەن و بلێن : بێ هودە نی‌یە وەرگەڕانیان لەئاینی ئیسلام.

ئەو ئایەتە ئاگادارمان ئەکاتەوە لەو پیلانەی هەندێ لەسەرۆکەکانی خاوەن نامەکان پێکیان هێنا لەنێو خۆیانا ...ئایا ئەو پیلانەیان بەجێگەی خۆیان گەیاند؟ یاخوای گەورە بەر لەوەی جێبەجێی بکەن پێغەمەری ئاگادار کرد هەتا ئابڕویان ببا ، ژمارەی پیلان گێڕان چەند کەسبوون ؟ پیلانەکەیان بۆ ئەوەبوو نوێژی بەیانی بکەن لەگەڵ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ؟ لەکۆتایی ڕۆژدا پەشیمان ببنەوە و نوێژی خۆیان بکەن ؟ هەتا جگەی خۆیان لەجولەکەکان بیان بینن . بەو ئاواتەوە موسوڵمانان بۆیان دەرکەوێ خاوەن نامەکان ڕاگوویی کەرن و ڕاست وێژن و بۆیە گەڕانەوە بۆ لای نوێژی خۆیان ... وەڵامی ئەو پرسیارانە هەموویان ئەمەیە : خوای گەورە باسی نەفەرمووە ، چاك وایە بێ دەنگ بین و هەواڵەی خوای بکەین ، ئەوەی گرنگ بێ ئەو ڕووداوە ڕووی داوە . بەڵام زانایان هەریەکەیان بەجۆرێ باسیان کردووە .

﴿ ولا تؤمنوا إلا لمن تبع دينكم ﴾ وەئێوە لەناوەڕۆکی دڵتانەوە باوەڕ مەهێنن مەگەر بۆ ئەو کەسە پەیڕەوی ئاینی ئێوەی کردووە .

بەکرێ گیراوانی زایۆنی و خاچ پەرستان و کۆمۆنیستەکان لەم ڕۆژەدا ئەو ڕێبازەیان گرتووە و بەری نادەن ، بەڕاستی لەنێو خۆیانا بەنهێنی بۆ دوژمنایەتی‌کردنی موسوڵمانان پێك هاتوون باکیان لەیەکتری نی‌یە ، هیچ لایەکیان لەدژی ئەوی تریان کار ناکەن .

بەڵام هەندێکیان لەهەندێ جارا بەڕواڵەت دۆستایەتی بۆ موسوڵمانان دەر ئەبڕن بەدژی ئەو کینە و ڕقەی لەدڵیانایە و شاردراوەتەوە ، هەموو شتێکیان بۆ سازاوە ، باك و بیمیان لەهیچ کەسێ نی‌یە . ئەو کەسانەیش بەڕاستی موسوڵمانن و لەئاینی ئیسلام گەیشتوون یا لەو ناوەدا نەماون وەیا مابن دەربەدەر و چەوساوەن ، کۆت و زنجیر کراوەتە قاچ و

دەستیان ، یا لەبەندیخانە توند کراون بەدار و لێدان و کارەبا و بزمار بەقاچا کوتان سزایان ئەدرێ ، زۆربەیان ئەدرێن لەسێدارە ، یا تیرە باران ئەکرێن بەدەستی کرێ گیراوانی بەناو موسوڵمان لەخۆیان ، هەرلەبەر ئەوە ناوی یاسای قورئان ئەبەن ڕوناکی نابینرێ جگە لەو ئاگرەی کرپەی دێ لەدڵی هەندێ لەزانایان و لاوانی موسوڵمانا هەیە . داوای یارمەتی لەخوا ئەکەن و ئامۆژگاریان ئەکا و ئەفەرموێ :

﴿ قل إن الهدى هدى الله ﴾ موحەمەد تۆ بڵێ : بەڕاستی ڕانموییی و ڕێگەی ڕاست ڕانموییی خوایە و ئاینی ئیسلامە ڕێگە نیشان ئەدا بەکەسێ ئارەزوی هەبێ و بەردەوام بێ لەسەر ئاین ، کەواتە پیلانی خاوەن نامەکان زیان بەموسوڵمانان ناگەیەنێ .

خوای گەورە بەو ڕستەیە ڕوو ئەکاتە فرۆستادەی خۆی بەر لەوەی کۆتایی بەگفتوگۆی خاوەن نامەکان بهێنێ ، بۆئەوەی پێغەمەر دڵنیابێ کەپیلانی بێ باوەڕان بێ ئەنجامە ، چونکە ڕانموییی بوون بەدەستی خوایە و پیلان کار ناکاتە سەر موسوڵمانان .

﴿ أن يؤتي أحد مثل ما أوتيتم أو يحاجوكم عند ربكم ﴾ ئێوەی بەنو ئیسرائیل باوەڕ مەهێنن کە ئەبەخشرێ بەیەکێ لەجگەی بەنوئیسرائیل وێنەی شتێ بەخشراوە بەئێوە لەدەستوری تەورات و باوەڕتان وابێ جگەی بەنو ئیسرائیل ئەکرێ بەپێغەمەر ، یا باوەڕ مەهێنن بەوەی کە هیچ یەکێ ئەتوانێ بەڵگە لەدژی ئێوە بهێنێ لەلای پەروەردگاری ئێوە لەڕۆژی دواییدا .

پوختەی مانای ئەو ڕستانە بەم جۆرەیە : خاوەن نامەکان بڕوایان وابوو لەنێوان خۆیانا و لەدەروونی خۆیانا کە دروستە خوا لەجگەی بەنی ئیسرائیلی پێغەمەرێ ڕەوانە بکا ، بەڵام دوای ئەوەی موحەمەد کرا بەپێغەمەر ، لەبەردەم دانیشتوانا دەریان بڕی لەبەر دڵپیسی خۆیان کەنامەکانی ئەوان و ئاینی ئەوان پێویستی کردووە کە ئەبێ بەتەنها پێغەمەر لەبەنی ئیسرائیلی بێ ، ئەیان زانی کەخۆیان درۆزنن و سزایان ئەدرێ و بۆڕ ئەخۆن لەخزمەت خوادا لەڕۆژی دواییدا ، ئەترسان ئەو درۆکردنەی خۆیان بگا بەموسوڵمانان لەلایەن

کەسێ لەخۆیان و ئەو کاتە موسوڵمانان باشتر پەیوەست و پابەند بن بەئیسلامەوە ، لەبەر ئەوەهەندێکیان بەوانی تریان ئەوت : خۆتان بپارێزن لەوەی لەبەر دەم موسوڵمانانا بلێن : ئێمە بڕوامان وایە دروستە پێغەمەرایەتی ببەخشرێ بەجگەی بەنی ئیسرائیلی ، ئەو کاتە بیانومان نامێنێ بۆ لای خوا و بۆڕئەخۆن .

بەجۆرێکی کورت تر : خاوەن نامەکان بەتایبەتی جولەکەکان بەبێگومان ئەیانزانی کە خۆیان گومڕان بەهۆی بەدرۆخستنەوەی موحەمەد ﴿ﷺ﴾ ، ئەترسان کەیەکێ لەخۆیان ئەو ڕاستی‌یە بگەیەنێ بەموسوڵمانان ، دوایی ئامۆژگاریان دەرکردبوو جوولەکەکان ئەو ڕاستی‌یە بشارنەوە ، دەری بڕن لەنێو دانیشتوانا هەرگیز نەبووە و نابێ پێغەمەر عەرەب بێ.

زانایان مانای زۆریان بۆ ئەو ڕستانە کردووە ، هەموویان شایستەی ئەو جێگەیەن و مانا و مەبەست ناگۆڕن ، لەتەفسیری ( رغائب القرآن ) هاتووە مانا کردنی ئەو ڕستەیە زۆر گرانە ، ئەو جۆرە کردارە خراپانە ڕەوشتی جوولەکەکانە لەیەکەم کاتی پەیدا بوونیان هەتا ئەمڕۆ لەمەو دوایش ، درۆ ئەکەن و خۆیان ئەزانن درۆزنن ، بۆ سەر لێشێوان پەردەیەکی تەنك ئەدەن بەسەریا ، زۆری پێ ناچێ ئابڕویان ئەچێ و دەرئەکەوێ درۆزنن .هەر قورئان نیە بەتەنها خراپە و تاوانی ئەوانی تۆمار کردبێ ، نامە ئاینی‌یەکان بەتایبەتی ئینجیل و نامە مێژوویی‌یەکان و ڕۆژنامە و ئیزگەکان زۆربەیان مێژووی تاوانی ئەوانی دووپات کردۆتەوە.

﴿ قل إن الفضل بيد الله يؤتيه من شاء والله واسع عليم ﴾ موحەمەد تۆ بلێ : ڕێز و پێغەمەرایەتی بەدەستی خوایە ئەی بەخشێ بەکەسێ ئارەزوی هەبێ و شایستە بێ ، ئیتر ئیسرائیلی بێ یا عەرەب و جگەی عەرەب ، خوای گەورە بەو ڕستەیە جوولەکەکان بەدرۆ ئەخاتەوە کە لا یان وایە ئەبێ پێغەمەر هەر لەوان بێ .

ناوەرۆکی ئەو ئایەتە جگە لەپێغەمەرایەتی زۆر شتی تریش ئەگرێتەوە ، وەك پێغەمەرایەتی و زانست و ڕانمویی و ئیسلامەتی و هەموو کارە بەرێزەکانی تر . خوا بەزەیی و میهرەبانی فراوانە ، ئەزانێ بەسوودی هەموو ئادەمیزاد و چ کەسێ ئەکا بەپێغەمەر .

﴿ يختص برحمته مــن يشـاء والله ذو الفضـل العظيـم ﴾ بەتايبـەتی هەڵـئـەبژێرێ بـەهۆی میهرەبانی خۆیەوە هەر کەسێ ئارەزوی هەبێ بـۆ پێغەمەرایـەتی یـا بـۆ ئیسـلامەتی . خـوا خاوەنی ڕێزی زۆر گەورەیە کەئەیدا بەباوەڕداران .

خوای گەورە ووشەی ( الفضل )ی دووجـار لـەو دوو ئایەتانـەی پێشـوودا دووپـات کردۆتەوە ، یەکەمیان ئەمەیە خوا ئەبەخشێ بە هەندێ لەبەندەکانی خۆی پلە و پایەو هــەر ئەو پلەیە زۆرتر ئەکا ، مەبەست لەدووهەم ئەمەیە : خوا ئەبەخشێ بەهەر کەسێ ئـارەزوی هەبێ جگە لەو پلەیـەی پێـی بەخشـیوە پلـەی تـری جیـاواز کـە زۆر باڵاتربێ لەپلـەی پێشووەکەی ... بەکورتی هەر دوو ئایەتەکە ئەمەمان پیشان ئەدەن کە میهرەبانی و ڕێز دانی خوا بۆ بەندەکانی بێ کۆتایی‌یە ، بڕیار بەوەی چاکەی هەر بۆ چەند کەسێکە یـا بـۆ چـەند تاقمێکە بەتایبەتی ، ئەو بڕیارە بێ باوەڕی‌یە .

عەبدوڵای کوڕی سەلام پیاوێ (٨٤٠٠) مسقاڵ زێڕی لا دانا کە خاوەنەکـەی داوای کردەوە بەبێ چەند و چوون بەتەواوی دایەوە دەستی ، بەڵام فەنحاسی کوڕی عازورا پیاوێ لەقورەیشی‌یەکان دینارێکی لا دانا کە بریتی بـوو لـە (٧٢) جۆ ، سـەرچەوتی کـرد بـۆ دانەوەی ، خوای گەورە بۆ ئەو مەبەستانە فەرمووی :

وَمِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مَنْ إِن تَأْمَنْهُ بِقِنطَارٍ يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ وَمِنْهُم مَّنْ إِن تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لَّا يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ إِلَّا مَا دُمْتَ عَلَيْهِ قَائِمًا ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لَيْسَ عَلَيْنَا فِي الْأُمِّيِّينَ سَبِيلٌ وَيَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ بَلَىٰ مَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِ وَاتَّقَىٰ فَإِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ ﴿٧٦﴾

﴿ ومن أهل الكتاب مـن إن تأمنـه بقنطـار يؤديـه إليـك ﴾ وەهـەندێ هـەن لـەخاوەن نامەکان کەسێ ئەگەر تۆ بیکەی بەهێمن دارایی و سامانێکی زۆری لادانێی ئەو کەسە ئـەو سامانە زۆرە ئەداتەوە بەتۆ بەبێ چەند و چوون ، وەك عەبدوڵای کوڕی سەلام .

﴿ ومنهم من إن تأمنه بدينار لا يؤده إليـك إلاّ مـا دمـت عليـه قائمـاً ﴾ وەهـەندێکیش لەخاوەن نامەکان هەن کەسێ ئەگەر تۆ بیکەی بەهێمن داری دیناری ئەو دینـارە ناداتـەوە بەتۆ مەگەر تۆی خاوەن ماف ڕاوەستی بەسەریێوە و لێی جیا نەبیتەوە هەتا ئەت داتەوە .

پیاوی ناپاك و نادروست ئەگەر بدا بەکەسێ شتێ داوای زۆرتر لـەمافی خـۆی ئـەکا ، ئەگەر شتی خەڵکی تری لابێ یا هەر نایداتەوە یا هەندێکی لێ ئەبڕێ ، چونکـە مرۆڤـی دڵ مردوو بەتۆبزی نەبێ مافی کەس ناداتەوە ، مەبەست لەناوەڕۆکی مانـای (قائمـا) ئەمەیـە : ئەبێ لەدژی ناپاکان شۆڕش بەرپا بکرێ ، بەهەموو توانـاوە خـەبات بـۆ نەهێشـتنی سـتەم بکرێ ، پێشوواغان ووتویانە : ( سەربەخۆیی و ماف وەرئەگیرێ نابەخشرێ ) .

شۆڕش لەدژی ناپاکی و خراپەکاری پێویستی‌یەکی ئاینی و نیشـتمانی و مرۆڤایەتی‌یـە ، ئەگەر شۆڕش نەکرێ خراپە و ستەم هەموو زەوی ئەگرێتەوەس ، بەڕاستی تاوانی سـتەم لێ کراوێ توانای هەبێ بۆ نەهێشتنی ستەم لەخۆی ، بەتەواوی وەك تاوانی سـتەمکار وایـە ، چونکە هەردوو لایان ڕێگە خـۆش ئەکـەن بـۆ بـڵاو بوونـەوەی سـتەم و خراپـە . ئەگـەر ستەمکار بزانێ لەدڵی ستەم لێکراوا مەیلی فیداکاری تێدایە ستەمکار خۆی لێ ئـەپارێزێ ، تاقی کردنەوەکان بۆمانی ڕوون ئەکاتەوە نەتەوە یەکگرتووەکان و مەجلیسـی ئـەمن مـافی هیچ کەسێ نادەن بەجگەی هێز ، ژیان بۆ ئادەمیزادی خولی بیست نـەماوە ، بەتایبـەتی بـۆ نەتەوە هەژارەکان ، بەتایبەتی بۆ نەتەوەی کورد .

﴿ ذلك بأنهم قالوا ليس علينا في الأميين سبيل ﴾ ئەو نادروستی و ماف نەدانەوەی ئـەو خاوەن نامانە بەبۆنەی ئەمەیە ووتویانە : بەسەر ئێمەوە نابـێ لـەبارەی کەسـانێکەوە لەئێمـە نەبن و لەسەر ئاینی ئێمە نەبن هیچ سزا و لۆمەیە و کۆشتن و سامان خواردنیـان بـۆ ئێمـە ڕەوایە ، خوای گەورە بەپەرچیان ئەداتەوە و ئەفەرموێ .

﴿ ویقولون علی الله الکذب وهم یعلمون ﴾ وەجوولەکەکان ئـەڵێن و ئـەیدەن بەسـەر خوادا درۆو بوختان کەئەو داوایەی ئەوان لەنامـەکانیانا هەیـە و هـەموو شـتێکی جگـەی جوولەکە بۆ ئەوان ڕەوایە ، ئەوان ئەزانن خۆیان درۆ ئەکەن و بوختان بۆ خوا ئەکەن .

ئەو ڕەوشتە خراپەکاری جوولەکەکانە ، ئەو شتانە ئەکەن و ئەڵێن : ڕەوشت لای ئێمـە جۆرێکی تایبەتی‌یە ، دەست پاکی و هێمن داری هـەر بـۆ نێـوان خۆمانـە ، جوولەکـەکان جگەی خۆیان بەئۆمی و نەخوێنەوار دائەنێن و ووشەیەکی نهێنی خۆیانە . خواردنی سامانی هەموو ئادەمیزاد و نادروستی لەگەڵیان ، هەوڵدان بـۆ لـەناوبردنی هـەموو نەتەوەیـە لای ئەوان پەستی و گوناه نی‌یە ، بگرە شانازی پێوە ئەکەن و بەپەیڕەوی ئاینی دائەنێن .

هەریەکەیان بەهەر جۆرێ بێ خراپە لەگەڵ جگەی خۆیان بکەن بەئاینی پاکی ئـەزانن ، بەداخەوە هەندێ لەنەوەکانی دانیشتوانی کوردستان لەوانەی خۆیان بە نەوەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دائەنێن ، بەجگەی خۆیان ئەڵێن : ئۆمی ، نازانم ئەو کارە چۆن و بۆچی بـەکار ئەهێنن ، کەچی زۆربەی خۆیان نەخوێنەوارن .

لەهەموو شتێ سەسوڕێنەر تر ئەمەیە : خوا هەرگیز فەرمان نادا بەکاری خراپ ، کەواتە ڕەوا نی‌یە هیچ کۆمەڵێ سامان و دارایی هیچ کۆمەڵێ تـر بەسـتەم و درۆ بخۆن . کـەچی جوولەکەکان دوژمنایەتی هەموو ئادەمیزاد بەڕەوشت و ئاینی خۆیانی دائەنێن .

پرسیار / بەڕاستی هەموو تایەفە و هەموو خاوەن ئاینێ بگرە بێ ئاینەکانیش لەواندا هەیە دەست پاك و دەست پیس و ڕاست وێژ و درۆزن ، زۆر لەبێ ئاینەکان هەیە ڕاست وێژ و گەردن پاك و هێمن لەزۆر ڕۆژووەوان و نوێژکەر ، کەواتە ڕێگـە بـۆ کردنـی خراپـە بـۆ جوولەکەکان چ شتێکە ؟

وەڵام / خوای گەورە لەمەو بەر فەرمووی : تایەفەیە لـەخاوەن نامـەکان لایـان خۆشـە ئێوە لەڕێگەی ڕاست لابدەن ، لەپاشا فەرمووی : تایەفەیە لەخاوەن نامەکان ووتیان : ئێوە باوەڕ بهێنن سەر لەڕۆژ و بێ باوەڕبن لەکۆتایی ڕۆژدا ، خوا نەیفەرمووە : لەجگـەی ئـەو دوو تایەفەی خاوەن نامەکان کاردروست و دەست پاك و بەویژدان نی‌یە لەجیهاندا .

دووبارە لەوانەیە گومان ببرێ هەموو خاوەن نامەکان نادرست و بێ ویـژدان و لـەخوا نەترس بن ، خوای گەورە ئەو گومانە لائەبا و ئەفەرموێ ئەوانیش وەك تایەفەکانی تر چاك و خراپیان هەیە .

﴿ بلی من أوفی بعهده واتقی فإن الله یحب المتقین ﴾ ئەوەی ئەوان ئەیلێن وانی‌یـە ، ئـەو کارە خراپانە ئەوان ئەیکـەن سـزای لەسـەرە و تووشـی لۆمـەیان ئـەکا ، هـەندێ کـەس بەتەواوی ئەو پەیمانەی خۆیو تەوراتی جێبەجێ کردبی و خۆی پاراستبێ لـەبێ بـاوەڕی و ناپاکی و پەیمان شکاندن و ، دوایی بەڕاستی خوا خۆشی ئەوێ کەسـانێ خۆیـان ئـەپارێزن لەکارە قەدەغە کراوەکان .

إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنٗا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيۡهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٧٧﴾

زانایان لەهۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە ئەکرێن بەسێ بەشەوە :

١ - هەندێکیان ئەڵێن ئەو ئایەتە هاتوەتە خوارەوە بەتایبەتی دەربـارەی ئـەو جولـەکانـە لەمەو بەر باسی خۆیان وکردەوەکانیان کـرا کـە زاناکانیـان بەدەسـتی خۆیـان لەتـەوراتا نووسیان : جوولەکەکان هەرشتێ بکەن لەگەڵ جگەی خۆیان لەعەرەبـە نەخوێنـەوارەکان سزایان نادرێ ، هەر شتێ لەسامانی جگەی خۆیانیان لایە نابێ بیدەنـەوە ، ئـەبێ سـوێندی درۆ بخۆن بۆ نەدانەوەی ئەو سامانەی لایانە .

٢- هەندێ تر لەزانایان : ئەڵێن هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە بۆ جگەی جوولەکەکانە: یانی پیاوێ لەگەڵ پیاوێ تر لەسەر پارچەیە زەوی کەوتنە ئاژاوەوە ، کێشەکەیان بردە خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ، پێغەمەر فەرمووی بەداواکەر تۆ شایەتت هەیە ، ووتی : شایەتم نی‌یە ، بەداوا لەسەر کراوی فەرموو : تۆ سوێند بخۆ ، بەو بۆنەیەوە ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە ، داوا لەسەر کراو سوێندی نەخوارد ، پارچە زەوی‌یەکە درایەوە بە خاوەنەکەی .

٣- پێشەوا ڕازی ئەفەرموێ : ناوەڕۆکی ئەو ئایەتە هەموو فەرمانەکانی خوا و هەموو شتێ بەڵگەی لەسەر دانرابێ ، ئەو پەیمانانەی وەرگیراون لەلایەن پێغەمەرەوە ﴿ﷺ﴾ . ئەو کارەی پیاوێ لەسەر خۆی پێویست کردبێ ، ئەوانە هەمووی ئەگرێتەوە ، بەبێ جیاوازی . زۆر ڕووداوی تر بۆ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە بیژراوە ، هەموویان مەبەستەکەیان ئەوەیە بەسوێند و درۆ نابێ هیچ شتێ بەدەست بهێنرێ .

﴿ إن الذين يشترون بعهد الله وأيمانكم ثمناً قليلاً ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ بکڕن بەتێکدانی پەیمانی خوا و بەسوێندەکانیان نرخێکی کەم لەڕابواردنی جیهان بەبەرتیلدان و شتی تر .

﴿ أولئك لا خلاق لهم في الآخرة ولا يكلمهم الله ﴾ ئەو کەسانە پەیمان ئەشکێنن و سوێندی درۆ ئەخۆن هیچ بەشێکیان نی‌یە لەدواڕۆژدا لەپاداشتەکانی خوا و ، خوا گفتوگۆیان لەگەڵ ناکا بەجۆرێ دڵیان پێ خۆش بێ ، با لەبیرمان نەچێ بەها و نرخ و سارمان لەژیانی ئەمڕۆدا هەرچەندە ئەندازەی زۆر بێ و سامانی هەموو سەرزەوی بێ بەرانبەر بەو بەشەی لای خوایە لەپاشەڕۆژدا ئەوپەڕی کەمە و بێ نرخە ، چاکە و پەرستنی لێ وەرناگیرێ و جگە لەسزای گرانی دۆزەخ بەشی تری نادرێتێ و یاریدەدەرێکی نی‌یە سزای لەسەر لابا .

ئەو ئایەتە و فەرموودەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ زۆر ترین ئایەتەکان و فەرموودەی پێغەمەر شارەزایی ئێمە ئەکەن بەڕاستی ڕەوشت پەیوەندی زۆری هەیە بەئیسلامەوە ، هەر لەبەر

ئەوەیشە ئیسلام وەفا و جێبەجێ کردنی پەیمانی پێویست کردووە لەهەموو مامەڵەیە بکرێ لەگەڵ جگەی خۆی دایناوە بەمامەڵــە کــردن لەگــەڵ خــوا و نابــێ جێبــەجێ نــەکرێ ، هەرچەندە تەرەفی دووهەم بابێ ئاین بێ ، بەو مەرجەی ئــەو پەیمانــە بــەدژی بــیرو بــاوەڕی ڕەوشتی ئیسلام دەرنەچێ .

هەروەها پێویستە بەکار بــهێنرێ لەفــەرمانی دادوەریــدا و جــێ بــەجێ‌کردنی کێشــەی ئادەمیزاد، لەبەر ئەوەی ئیسلام پێویستی کردووە لەسەر دادوەر گوێ لــەدەنگی دەرونــی خۆی بگرێ ، گوێ لەبەلگــەی ڕەوشــت بگــرێ بــەر لــەگوێ گرتــن لــەئاژاوەی نێــوان دانیشتوان ... بەڕاستی ڕەوشتی بەرز بەو شێوەیە بنچینــەی یاســای ئیســلامە ، هــەر لەبــەر ئەوەیە خوا هەڕەشە ئەکا لەو کەسانەی پەیمان ئەشــکێنن و دەغــەڵی لەســپردەدا ئەکــەن ، هەڕەشەیەکی وای کردووە لەشتی تری نەکردووە بۆیە خوا ئەفەرموێ : ﴿ لا خلاق لهم في الآخرة ﴾ ، وەئەیش فەرموێ :

﴿ ولا ينظر إليهم يوم القيامة ولا يزكيهم ﴾ وەخوا بەچاوی بەزەیی ناڕوانێ بۆ لای ئەو کەسانەی لەڕۆژی هەڵسانەوەیان لــەگۆڕەکانیان و پاکیــان ناکاتــەوە لەپیســی و چەپــەڵی گوناهەکانیان ، بەو جۆرەی دۆستەکانی خۆی پاك ئەکاتەوە .

﴿ ولهم عذابٌ أليم ﴾ وەبۆ ئەو کەسانە هەیە سزایەکی زۆر ئازاردەری بەردەوام .

مەبەست لەسوێندی بەدرۆ خواردن هەموو سوێندی درۆ بۆ هــەرکارێ بــێ ، بــۆ هــەر مەبەستێ بێ ، ئاینی بێ یا جیهانی کــە ببێتــە هــۆی بــەفیڕۆدانی هــەرمافێ بــێ ، هــەموویان ئەگرێــەوە ، لەم ئایەتەوە بۆمان ڕوون ئەبێتەوە کە خوای گەورە هانمان ئەدا لەسەر پەیمان و هەڕەشەیشمان لێ ئەکا لەسەر شکاندنی پەیمان ، ئەوەیش لەبەر پاراستنی سوودی گشتی و پەرەپێدانی بڕوا بوون بەیەکتری بۆ هەموو ئادەمیزاد ، بۆ پاراستنی ئــەو مافانــەی بنچینــەی ئاسایش و خۆشی‌یە لەجیهاندا .

کۆمەڵێ لەزاناکانی جوولەکەکان ، وەك کەعبی کــوڕی ئەشــرەف ، مــالیکی کــوڕی سەیف و هەندێکی تریان کاتێ گفتوگۆیان لەگەڵ ئەکرا دەربارەی گۆڕینی شێواز و نــاوی

پێغەمەر و دەست کاری کردنی تەورات زمانیان ئەهات بەیەکا ، لەبەر ئەوە خوا فەرمووی:

وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُونَ أَلْسِنَتَهُم بِالْكِتَابِ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ الْكِتَابِ وَمَا هُوَ مِنَ الْكِتَابِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٨﴾

﴿ وإن منهم فريقاً يلوون ألسنتهم بالكتاب ﴾ وەبەڕاستی هەندی هەن لەخاوەن نامەکان تاقمێ زمانیان پێچ ئەدەن بەم لا و لادا ئەیبەن بۆ خوێندنەوەی نامەی تەورات و ئەی گۆڕن ن زۆر فەرمانی خوای لێ فڕێ ئەدەن و ئەوەی خۆیان بیانەوێ ئەیخەنە ناوی ، وەك باسی پێغەمەر و بەردەباران کردن .

﴿ لتحسبوه من الکتاب وما هو من الکتاب ﴾ بۆ ئەوەی ئێوە گومان بەن ئەوەی ئەیگۆڕن هەندێکە لەنامەی تەورات و ئەو گۆڕاوە بەشێ نی‌یە لەتەورات ، ئەگەر کەسێ ئاگای لەتەوراتی ئێستا بێ بۆی دەرئەکەوێ بوختان بۆ خوا ئەکەن و ئەڵێن خوا خواردن ئەخوا و زۆران بازی ئەکا ، ئەڵێن : پێغەمەران بەسەر خۆشی چوونەتە لای کچەکانی خۆیان و ئارەقیان خواردۆتەوە .

﴿ ویقولون هو من عند الله وما هو من عند الله ﴾ وەئەڵێن : ئەو گۆڕاوە لەلایەن خواوە هاتووە و ئەو گۆڕاوە لەلای خواوە نەهاتووە بەبێ گومان ... سی جار ووشەی ﴿ الکتاب ﴾ دووپات کراوەتەوە ، ناو بردنی دووەکانی پێشوو بۆ بەتین کردنی بڕوای موسوڵمانانە بەناوەڕۆکی ڕستەی ﴿ وما هو من الکتاب ﴾ .

﴿ ویقولون علی الله الکذب وهم یعلمون ﴾ وەخاون نامەکان ئەڵێن و ئـەیدەن بەسـەر خوادا درۆ کردن بەگۆڕینی تەورات ، وەئەوان ئەزانن درۆ ئەکەن . نمونە لـەسەر ماناکردنی فەرموودەی عیسا ئەفەرموێ : ( أبانا الـذي في السـماء ) یـانی ئەوباوکـەی ئـەوتۆی ئێمـە لەئاسمانـە ، مەبەسـتەکەی ئەوەیـە زۆر بـەلوتف و خـاوەن بەزەیییـە ، بــەڵام هــەندێ لـەسەرۆکەکانیان مانای ئەکەن بەوەی خوا باوکی ڕاستەقینەیە بۆ عیسـا و ، ئەوانـە خۆیـان ئەزانن درۆ ئەکەن .

نەگبەتی و نابووتی زانایانی ئاینی بەناو زانا ئەمەیە : ئەبنە ئامێرێکی بێ گیـان بـۆ پـووچ کردنەوەی کارە ڕاست و دروستەکان بەناوی ئەوەوە کە پیاوی خوان و ئـاین پـەروەرن . ئەو تاقمانە خوا باسی کردن لـەخاوەن نامەکان هەندێ بەناو زانای ئێسـتا وێنـەی ئـەوانن . ئێمە بەچاکی ئەیزانین لـەم سەردەمەی ئێمەدا هەندێ زانا هەن مانای قورئان ئەکەن و زمـان هەڵئەسوڕێنن و دەست ڕائەوەشێنن و پێنوسێ ئەگرن بەدەسـتیانەوە ، بـۆ ئـەوەی بـەئاواتی دڵی خۆیان بگەن ، گومانی ناڕاستی خۆیان وایە ئەو کارەی ئەوان مانای قورئانە و مەرامی خوایش ئەوەیە ، بێ شەرمانە مانای قورئان و فەرموودەکانی پێغەمــەر و بـیروڕای زانایـانی ڕابوردوو ئەگۆڕن بۆ بەدەستهێنانی کەمێ پوول و پارە .

کاتێ زاناکانی جولـەکە و گاور کۆبوونەوە لـەخزمەت پێغەمەردا ﴿ﷺ﴾ کـە بانگیـان بکا بۆ لای ئاینی ئیسلام ووتیان : ئەی موحەمەد تۆ ئەتەوێ ئێمە تۆ بپەرستین بەو جـۆرەی گاورەکان عیسا ئەپەرستن ، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فـەرمووی : پـەنا بـەخوا لـەو کـارە ، ئێمـەی موسوڵمان لـەجگەی خوا کەســی تـر ناپەرستین . فـەرمانی پـێ نـادەین هـەرگیز ، ئێمـە فەرمانمان لـەلایەن خواوە بۆ دێ و فــەرمانی وا ناڕەوامـان بـۆ نایـە ، خـوای گـەورە بـۆ مەبەستی ڕوون کردنەوەی ئەو مەبەستە فەرمووی :

مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا۟ عِبَادًا لِّى مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن كُونُوا۟ رَبَّٰنِيِّۦنَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ ٱلْكِتَٰبَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَٱلنَّبِيِّۦنَ أَرْبَابًا ۗ أَيَأْمُرُكُم بِٱلْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨٠﴾

کاتێ خوای گەورە ڕوونی کردەوە کەپیشەی زانایانی خاوەن نامەکان گۆڕینی فەرمانەکانی تەورات و فەرمانە ڕاستەکانە ، دوای ئەوە باسی بەڵگەیەکی ترمان بۆ ئەکا کە هەندێ تر لە گۆڕان کاری‌یەکان ئەمەیە بەگومانی خۆیان عیسا داوای خوایەتی کردوە ، فەرمانی داوە بیپەرستن . خوای گەورە ئابڕویان ئەبا و ئەفەرموێ :

﴿ ماكان لبشر أن يؤتيه الله الكتاب ﴾ نەبووە و شایستە نی‌یە بۆ هیچ ئادەمیزادێ عیسا بێ یا جگەی عیسا کە خوا ببەخشێ بەو کەسە نامەیە کەداوای ڕاستی ئەکا و فەرمان ئەدا بە تاك و تەنهایی خوا و قەدەغە کردنی هاوبەش بۆ خوا ، نامەکەیش وەك تەورات و ئینجیل .

﴿ والحكم والنبوة ﴾ وەپێی ببەخشێ زانست و زانیاری و تێگەیشتن و جیاکردەنەوەی چاك و خراپ و پێی ببەخشی پێغەمەرایەتی و ڕەوانەی بکا بۆ سەر ئادەمیزاد .

﴿ ثم يقول للناس كونوا عباداً لي من دون الله ﴾ لەپاشا ئەوکەسە بڵێ بەئادەمیزاد دوای ئەو ڕێزەی خوا پێی بەخشیوە و چاك و خراپی بۆ جیا کردۆتەوە ، ئێوە بن بەبەندەی

من لەجگەی خوا و من بپەرستن ، بێگومـــان خـوا کەسێ هـەڵبژێرێ بـۆ فروسـتادەیی و تێگەیشتنێ لەو نامەیە بۆی نێردراوە قەدەغەیە بۆی ئادەمیزاد بانگ بکـا بـۆ لای پەرسـتنی خۆی ، چونکە ئەو داوایە بێ باوەڕییە بەخوا .

﴿ ولکن کونوا ربانیین بما کنتم تعلمون الکتاب ﴾ وەبەڵام ئەو کەسە ئەڵێ بەئادەمیزاد، ئێوە پێویستە لەو کەسانە بن زانان بەنامەی خوا و کاری پێ بکەن و جگـەی خۆتـانی فـێر بکەن ، ئێوە ئەو نامەیە فێری ئادەمیزاد بکەن .

﴿ وبما کنتم تدرسون ﴾ وەزانابن بەشتێ ئێوە ئەیخوێننەوە و فێری ئەبن لەو نامەیە ، ئـەو ئایەتە وامان فێر ئەکا خوا پەرست ئەمەیە: نامەیخوا فێری ئـادەمیزاد بکـا ، خۆیشـی فـێر ببێ، بڵاوی بکاتەوە ، نزیکبوونەوە لەخوا بەتنها زانین نابێ ، بەڵکو لەگەڵ ئەوەدا پێویستە کاری پێ بکا . چونکە هەر فێر بوون و فێر کردنە ئادەمیزاد ئەگەیـەنێ بـەخوا و بـەئاین و نیشتمان پەروەری ، ئەبێ هەموو کارێ بۆ خوا بێ ، بۆیە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێ : پـەنا ئەگرم لەخوا لـەزانین و زانیـاری و تێگەیشـتنی سـوود بـەخش نـەبێ ، لەدڵـەوە لـەخوا نەترسێ.

﴿ ولا یأمرکم أن تتخـذوا الملائکـة والنبیـین أربابـاً ﴾ وەئـەو کەسـەی خوانامـەی پـێ بەبخشی و بیکا بەپێغەمەر فەرمان بەئێوە نادا کە ئێـوە وەربگـرن فریشـتەکان و پێغەمـەران بەپەروەردگار و پەرستراو بۆ خۆتان ، باس کردنی فریشتەکان و پێغەمەران بۆ ئەمەیە : بت پەرستان فریشتەکانیان ئەپەرست ، جولەکەکان عوزەیر و گاورەکان عیسایان ئەپەرست .

﴿ أیأمرکم بالکفر بعد إذ أنتم مسلمون ﴾ ئایا چۆن ئەوکەسەی نامەی درابێتێ و کرابێ بەپێغەمەر چۆن فەرمان ئەدا بەبێ باوەڕی بەخوا و بەشاردنەوەی ڕاستی و بەپەرستنی جگەی خوا ؟ دوای ئەوکاتەی ئێوە موسوڵمان بن و مل کەچی فەرمودەی خوا بن .

پرسیار / لەئایەتی پێشودا نـاوی سێ شـت بـراوە : ﴿ الکتـاب . الحکـم . النبـوّة ﴾ جیاوازیان لێرەدا چ شتێکە ؟

وەڵام / مەبەست لە ﴿ الكتاب ﴾ ئەو نامانەیە لەلایەن خواوە نێردراون ، وەك تەورات و ئینجیل و قورئـان . مەبەسـت لـە ﴿ الحكم ﴾زانینی فـەرمودەی پێغەمەرانـە ، بـەڵام ﴿ النبوە ﴾ هەرچەندە زانینی نامەكان و فەرمودەی پێغەمـەران ئەگرێتـەوە ، بـەڵام زانینی ئەوان پێغەمەرایەتی ناگرێتەوە ، هەموو پێغەمەرێ زانایە بەنامە و فەرموودەی خوا ، هـەموو زانایە بەنامە و بەفەرموودەی پێغەمەران ، پێغەمەر نی‌یە .

لەو ئایەتەدا خوا بەهەموو نەتەوەی پێغەمـەرانی فـەرموو : ئێـوە موسـوڵمانن ، چونكـە هەركەسێ باوەڕی بەپێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ هێنابـێ و بەفـەرموودەكانی هەڵسـابێ موسـوڵمانە ، هەروەها هەركەسێ باوەڕی بەهەر پێغەمەرێ هێنابـێ لەهـەر كاتێكـا بـێ ئـەو كەسـە لای ئیسلام بەموسوڵمان دائەنرێ .

هەركەسی پەیڕەوی ئایەتەكانی كردبێ و ، دوای فەرموودەی پێغەمەر كـەوتبێ دەسـتی ئەكەوێ دەركەوتووترین ڕووالەتێ ئیسلامی پێ جیا ببێتەوە لەئاینەكانی تـر ئەمەیـە بـەهیچ جۆرێ دروست نیە شێوازی خوایەتی بدرێتە پاڵ هیـچ كەسـێ پێغەمـەر بـێ و یـا پاشـا و دۆستی خوا ، سوودی شاراوەی دووپات كردنەوەی ئەو فەرمانە ئەمەیە : ئادەمیزاد خـۆی لەخۆیا ئارەزوی بۆ لای كاری پڕوپوچ ئەڕوا ، نمونەی ئەو بیرو بـاوەڕە لەهـەندێ لەئاینـە نادروستەكانەوە ئاشكرایە ، وەك پەرستنی پێغەمەران و قەشەكان و مالومەكان ، هەرچەندە بێژرا ئیسلام لەئاینەكانی تر بەنەپەرستنی جگەی خـوا جیـا ئەبێتـەوە ، بـەڵام لـەناو ئـاینی ئیسلامدا هەندێ تاقم هەن لە ئاینی ئیسلام دەرچوون هەندێ مرۆڤیـان كـردووە بـەخوای خۆیان یا بەپێغەمەری خۆیان ، بەتایبەتی لەو كەسانەن خۆشەویستی بنەماڵەی عـەلی كـوڕی ئەبی تالیب وای لێ كردوون بەو كـارە هەڵسـن ، زۆریـش هـەن گۆڕسـتان ئەپەرسـتن و كوڕنۆش بۆ پیرەكانیان ئەبەن .

پاش ئەوەی خوای گەورە ڕوونی كردەوە بۆ هـەموو پێغەمـەران و پـەیڕەوەكانیان كـە بنچینەی فەرمانی ئاین و دەستوور و یاسایان ئەمەیە : پەیمان و بەڵێنیان لێ وەرگیراوە بـاوەڕ

بەموحەمەد بهێنن ، بەو جۆرەی موحەمەد بڕوای بەهەموو پێغەمەرە پێشووەکان هەیە و بڕوای بەنامەکانیان هەیە ، ئەبی ئەوانیش بڕوایان بەقورئان هەبێ ، بۆیە خوا ئەفەرموێ :

وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ لَمَآ ءَاتَيْتُكُم مِّن كِتَٰبٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ ۚ قَالَ ءَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِى ۖ قَالُوٓا۟ أَقْرَرْنَا ۚ قَالَ فَٱشْهَدُوا۟ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨١﴾ فَمَن تَوَلَّىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٨٢﴾ أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾

﴿ وإذا أخذ الله ميثاق النبيين لما آتيتكم من كتاب وحكمة ﴾ موحەمەد تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە خوا وەری گرت بڕوانامە و بەڵێن لەپێغەمەران لەبەر ئەوەی ئەوتۆ من بەخشیومە بەئێوە لەنامەکان و لەو زانستە دراوە پێتان .

﴿ ثم جاءكم رسول مصدق لما معكم لتؤمنن به ولتنصرنه ﴾ لەپاشا هات بۆ لای ئێوە فرۆستادەیە لەلایەن منەوە بەڕاست گێر بو بەشتێ لەگەڵ ئێوەدایەو لەنێو نامەکانتانایە لەبڕوا بەو شتە ، بەڕاستی پێویستە بڕوا بهێنن بەو فرۆستادەیە و ئێوە یارمەتیشی بدەن بۆ

پەرەپێدانی پەرستنی خوا ئەگەر ئێوە بەخزمەتی گەیشتن ، یا ئامۆژگاری نەتەوەکەتان بکـەن باوەڕی پێ بهێنن و یارمەتی بدەن .

مەبەست لـەپێغەمەران خۆیان و پەیڕەوکانیانە ، نەك پێغەمەران بەتەنـها ، مەبەسـت لـەو فروستادەیە موحەمەدە بەتایبەتی ، یانی کە خوا ڕوونی کردەوە بۆ پێغەمەران و ئۆمەتەکانیان بنچینە و جۆری کارکردن بەئاینەکەیان و ئەو پەیمان و بڕوانامەیـەی لێ وەرگرتـن پێویستە لـەسەریان باوەڕ بە موحەمەد ﴿ﷺ﴾ بهێنن ، هەروەك ئەوەی بڕوایان بەپێغەمەرە پێشووەکان و نامەکانیان هەیە لـەتەورات و ئینجیل .

پرسیار / چۆن بیزانین پێویستە گەلانی پێشوو باوەڕ بهێنن بەئاینی گەلانی پاش خۆیان ؟

وەڵام / خـوای گـەورە سروشـی نـاردووە بـۆلای پێغەمـەرانی پێشـو بـاوەڕ بـهێنن بەپێغەمەرانی پاش خۆیان ، ڕاسپێرن بەئۆمەتەکانیان ئەوانیش باوەڕیـان پـێ بـهێنن ، بـەڵێن لـەزاناکانیان وەرگرن ئەوانیش لـەلایەن خۆیانـەوە بـەزاناکانی تـر ڕاگەیـەنن باوەڕیـان پـێ بهێنن، هەروەها چین بەچین هەتا کاتی هاتنی موحەمەد ﴿ﷺ﴾ ، ئەوانەی سەردەمی ئـەویش باوەڕی پێ بهێنن ، بێگومان هەمو پێغەمەران باوەڕیـان بەیـەکتری هێنـاوە ، نـوح بـاوەڕی بەئادەم ، ئیبراهیم بەنوح و بەئادەم ، موسا بەئیبراهیم و بەنوح و بەئادەم ، عیسـا بەموسـاو ئیـبراهیم و نـوح و ئـادەم ، باوەڕبیـان بەیـەکتری هـەبووە ، موحەمـەد ﴿ﷺ﴾ بـاوەڕی بەهەموویان هەبووە بێ جیاوازی بەخۆی و ئۆمەتیەوە .

﴿ وقال أأقررتم وأخذتم علي ذالكم إصري قالوا أقررنا ﴾ خوا فەرمووی : ئایـا ئێـوەی پێغەمەران و پەیڕەوانتان پێك هاتوون و وەرتـان گرتـووە لـەسـەر ئـەو فەرمانـەو بـەڵێن و باوەڕنامەی من بن ، کـە جـێ بـەجێ بکـەن بەتایبـەتی بـاوەڕکردن بەموحەمـەد ﴿ﷺ﴾ و یاریدەدانی ، پێغەمەران ووتیان ئێمە بڕیارمان داوە و باوەڕنامەمان وەرگرتووە .

﴿ قال فأشهدوا وأنا معكم من الشاهدين ﴾ خوا فـەرموی لـەسـەر زمـانی پێغەمـەرانی خۆیەوە : کەواتە ئێوە هەندێکتان شایەتی بـدەن لـەسـەر هـەندێ ترتـان کەئێمـە بڕیارمـان

داوەلە سەر پێغەمەرایەتی موحەمەد و باوەڕ پێکردنی و یـاریدانی و ، منیـش لـەگـەڵ ئێـوە لـەشایەتی دەرانم ، بەڕاستی خوا و پێغەمەران و فریشتەکان شایەتی ئەدەن لـەســەر زانایـانی ئاینەکان بڕیاریان داوە باوەڕ بەموحەمەد بکــەن و یـاریدەی بـدەن . بـەدژی ئـەو فەرمانـە زانایانی جولـەکە و گاور کە ئەو بڕیارە و موحەمەد بەدرۆ ئەخەنەوە .

﴿ فمن تولى بعد ذلك فأولئك هم الفاسقون ﴾ دوایی هەرکەسی وەرگەڕی لـەپاش ئەو پەیمانە و ئەو شایەتیە و بڕیاردانە باوەڕ بە موحەمەد نەهێنێ و یـاریدەی نـەدا ، دوایـی ئـەو کەسانە ئەوانەن لایـان داوە لــەئاین و لـەسـنوری خـوا دەرچـوون ، ئـەو کـردەوە خراپـە زاناکانی خاوەن نامەکان بەکاریان هێنا بەهۆی گۆڕینی تەوراتەوە باوەڕیان بەپێغەمەر نەهێنا. خاوەن نامەکان لـەنێو خۆیانا تێك چوون ، هەموو تاقمێکیـــان ئـەیان ووت : ئێمـە لـەسـەر ئاینی ئیــبراهیمین ، ڕووداوەکـەیان هێنایـە خزمـەت پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ فـەرمووی : هـەموو لایەکتان لـەسەر ئاینی ئیبراهیم نین ، ئەوانیش تووڕە بوون و ووتیان : ئێمە بەوەی تۆ ڕازی نین ، بۆیە خوای گەورە فەرموی :

﴿ أفغير دين الله يبغون ﴾ ئایا جگەی ئاینی خوا ئەوان داوای ئەکەن ؟ ئەو خاوەن نامانە بەڕاستی بزانن ئەو کەسانەی جگەی ئاینی خوا کە ئاینی ئیسلامە بپەرستن ، ئەو ئاینـەیان لێ وەرناگیرێ و گومڕا و بێ باوەڕن .

﴿ وله أسلم من في السماوات والأرض طوعـاً أو كرهـاً وإليـه يرجعون ﴾ وەبـۆ خـوا پەیڕوی ئەکەن و مل کەچی خوان کەسێ لـەنێو ئاسمان و زەویدان بەخۆشی و بەناخۆشی و، بۆ لای خو ا ئەوان ئەگێڕێنەوە بۆ وەرگرتنی پاداشت و تۆڵە ، کەواتە پەلە بکـەن بـۆ لای باوەڕ بەئاینی ئیسلام و دژایەتی ئەو ئاینە مەکەن .

هەموو ئادەمیزاد باوەڕ بەخوا ئەهێنێ بەبێ جیـاوازی لـەنێوان چـاك و خراپـدا ، بـەڵام پیاوچاکان بەئارەزوو خۆشی خۆیانەوە باوەڕئەهێنن لـەجیهاندا ، پیاو خراپان بەناخۆشی باوڕ ئەهێنن لـەڕۆژی دواییدا کاتێ پـەردەی چاویـان هەڵئـەگیرێ و چاکـە و خراپـەی خۆیـان ئەبینن، ئەو کاتە باوەڕ بەخوا ئەهێنن .

بۆ زانین : پێغەمەر و پیاو چاك و چاكە ویست جیاوازی لەنێوانیانا نی‌یە بۆمەبەست و نیازی پاك لەكاریانا ، بەلاَم پێغەمەر لەپیاو چاك جیا ئەبێتەوە كە پێغەمەر هەرگیز هەلّە ناكا ، چونكە ووتن و كردنی بەسرووشە لەلایەن خواوە ، پیاو چاك پشت بەبیرو كۆششی خۆی ئەبەستێ ، هەلّە ئەكا و ئەی پێكێ ، لەبەرئەوە ئەگونجێ دژایەتی لە نێوان دوو بیرو كۆششدا ، بەلاَم دژایەتی لەنێوان دوو پێغەمەردا نابێ و ناگونجێ ، چونكە ئەوان پشت بەسروش ئەبەستن .

خوای گەورە لەئایەتی پێشوودا باسی فەرموو كە پەیمانی لەپێغەمەران وەرگرتووە كاتی هاتنی پێغەمەر باوەڕی پێ بكەن و یاریدەی بدەن ، هەروەك پێغەمەر بڕوای بەنامەكانی ئەوان هەیە ، لەم ئایەتەدا باسی ئەمەمان بۆ ئەفەرموێ : لەڕەوشتە بەرزەكانی موحەمەد باوەڕی بەهەموو نامەكان هەیە ، ئەفەرموێ :

قُلْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿٨٤﴾ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾

﴿ قل آمنا بالله وما أنزل علينا ﴾ موحەمەد تۆ بلّی : ئێمە باوەڕمان هێناوە بەتاك و تەنهایی خوا ، بەجۆرێ ئێمە كە سی تر ناپەرستین ، باوەڕمان هێناوە بەشتێ نێراوەتە خوارەوە ، بۆ سەر ئێمە كە قورئانە .

داوەلە سەر پێغەمەرایەتی موحەمەد و باوەڕ پێکردنی و یـاریدانی و ، منیـش لـەگـەڵ ئێـوە لـەشایەتی دەرانم ، بەڕاستی خوا و پێغەمەران و فریشتەکان شایەتی ئەدەن لـەســەر زانایـانی ئاینەکان بڕیاریان داوە باوەڕ بەموحەمەد بکــەن و یـاریدەی بـدەن . بـەدژی ئـەو فەرمانـە زانایانی جولـەکە و گاور کە ئەو بڕیارە و موحەمەد بەدرۆ ئەخەنەوە .

﴿ فمن تولى بعد ذلك فأولئك هم الفاسقون ﴾ دوایی هەرکەسی وەرگەڕی لـەپاش ئەو پەیمانە و ئەو شایەتیە و بڕیاردانە باوەڕ بە موحەمەد نەهێنێ و یـاریدەی نـەدا ، دوایـی ئـەو کەسانە ئەوانەن لایـان داوە لـەئاین و لـەسنوری خـوا دەرچـوون ، ئـەو کـردەوە خراپـە زاناکانی خاوەن نامەکان بەکاریان هێنا بەهۆی گۆڕینی تەوراتەوە باوەڕیان بەپێغەمەر نەهێنا. خاوەن نامەکان لـەنێو خۆیانا تێك چوون ، هەموو تاقمێکیـان ئـەیان ووت : ئێمـە لـەسـەر ئاینی ئیـبراهیمین ، ڕووداوەکـەیان هێنایـە خزمـەت پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ فـەرمووی : هـەموو لایەکتان لـەسەر ئاینی ئیبراهیم نین ، ئەوانیش تووڕە بوون و ووتیان : ئێمە بەوەی تۆ ڕازی نین ، بۆیە خوای گەورە فەرموی :

﴿ أفغير دين الله يبغون ﴾ ئایا جگەی ئاینی خوا ئەوان داوای ئەکەن ؟ ئەو خاوەن نامانە بەڕاستی بزانن ئەو کەسانەی جگەی ئاینی خوا کە ئاینی ئیسلامە بپەرستن ، ئەو ئاینـەیان لێ وەرناگیرێ و گومڕا و بێ باوەڕن .

﴿ وله أسلم من في السماوات والأرض طوعـاً أو كرهـاً وإليـه يرجعـون ﴾ وەبـۆ خـوا پەیڕوی ئەکەن و مل کەچی خوان کەسێ لـەنێو ئاسمان و زەویدان بەخۆشی و بەناخۆشی و، بۆ لای خو ا ئەوان ئەگێڕێنەوە بۆ وەرگرتنی پاداشت و تۆڵە ، کەواتە پەلە بکـەن بـۆ لای باوەڕ بەئاینی ئیسلام و دژایەتی ئەو ئاینە مەکەن .

هەموو ئادەمیزاد باوەڕ بەخوا ئەهێنێ بەبێ جیـاوازی لـەنێوان چـاك و خراپـدا ، بـەڵام پیاوچاکان بەئارەزوو خۆشی خۆیانەوە باوەڕئەهێنن لـەجیهاندا ، پیاو خراپان بەناخۆشی باوەڕ ئەهێنن لـەڕۆژی دواییدا کاتێ پـەردەی چاویـان هەڵئـەگیرێ و چاکـە و خراپـەی خۆیـان ئەبینن، ئەو کاتە باوەڕ بەخوا ئەهێنن .

بۆ زانین : پێغەمەر و پیاو چاك و چاكە ویست جیاوازی لەنێوانیانا نی‌یە بۆمەبەست و نیازی پاك لەكاریانا ، بەڵام پێغەمەر لەپیاو چاك جیا ئەبێتەوە كە پێغەمەر هەرگیز هەڵە ناكا ، چونكە ووتن و كردنی بەسرووشە لەلایەن خواوە ، پیاو چاك پشت بەبیرو كۆششی خۆی ئەبەستێ ، هەڵە ئەكا و ئەی پێكێ ، لەبەرئەوە ئەگونجێ دژایەتی لە نێوان دوو بیرو كۆششدا ، بەڵام دژایەتی لەنێوان دوو پێغەمەردا نابێ و ناگونجێ ، چونكە ئەوان پشت بەسروش ئەبەستن .

خوای گەورە لەئایەتی پێشوودا باسی فەرموو كە پەیمانی لەپێغەمەران وەرگرتووە كاتی هاتنی پێغەمەر باوەڕی پێ بكەن و یاریدەی بدەن ، هەروەك پێغەمەر بڕوای بەنامەكانی ئەوان هەیە ، لەم ئایەتەدا باسی ئەمەمان بۆ ئەفەرموێ : لەڕەوشتە بەرزەكانی موحەمەد باوەڕی بەهەموو نامەكان هەیە ، ئەفەرموێ :

قُلْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿٨٤﴾ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾

﴿ قل آمنا بالله وما أنزل علينا ﴾ موحەمەد تۆ بڵێ : ئێمە باوەڕمان هێناوە بەتاك و تەنهایی خوا ، بەجۆرێ ئێمە كە سێ تر ناپەرستین ، باوەڕمان هێناوە بەشتێ نێراوەتە خوارەوە ، بۆ سەر ئێمە كە قورئانە .

﴿ وما أنزل على ابراهيم وإسماعيل وإسحاق ﴾ وەئێمە باوەڕمان هێناوە بەشتێ نێردراوەتە خوارەوە بۆ سەر ئیبراهیم هەردوو کوڕەکانی کە ئیسماعیل و ئیسحاقن ، نامەی ئەو دوو کوڕانەی هەر ئەو نامەیە بووە هاتووە بۆ ئیبراهیم ، چونکە نامەیان بۆ نەهاتووە .

﴿ ويعقوب والأسباط ﴾ وەبڕوامان هێناوە بەشتێ نێراوەتە خوارەوە بۆ سەر یەعقوب و کوڕەکانیو ئەو هۆزانەی هەریەکەیان لەنەوەی یەك باوکن چین بەچین ، نامەی ئەمانیش هەر نامەی ئیبراهیمە .

﴿ وما أوتي موسى و عيسى والنبيون من ربهم ﴾ وەباوەڕمان هێناوە بەشتێ بەخشراوە بە موسا کەتەوراتە و کارە پەك خراوەکانێتی و بەوەی هاتوە بۆ عیسا کە ئینجیلە و کارە بەکەس نەکراوەکانێتی و بەوەیش بەخشراوە بەپێغەمەرەکانی تر ، وەك شیس و ئیدریس و شوعەیب و پێغەمەرانی تر ، ئەو نامانە هەموویان لەلایەن پەروەردەکەری خۆیانەوە بەوان بەخشراوە .

﴿ لا نفرق بين أحد منهم ونحن له مسلمون ﴾ ئێمە جیاوازی ناخەینە نێوان هیچ یەکێ لەو پێغەمەرانە باوەڕمان بەهەموویان هەیە ، نەك وەك جوولەکەکان باوەڕیان بەعیسا و موحەمەد نییە ، گاورەکان باوەڕیان بەموحەمەد نییە ، هەموویان بەڕاست ئەزانین . ئێمە بۆ پەروەردگار مل کەچین سەری بەندایەتی بۆ دائەنوێنین و خۆمان بەو ئەسپێرین .

﴿ ومن يتبع غير الإسلام ديناً فلن يقبل منه ﴾ وەهەرکەسێ داوای ئاینێ بکا جگەی ئاینی ئیسلام ، ئەو ئاینەی جگەی مل کەچی کردنبێ بۆ ۆخوا ، دوایی ئەو ئاینە لەو کەسە وەرناگیرێ .

﴿ وهو في الآخرة من الخاسرين ﴾ وەئەو کەسەی جگە لەئاینی ئیسلام بکا بەئاینی خۆی لەڕۆژی دواییدا لەو کەسانەن زیانۆمەند و بێ بەشن لەپاداشتی خوا و سزادان بەشیانە .

لێرەدا واچاکە ئاماژە بۆ بیرو بۆچوونی هەندێ لەو کەسانە بکەین ئایەتی (٦٢) لە سورەتی ئەلبقەرەدا ئەکەن بەبەڵگە لەسەر ئەوەی جیاوازی لەنێوان موسوڵمان و گاور و سابیئیدا نی‌یە بەو مەرجەی باوەڕ بهێنن بەخوا و ڕۆژی دوایی ، ئەو بیروبۆچوونە هەڵەیە لە دوو ڕێگەوە : -

١- مەبەست لەو کەسانەی باسکراون لەو ئایەتەدا کەسانێکن بەباوەڕەوە و لەسەر کردەوەی چاك مردبن بەر لەهاتنی موحەمەد و ئاینی ئیسلام .

٢- ئەو ئایەتەی سورەتی ئەلبەقەرە هەرچەندە بەڕواڵەت هەموو کاتێ ئەگرێتەوە ، بەلام ئەم ئایەتەی ﴿ ومن يتبع غير الإسلام ديناً ﴾ ئەو کەسانە دەرئەئکا لەدوای هاتنی پێغەمەری ئیسلام باوەڕی بەموحەمەد نەهێنابێ ئەفەرموێ : ﴿ وهو من الخاسرين ﴾ .

بەڕاستی ڕێگەیە دەست ناکەوێ ببێتە هۆی بەختیاری جگەی گەڕانەوە بۆلای ئاینی ئیسلام ، بەلام نابی مانای ئایەتەکانی قورئان دەستکاری بکرێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دانەنرێ . کەواتە ئیسلام تەنها بەوە نابێ بەزمان شایەتمان بهێنێ و پەیڕەوی تەواوی نەکا ، داوای یارمەتی لەجگەی خوا بکا . پێویستە بەهەموو جۆرێ پەیڕەوی پیچغەمەر بکا پابەندبێ بەبیروباوەڕی ئەوەوە ، پەیڕەوی یاسای قورئان بکا بەهەموو شێوەیەك .

هاوار و بەدبەختی بۆ نەتەوەی عەرەب کە بەر لەهاتنی ئاین ژێر دەستەی فارسەکان و ڕۆمەکان بوون ، لەنێو خۆیانا ناکۆکبوون ، بەلام کاتێ ئاینی ئیسلام باڵی کێشا بەسەریانا هەوری ڕەش بەسەریانەوە نەما ، ئاسایش پەرەی سەند لەجیهاندا و دەنگی کپ کراوی نەتەوەکان بەرز بویەوە ، سەرۆکایەتی و گەورەیی کەوتە دەست موسوڵمانان و بوون بە بەڕێوەبەری هەموو ئادەمیزاد ، دوای ئەوەی ژێر دەستە و چەوساوە بوون .

موسوڵمانان بەو جۆرە بوون لەسەردەمی کۆندا ، بەلام زەوی خڕە و بەبازنەی خۆیا ئەسوڕێتەوە ، کاتێ گەڕانەوە بۆلای سەردەمی بەر لەئیسلام ، ئەو کەسانەی خزمەت کاریان بوون بەسەریانا زاڵ بوون ، ئاین و نیشتمان و سامان و ناموسیان لێ وەرگرتن ،

هەلیان بۆ هەلکەوت بەو پشت کردنەیان لەئاینی ئیسلام ۆ، زۆربەی کاربەدەستانی بەناو موسولمانخۆیانیان فرۆشت بەبەریتانیا و ئەمەریکا و فەڕەنسا و ڕۆژئاواییەکانی تر ، لەبریتی ڕێز و نرخی پێشویان بێ ڕێزی داوێن پیسی و مەی خواردنەوە و قومارکردن و خزمەت کاری و سوڕدان و چەوساوەییان وەرگرت ، لەلایەکی ترەوە هەندێ تر بەناو موسولمان بوون بە ئەلقە لەگوێی ڕوسیا و چین و ڕۆژهەلاتیەکانی تر ، هەردوولایان شانازی بەگەورەکانی خۆیانەوە ئەکەن ، ئاینی خۆیانیان لەبیر چوەتەوە ، چونکە مەی خواردن و داوێن پیسی لەوان قەدەغە کردووە .. بەلام ئەوەیان پێ خۆشە بن بەئاژەل بۆ ئەوان هەتا خۆیان بەنان و ئاوی خۆیان قەلەو بکەن ، دوایی ئەلێن بەگەورەکانیان فەرموون کاتی سەربڕینمان هاتووە ، سامان و نەوت و ناموسی خۆیان ئەدەنە دستیان و ئەوانیش نۆشی ئەکەن ئامۆژگاریان ئەکەن هەرگیز بڕواتان بە برا و هاونیشتمانەکانی خۆتان نەبێ چونکە ئەوان ئەیانەوێ ئەم چاکەیە هەتانە بەردەوام نەبێ . نازانم موسولمانان چ کاتێ لەخەوی گێلی خەبەریاون ئەبێتەوە ؟

مرۆڤێکی دانیشتوی مەدینە موسولمان بوبو ، لەپاشا لەئاین وەرگەڕا ، هەوالی بۆ خزمەکانی نارد بچنە خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئایا پەشیمان بوونەوەم لێ وە رئەگیرێ ؟ خوای گەورە وەلامی دایەوە بەم چوار ئایەتەی دووایی.

پێویستە بزانرێ ئەو کەسانەی ئاینی ئیسلام وەرناگرن بەو جۆرەی خوا ئەیەوێ ، دوای ڕاستی ئیسلام نەکەوێ و هەوسی خراپی نەی هێشت باش وەری گرێ ئەو کەسانەیە زەرەرۆمەندن ، خوا لەسزایان نابورێ ، خوای مەزن ئەفەرموێ :

كَيْفَ يَهْدِى ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓا۟ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ

ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمۡ أَنَّ عَلَيۡهِمۡ لَعۡنَةَ ٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ﴿٨٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿٨٩﴾

﴿ كيف يهدي الله قوماً كفروا بعد إيمانهم ﴾ چۆن خوا ڕانموویی کۆمەڵێ ئەکا بێ باوەڕ بووبن پاش باوەڕهێنانیان ، مەبەست لەوکۆمەڵە زاناکانی جوولەکەکان و گاورەکانە .

﴿ وشهدوا ان الرسول حق ﴾ وئەو تاقمە شایەتیان داوە کە بەڕاستی ئەو فرۆستادیە کە موحەمەد ڕاستە کە پێغەمەرە و ئاینەکەی ڕاستە ، وەك لەئایەتی (٨١) دا باسی کرا .

﴿ وجاءهم البينات ﴾ وەهاتوە بۆ لای ئەو کۆمەڵە چەندین بەڵگەی ئاشکرا لەسەر پێغەمەرایەتی ئەو فروستادەیە کەچی باوەڕی پێ ناهێنن و واز لەپەیڕەوی ئەو ئەهێنن .

﴿ والله لا يهدي القوم الظامين ﴾ وەخوا ڕانموویی کۆمەڵی ستەمکاران ناکا بەومەرجەی بەردەوامبن لەسەر بێ باوەڕی .

پرسیار / لەناوەرۆکی ئەو ئایەتەوە واماں بۆ دەرئەکەوێ خوا نایەوێ ئەو کۆمەڵە بگەڕێنەوە بۆ لای ئاینی ئیسلام ، با ئەو کۆمەڵە هەوڵی پەشیمان بوونەوە بدەن ، کەواتە ئەوان شایانی سزادان نین .

وەڵام / خوای مەزن بەڵگە لەسەر ڕاستی دائەنێ بۆ بەندەی خۆی ، دوایی ئەگەر باوەڕی هێنا ئەو بەندەبە ڕانموویی وەرگرتووە ، ئەو ڕانموویی‌یەش بەدەستی خوایە ، چونکە بەڵگەی لەسەر ڕاستی داناوە ، ڕانموییش پەیدا ئەبێ لەوبەندەوە ، لەبەرئەوەی ڕانمویی

وەرگرتووە بە ئارەزوی خۆی ، دوایی ئەگەر لەئایین وەرگەڕا خوا وازی لێ ئەهێنێ و جارێ تر بەڵگەی تازەی زیاتری بۆ دانانێ ، زۆریشی لێ ناکا ڕانمویی وەربگرێ .

﴿ أولئك جزاءهم أن عليهم لعنة الله والملائكة والناس أجمعين ﴾ ئەو کۆمەڵە پاداشتیان ئەوەیە کە بەڕاستی لەسەریانە دووربن لەبەزەیی خواو خەشمی خواو لەسەریانە نەفرەتی فریشتەکان و پاڕانەوەیان لە خوداکە سزایان بدا و دووریان بخاتەوە لەبەزەیی خۆیی و، نەفرەتی ئادەمیزادیش پاڕانەوەیانە لەخوا بۆ ئەو سزادانەیان ، هەموو ئەو نەفرەتانە لەوانەوەیە بەگشتی .

﴿ خالدين فيها لا يخفف عنهم العذاب ولا هم ينظرون ﴾ بەردەوامن ئەو کەسانە لەنێو ئەو خەشم و نەفرەتەدا و ئەبێتە هۆی چوونیان بۆ ناودۆزەخ ، سووك و ئاسان ناکرێ لەوان سزای دۆزەخ لەپاشە ڕۆژدا و ئەو تاقمە مۆڵەتیان نادرێ ، زوتر پەلە لەسزایانا ئەکرێ .

مانای ئەو ئایەتانەی پێشوو پەلاماردانێکی زۆر ترسناکە بۆ کەسی خاوەنی باوەڕبێ ، بۆ کەسێ بتوانێ کارێکی چاکە بکا لەم ڕۆژەدا بۆ پاشە ڕۆژی خۆی کەچی واز لە چاکە بهێنێ . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەرگای پەشیمان بوونەوە دانەخراوە لەڕووی ئەو کەسانەدا گومڕابوون و ئەیانەوێ پەشیمان ببنەوە ، زۆریش لەکەس ناکرێ بۆ پەشیمان بوونەوە ، بۆیە خوای مەزن ئەفەرموێ :

﴿ إلا الذين تابوا من بعد ذلك وأصلحوا ﴾ مەگەر کەسانێکی ئەو تۆ پەشیمان بوونەتەوە لەبێ باوەڕی لەپاش وەرگەڕانی لەئایینی ڕاستی ئیسلام ، خۆیانیان چاك وپاك کردبێتەوەو ، بیانەوێ بەردەوامبن لەسەر ئاینی ئیسلام و نەگەڕێنەوە جارێ تر دووهەم بۆلای بێ باوەڕی .

﴿ فإن الله غفور رحيم ﴾ دوایی بەڕاستی خوا لێ خۆشبوونی زۆرە بۆ گوناهباران و پەشیمان بوونەتەوە ، زۆرخاوەنی بەزەیی و میهرەبانیە بۆیان .

پرسیار / ئەگەر کەسێ باوەڕی هێنا بێ ، لەپاشا وەرگەڕا لەئایین ، جارێ تر موسوڵمان بیبێتەوە بەڵام تەمەڵی و سستی بکا بۆ بەجێ هێنانی نوێژ و ڕۆژوو جگەی ئەوان ، باوەڕی دامەزراوبێ ، ئایا ئەو کەسە پەشیمان بوونەوەی لێ وەرئەگیرێ ؟

وەڵام / بێگومان ئەو کەسانە پەشیمان بوونەوەیان لێ وەرئەگیرێ ، چونکە پەشیمان بوونەوەکە تەنها بۆ بێ باوەڕیە ، نەك بۆ نوێژ و ڕۆژوو .

بۆ زانین : ئەو کەسانە پەشیمان نابنەوە و بەردەوامن لەسەر بێ باوەڕی و ئەو کەسانەیش چوونەتە خوارەوە لەبێ باوەڕیدا بەبێ بەڵگە ، هەتا هەلیان لەکیس ئەچێ و ماوەی تاقی کردنەوەیان لەدەست ئەچێ بەمردنی خۆیان ، کاتێ پاداشت دەست پێ ئەکا ، ئەو کەسانە پەشیمان بوونەوەیان بۆ نی‌یە و ڕزگاریان نابێ ، سودیان پێ ناگەیەنێ بەرتیل دانیان پڕبەزەوی بێ زێڕ و ئەو شتانەی خۆیان لایان بەنرخن ، ئەوکەسانەی باسکران لە خاوەن نامەکان کە بەر لەهاتنی پێغەمەر باوەڕیان پێ هێنا بوو کەچی لەدواییدا باوەڕیان پێ نەهێنا سزای گەورەیان ئەودرێ وەك باسی کرا لەو ئایەتەدا .

هەرچەندە لەمەوبەر باسی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتانە کرا ، بەڵام زانایان بۆ هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتانە ئەبن بەدوو بەشەوە :

١- هەندێکیان ئەڵێن : هاتۆتە خوارەوە دەربارەی کۆمەڵێ لەعەرەبەکان باوەڕیان هێناوە لەدواییدا لەئاین وەرگەڕان و چون بۆ مەکە.

٢- هەندێ تریان ئەڵێن : هاتنە خوارەوەی دەربارەی خاوەن نامەکان بووە کە باوەڕیان هێنا بوو بەتەورات و بەئینجیل ، لەپاشا وەرگەڕان لەئایین بەهۆی گۆڕانی نامەکان و باوەڕ نەهێنانیان بەموحەمەد ﴿ﷺ﴾ دوای ئەوەی بڕیاریاندابوو باوەڕی پێ بهێنن .

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ ثُمَّ ٱزْدَادُواْ كُفْرًا لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ

وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كُفَّارٞ فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡ أَحَدِهِم مِّلۡءُ ٱلۡأَرۡضِ ذَهَبٗا وَلَوِ ٱفۡتَدَىٰ بِهِۦٓۗ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٩١﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتانە ئەمەیە : جوولەکەکان باوەڕیان بەعیسا نەهێنا بوو ، لەپاشا ئەو بێ باوەڕیەیان زۆرتر کرد بەوەی باوەڕیان بەموحەمەد ﴿ﷺ﴾ و بەقورئان نەهێنا، هەندێ لەزانایان ئەڵێن : دەربارەی هەموو بێ باوەڕان هاتووەتەخوارەوە .

﴿ إن الذين كفروا بعد إيمانهم ثم ازدادوا كفراً ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەما بەتەورات و بەئینجیلۆ بەوەی دەستکاریان کردن لەپاش ئەوەی باوەڕیان بەوانە هەبوو، لەپاشا زۆرتریان کرد بێ باوەڕیەکەی خۆیان بەهۆی باوەڕنەهێنانیان بە موحەمەد ﴿ﷺ﴾ .

﴿ لن تقبل توبتهم وأولئك هم الضالون ﴾ وەرناگیرێ پەشیمان بوونەوەی ئەو کەسانە ، چونکە پەشیمان نەبوونەوە هەتا کاتی سەرەمەرگ ، یا پەشیمان بوونەوەکەیان بەڕاستی نەبووە .

ئەو کەسانە ئەوانەن لەسەر ڕێگەی ڕاست لایان داوە و گومڕابوون ، بەپوچی پەشیمان بونەتەوە .

پرسیار / خوای مەزن لەئایەتەکانی پێشوودا فەرمانی داوە بەوەرگرتنی پەشیمان بوونەوەی ئەو کەسانەی بێ باوەڕ بوون پاش ئەوەی باوەڕیان هێنابوو ، لەم ئایەتەدا ئەفەرموێ : هەرگیز پەشیمان بوونەوەیان لێ وەرناگیرێ ، کەواتە چۆن ماناکانیاۆن پێکەوە ئەنوسێن ؟

وەڵام / زانایان وەڵامی زۆریان داوەتەوە ، لەهەموویان بەهێز تر ئەمەیە : کەبێ باوەڕان لەپاش ئەوەی بێ باوەڕ ئەبن ئەکرێن بەسێ بەشەوە :

١- ئەو کەسانەی پەشیمان ئەبنەوە بەنیازی پاك و بەبێ گومان ، ئەو کەسانە خوا دەربارەیان ئەفەرموێ : ﴿ إن الذين تابوا ﴾ .

٢- ئەو کەسانەی پەشیمان ئەبنەوە بەلاوازی و گومانەوە ، ئەو کەسانە خوا دەربارەیان ئەفەرموێ : ﴿ لن تقبل توبتهم ﴾ .

٣- ئەو کەسانەی بەبێ باوەڕی ئەمرن ئەوانە خوا لەمافیانا ئەفەرموێ :

﴿ إن الذين كفروا وماتوا وهم كفار ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە و ئەوان مردوون بەبێ باوەڕی.

﴿ فلن يقبل من أحدهم ملءُ الأرض ذهباً ولو افتدى به ﴾ دوایی هەرگیز وەرناگیرێ لە یەکێ لەو کەسانە بەبێ باوەڕی مردوون پڕی زەوی زێڕ ، باوەکو ئەو کەسە بیکا بەفیداکاری خۆی بەپڕی زەوی لەزێڕ بۆ پاراستنی لەسزای خوا .

﴿ أولئك لهم عذاب أليم وما لهم من ناصرين ﴾ ئەو کەسانە بۆیان هەیە کە مردوون لەسەر بێ باوەڕی سزایەکی خاوەن ئازار و ، بۆیان نی‌یە هیچ یاریدەدەرێ بۆ لابردنی ئەو سزایە لەسەریان و ئەو کەسانە لەڕیزی باوەڕداران ناژمێرێن .

پرسیار / لەڕۆژی دواییدا زێڕ و سامان نی‌یە و ڕێگە بۆ پەیدا کردنیان نەماوە ، ئەبێ سوودی باسکردنی چ شتێ بێ؟

وەڵام / مەبەست ئەوەیە ڕێگە بۆ بەرتیل و فیداکاری و یارمەتیدان بەدەست نایە بەهیچ جۆرێ .

ئادەمیزاد هەرگیز پاداشتی گەورەی دەست ناکەوێ کەببێتە هۆی بەزەیی خوا و دەست کەوتنی بەهەشت ، هەتا واز لەهەموو خۆشەویستانی خۆی نەهێنێ لەبەرخوا ، بۆ ئەو مەبەستە خوا ئەفەرموێ :

لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٩٢﴾

هەرگیز ئێوە ناگەن بەرێز گیراوی لای خوا و ناگەن بەپاداشتی چاك هەتا ئێوە نەیبەخشن لەو شتانەی ئێوە خۆشتان ئەوێ لەخۆتان و لەدارایی و خێزانتان لەبەر خوا و ، هەرشتێ ئێوە ببەخشن لەو شتەی خۆشەویستە لای ئێوە ، دوایی بەڕاستی خوا بەو شتە ئەزانێ . ئەو شتانەی خۆشەویستن لای ئێوە زۆر شتن ، وك پلە و پایە و سامان و زانیاری و گیانی خۆتان و ئاسایش و خانوو نیشتمان و خێزان .

بەڕاستی ئادەمیزاد زۆر خۆ گر و ڕژدن بۆ لەناوبردنی خۆیان و سامان و پلەیان . بە تایبەتی دارایی چاکترین شتە بۆ تاقی کردنەوەی باوەڕی ڕاست و پووچ ، بەچاو ئەبینرێ لە کۆنەوە هەتا ئێستا سامان و پارە و پول و پایە گەورەترین پەرستراوی ملیۆن کەسن ، لەوڕووەوە زۆر کەس ئاگایان نامێنێ گومانیان وایە کە خوا پەرستن ، کەچی ئەوان لەناوەرۆکا پول و پارە و دراو پەرستن نەك خوا ، خۆیان هەستی پێ ناکەن ، ئەگەر بەباشی وورد ببینەوە بت پەرست و پارە پەرست لەیەك جیا ناکرێنەوە ، هەرچەندە هەردوولایان ئادەمیزاد لەخوا پەرستی لا ئەدەن ، بەلاّم ئەو کارە خراپانە سامان بەسەر ئادەمیزادا ئەی هێنێ ، شتی تر ئەو کارە ناکا ، ئەو کەسانەی نادروستی لەنێو خۆیانا ئەکەن ، برا و هاونیشتمانی خۆیان ئەکوژن ، نیشتمانی خۆیابن ئەدۆڕێنن و ناموسی خۆیان ئەڕوشێنن هەر بۆ پول و پارەیە ، ئەو کەسانەی بەگژ پێغەمەران و پیاو چاکان و زانایانی ئیسلامدا ئەچن و نایەلّن داد پەروەری بچەسپێ هەر بۆ پول و پارە ودینار و دۆلارە ئەو کەسانەی نامەکانی خوا وەرئەگرن و بڕیار بەبیرو بۆچوونی لاواز ئەدەن هەر بۆ پارە و سامان پەیدا کردنە .

بەڕاستی ئەو کەسانە داویان بۆ پێغەمەران و چاکەکەران ئەنایەوە و پیلانیان دژی ئایین و نیشتمان ودۆست دروست ئەکرد ، لەگەڵ دوژمنانی ئاین و نیشتمان پێك ئەهاتن بۆ فرۆشتنی سامان و nامووسی دانیشتوان زۆر خراپترن لەبت پەرستان و بێ ئاینیان کەنارەوایی بۆ گەل و نیشتمانی خۆیان بکار نایەرن . ئیتر بانوێژ و زەکات و حەج بەجێ بهێنن .

پرسیار / ئەو ئایەتە بەرووالەت وامان پیشان ئەدا هەرکەسێ دارایی خۆی نەبەخشێ چاکەی دەست ناکەوێ ، کە چی زۆربەی ئادەمیزاد خاوەنی سامان نیە هەتا بیبەخشێ ؟

وەلام / ئەو ئایەتە بۆ خاوەن سامانەکانە بەتەنها . بەلام هەژاران کە خاوەنی هیچ شتێ نەبن ، ئەبێ ئەوان وەرگری سامانەکان بن ، نەك بەخشندەی سامان ، بگرە هەژاران کە خۆیان دائەنێن بۆ بەرزی ئیسلام پلە و پایەیان زۆر بەرزترە لەو کەسانە بەتەنها سامانی خۆیان ئەبەخشن ، خۆ ئەگەر هەژاران ڕازی بن بەبەشی خوا ئەوەچاکترە بۆ بەرزی پلەیان ئەگەر بەڕاستی نیاز بکەن ئەگەر سامانیان ببوایە ئەیان بەخشی لەڕێگەی خوادا ، لەو کاتەدا وادائەنرێن کە بەخشندەن.

## بەیاریدەی خوا کۆتایی پێ هات لەڕۆژی چوارشەممە

## (١٩/٨/١٩٩٨) ی زاینی

زۆر تر لەئایەتێ بۆمان ڕوون ئەکاتەوە کە پێغەمەری ئیسلام ﴿ﷺ﴾ و هەموو پەیڕەوەکانی لەسەر ئاینی پاکی ئیبراهیمن ، باوەڕیان بەخوا و بەونامانە هەیە هاتۆتە خوارەوە بۆ سەر ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و کوڕ و نەوەکانی و موسا و عیسا و پێغەمەرانی تر ، کەواتە بۆمان دەرئەکەوێ هەرشتێ لەئاینی ئەواندا قەدەغە بوبێ لەئاینی ئیسلامیشدا قەدەغەیە . جولەکەکان بڕوایان وایە کە گۆشتی ووشتر و شیرەکانیان قەدەغەیە خواردن و خواردنەوەیان لەئاینی پێغەمەرە پێشووەکاندا کەچی موحەمەد لای وایە ڕەوان ، ئەوەی ئەو لەگەڵ ئاینی ئیبراهیما ناگونجێ کەموحەمەد ئەڵێ من لە سەر ئاینی ئیبراهیمم ، بۆیە جولەکەکان ئەوانەیان ئەکرد بەبڕو بیانوو بڵاویان ئەکردەوە هەتا بەو مەبەستانە گومان بخەنە نێو ئاینی ئیسلامەوە ، موحەمەد دژی خۆیەتی چونکە خواردنی ئەوانە لەئاینی ئیبراهیمدا قەدەغەن و ئەم بەرەوایان دائەنێ ، لە هەمان کاتا لای وایە لەسەر ئاینی ئیسلامە ، خوای مەزن ئابڕویان ئەبا و ئەفەرموێ :

كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسۡرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ مِن قَبۡلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوۡرَىٰةُۚ قُلۡ فَأۡتُواْ بِٱلتَّوۡرَىٰةِ فَٱتۡلُوهَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٩٣﴾ فَمَنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩٤﴾ قُلۡ صَدَقَ ٱللَّهُۗ فَٱتَّبِعُواْ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٩٥﴾

﴿ كل الطعام كان حلالاً لبني إسرائيل ﴾ هەموو خواردەمەنی‌یە ڕەوا بــووە بۆ بەنی ئیسرائیلی ئیبراهیم و پێغەمەرەکانی تری دوای ئەو قەدەغەیان نەکردووە ، گۆشتی هوشتر و شیرەکانیشیان قەدەغە نوبوون لەسەریان ، کەواتە جولەکەکان درۆ ئەکەن لەبەستنی قەدەغە کردنی ئەو شتانە بەپێغەمەرانەوە .

﴿ إلاّ ماحرم إسرائيل على نفسه ﴾ مەگەر شتێ ئیسرائیل کەناز ناوی یەعقوبە قەدەغەی کردبێ لەسەر خۆی ، هەندێ خواردەمەنی لەسەر خــۆی قەدەغە کردبوو لەبەر چەند هۆیەك ، لەپێشەوە قەدەغەی نەکر دبوو ، بۆ نمونە : هەندێ کەس جگەرە ناخواتەوە لەبەر تەندروستی یا شتی تر ، یا خواردەمەنی‌یە تر ناخوا لەبەر بەرزبوونەوەی ڕادەی لیێدانی خوێن یا دابەزینی ، یا لەبەر کەم کردنەوەی شەکر هەندێ خواردەمەنی ناخوا .

زانایان بیریان جیاوازە کە هۆی قەدەغە کردنی ئەو خواردەمەنی‌یە چ شتێ بێ ، هەموویان ئەگەڕێنەوە بۆلای ئەمە : کە یەعقوب نەخۆشی‌یەکی تووش بوبو ، ئەویش پێویستی کرد لەسەری ئەگەر خوا ڕزگارم بکا لەم نەخۆشی‌یە فلان خواردەمەنی کە زۆر لام بەلەزەتە نەی خۆم ، بەو بۆنەوە دەستوری بەنی ئیسرائیلی ڕۆیشت لەسەر پەیڕەوی کردنی نەخواردنی ئەو شتانە باوکیان قەدەغەی کردبوو لەسەر خۆی .

﴿ من قبل أن تنزل التوراة ﴾ لەپێش ئەوەی کە تەورات ڕەوانە بکرێ بۆ سەر موسا . ئەگەر جولەکەکان لەسەر ئەو کارە ئەڕۆن و خۆیان بەڕاست ئەزانن

﴿ قل فأتوا بالتوراة فاتلوها ﴾ موحەمەد تۆ بلێ : کەواتە ئێوە تەورات بهێنن ، دوایی ئێوە بیخوێننەوە بۆتان دەرئەکەوێ ئەو قەدەغە کردنەی یەعقوب شتێکی تازەیە و لەبەر چەند هۆیەکی تایبەتی‌یە و لەبەر تەندروستی و کارێکی نهێنی خۆی بووە لەپێشەوە قەدەغە نەبوون ، وەك ئێوە ئەڵێن ، پڕکێشیان نەکرد تەورات بهێنن چونکە خۆیان ئەیانزانی درۆ ئەکەن و پێغەمەر ڕاست ئەکا .

﴿ إن كنتم صادقين ﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن لەداواکاری خۆتان کە ئەڵێن ئەو شتانە هەر لەکۆنەوە قەدەغە بوون ، دوایی کەتەوراتیان نەهێنا ئەیانزانی ئابڕوویان ئەچێ خوای مەزن فەرموی :

﴿ فمن أفترى على الله من بعد ذلـك فـأولئك هـم الظـالمون ﴾ دوایـی هەرکەسـێ درۆ دروست بکا و بیدا بەسەر خوادا بەدرۆ هەندێ شت قەدەغە بکەن لەپاش ئەوەی بەبەلّگـە دەرکەوت کە ئەو قەدەغە کردنە لەلایەن یەعقوبەوە بووە . نەك لـەلایەن خوای مەزنـەوە ، دوایی ئەو کەسانە بوختان و درۆئەکەن و ستەمکارن ، چونکە خۆیان گومڕان و دانیشتوان لەڕێگەی لا ئەدەن و بەردەوامن لەسەر ناڕاستی ۆ باوەڕ نەکردن بەڕاستی

﴿ قل صدق الله فأتبعوا ملة إبراهیم حنیفاً ﴾ موحەمەد تۆ بلێ : خوا ڕاستی فـەرمووە : کە هەموو خواردەمەنیە ڕەوا بوون بۆ بەنی ئیسرائیلی ، بێگومان موحەمەد پێغەمەرە و ئێوە درۆزنن و بوختان چین ، کەواتە ئێوەی خاوەن نامە پەیڕەوی ئـاینی ئیـبراهیم بکـەن ، ئـەو شتانەی ئێوە قەدەغەیان ئەکەن ڕەوا بوون ، ئیبراهیم موسولّمانە و لەهەموو ئاینێ لا یـداوە جگەی ئاینی ئیسلام .

﴿ وما كان من المشركين ﴾ وەئیبراهیم لەو کەسانە نەبووە هاوبەشیان بۆ خوا دانـاوە ، قەدەغە کردنی هەر شتێ بەبێ فەرمانی خوا هاوبەشدانانە بۆ خوا .

بائەمەش دەرخەین کە موحەمەد ﴿ﷺ﴾ لەسەر ئاینی کۆمەلّی ئیبراهیمە و لـەسـەر ئـاینی هەموو پێغەمەران بوە لەبیروباوەڕ و بنچینەکانی ئایندا ، بـەلاّم لـەیاسـا و دەسـتوری ژیـانی ڕۆژانەدا سەربەخۆبوە ، بێگومان سوودی ئادەمیزاد بەگوێرەی کات و جێگـە ئـەگۆڕرێ . کەواتە ڕێك کەوتنی موسولّمانان لەسەر بەڕەوادانانی هەندێ خواردەمەنی مانای ئەوە نیـە لەهەمووڕوێکـەوە ئایینـەکان وەك یـەك وابـن . بەهـەر مانـای بکـرێ مەبەسـت لـەهاتنـە خوارەوەی ئەو ئایەتانەی پێشوئەوەیە جولـەکەکان خۆیـان بـەدرۆ ئەخەنـەوە لـەو شـتانەی ئەیدەنە پالّ خواو پێغەمەران لەقەدە غە کردنی هەندێ خواردەمەنی و داواکاری خۆیانیـان بۆ ناچێتە سەر .

موسـولّمانان و جوولـەکـەکان خۆیانیـان هەلّئەکێشـا ، جوولـەکـەکان ئـەیان ووت ، بەیتولموقەدەسگەورەتر و پیرۆز ترە چونکە جێگەی کۆچ کردنـی پێغەمەرانـە و خاکەکـەی پیرۆزە ، موسولّمانان ئەیان ووت : کەعبە بەرێز ترە ، خوای مەزن فەرمووی :

إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٦﴾ فِيهِ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ مَّقَامُ إِبْرَٰهِيمَ ۖ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا ۗ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٧﴾

﴿ إن أول بيت وضع للناس ﴾ بەڕاستی یەکەمین خانو دروست کرابێ و دانرابێ بۆ ئادەمیزاد کۆببنەوە لەلایی و پەرستنی تێدا بکرێ و هەمویان بەشدار بن لەو خانوەدا ، ئەگینا خانوی تر بەر لەو خانوە و ، دواتریش دروست کراوە ، ئیتر بۆ هەر مەبەستی دروست کرابێ هەموو ئادەمیزاد لەواندا بەشدار نین ، بەڵکو چەند کەسێ لەوا بەشدارن یا بەتایبەتی خانوی یەك کەسە .

﴿ للذي ببكة مباركاً ﴾ خانویەکی ئەو تۆیە لەبەکەیە . بەکە ومەکە هەردووکیان بەمانا یەکن و ئەو جێگەیەن ئەو خانووەی تێدا دروست کراوە ، لەدواییدا عەمالیقە و پاش ئەوانیش قورەیشی‌یەکان ئاوەدان و تازەیان کردۆتەوە ، خانویەکی بەپیت و بەفەڕ و پیرۆزە بۆ ئادەمیزاد بەجۆرێ چاکەیە لەوێدا بکرێ بەرانبەر بەسەد هەزار چاکەیە ، هەر ئەو خانوەیە تەماشاکردنی بەپەرستنی خوا دابنرێ .

﴿ وهدىً للعالمين ﴾ وەئەو خانوە ڕانموییی کەرە بۆ هەموو بونەوەران ، چونکە ڕوانگەی موسوڵمانانە لەنوێژدا و جێگەی بەجێ هێنانی حەجە ، هیچ جۆرە زیندەوەرێ لەو

جێگەیەدا نابێ ئازاری بدرێ ، باوەکو باوك کوشتەی مرۆڤ بێ . پەیوەندی ئەم ئایەتە بەئایەتی پێش خۆی ئەمەیە : باسی یەکێ تر لەکارە خراپەکانی جولەکەکانمان بۆ ئەکا کەئەیان ووت : بەیتولموقەدەس بەرێز تر و گەورەترە لە و خانووەی لەبەکەدایە ، وەك لەمەوبەر باسی کرا ، خوای مەزن بەم ئایەتە دەم کوتیان ئەکا .

ئایەتی (٨٥) ی ئەم سورەتە ﴿ ومن یتبع غیر الإسلام دیناً ﴾ هاتە خوارەوە ، جوولەکەکان ووتیان : کەواتە ئێمەین موسولمان ، پێغەمەر فەرمووی : کەواتە خوای گەورە حەجی لەسەر موسولمانان پێویست کردووە ئێوە بەجێگەی خۆی ئەگەیەنن ؟ ووتیان ئێمە لەسەرمان پێویست نیە و نایکەین ، بۆیە خوای مەزن فەرموی :

﴿ فیه آیات بینات مقام إبراهیم ﴾ لەو خانووەدا هەیە چەندین نیشانەی ئاشکرا لەسەر هیچ کەسێ پەنهان نین ، یەکێ لەو نیشانانە لەناوچوونی لەشکری ئەبرەهەیە بەبالندەی ئەبابیل ، یەکێ تریان ئەمەیە : جێگەی ڕاوەستانی ئیبراهیمە لەسەر ئەو بەردەی کاتێ ئەو خانووەی دروست ئەکرد و بیکا بەجێگەی پەرستنی خوا ، ئەو ڕستەیە بەلگەی بەتینە کە کە عبە یەکەمین خانوو کۆنترین خانوە دروست کرابێ بۆ پەرستنی خوا لەوێدا ، چونکە کەعبە دەست کردی ئیبراهیمە ، بەیتولموقەدەس دروست کراوی سولەیمانە ، سولەیمان بەسەدان ساڵ پاش ئیبراهیم هاتۆتە جیهانەوە.

﴿ ومن دخله کان امناً ﴾ وەهەرکەسێ چوبێتە نێو ئەو خانوە ئاسودەو بێ ترس بوە لەهەموو ئازاری دوژمنانی خۆی و ستەمکاران ، هەر لەبەر پیرۆزی ئەو خانوە ، مانای ووشەی ﴿ آمناً ﴾ بەدرێژایی لەئایەت (١٢٦) ی سورەتی ئەلبەقەرەدا باسی کراوە .

﴿ ولله علی الناس حج البیت من أستطاع إلیه سبیلاً ﴾ وە بۆ خوا هەیە بەسەر ئادەمیزادەوە نیازی چوونە لای ئەو خانووە بکەن بەو جۆرەی خوا فەرمانی پێداوە و ڕوون کراوەتەوە لە نامە دەستوورییەکاندا ، لەسەر کەسێ توانای چوونی بۆ لاەی ئەو خانووە هەبێ لەڕێگەی چوون بۆ لای ئەو خانووەدا ، بەگیان و بەدارایی .

هەموو زانایانی موسوڵمانان لەسەر ئەوەن کە پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانان بە گوێرەی توانا یەکجار لە ماوەی تەمەنیا بچێ بۆ لای ئەو خانووە ، تواناییش بەم جۆرەیە :

لای شافیعیەکان کاتێ پێویستە ئەوەندە دارایی هەبێ بەشی خواردنی خۆی و خواردنەوەی و کرێی ئەو شتەی هەڵی ئەگرێ بکا بۆ خۆی و خێزان و جێگەی حەسانەوە، بۆ چوونی و هاتنەوەی هەتا ئەگەڕێتەوە ، لەڕێگەیشدا باج و بەرتیلی لێ نەستێنن ، لەکوشتنی خۆی و تالآن کردنی دارایی خۆی نەترسێ ، بۆ ژنان کاتێ پێویستە لەسەریان یامێردەکەی یاکەسێ دەست نوێژی لێی نەشکێ یا چەند ژنێ تر گومان لێ نەکراوی لەگەڵبێ بۆ ئەم سەر و ئەو سەری ڕێگە ، کەسێ کوێر بێ پێویستە دەست کێشی هەبێ ، ئەگەر قەرزار بێ ئەبێ یاخۆی بیداتەوە یا ڕاسپێرێ بۆی بدەنەوە ، پێویستە بۆ هەموو کەسێ توانای بەدەنی هەبێ .

لای مالیکیەکان توانا هەر بەلەشە بەتەنها ، کەواتە ئەگەر توانی خۆی بۆ خۆی بڕوا بۆ لای ئەو خانووە پێویستە بڕوا بۆ لای ئەو خانووە چۆن ئەژی گرنگ نییە ، بەمەرجێ کارێ قەدەغە بێ نەیکا بەگوێرەی ئسلام .

لای حەنەفیەکان ئەبێ بەلەش و بەدارایی خاوەنی توانا بێ بۆ خۆی و خێزانی لە هەموورووێکەوە هەتا ئەچێ و دێتەوە .

لای حەنبەلیەکان پێویستە یا خاوەنی توێشوی ڕێگە بێ ، یا بتوانێ لەڕێگەدا خۆی بەخێو بکا ، بەمەرجێ بەشی خێزانی بەجێ هێشتبێ بەجۆرێ شیاوی ئەوان بێ بۆ خۆی و خێزانی . ئەوانەی باسمان کرد کورتەی ئەو باسەیە ، لەنامەکانی یاسادا بەدرێژ تر باسی کراوە .

﴿ ومن كفر فإن الله غني عن العالمين ﴾ وەهەر کەسێ باوەڕی بەخوا و بەپێویستبوونی حەج نییە ، بەڕاستی خوا بێ نیازە لەهەمووبوونەوەرانو پێویستی بەپەرستنی ئەوان نیە و بەتەمای هیچ شتێکی ئەوان نییە .

بەجۆرێ تر هەندێ تر لەزانایان مانای ئەو ڕەستەیەیان بەم جۆرە کردووە : هەر کەسێ حەج نەکا و ، توانای هەبێ بەڕاستی خۆی لەبێ باوەڕان نزیك کردوەتەوە ، کاری ئەو کەسانەی کردوە کە باوەڕیان بەپێویست کردنی حەج نی‌یە ، کەواتە خوا بەڕاستی بێ نیازە لەئادەمیزاد . لەپاش مانا کردنی ئایەتی ( ١٩٥ ) وەبەر لەئایەتی (١٩٦) ی سورەتی ئەلبەقەرە باسی چۆنیەتی جێبەجێ هێنانی حەج بەدرێژی کراوە .

بەو ئایەتەی پێشو پێمان ناسرا کە حەج پێویستە لەسەر موسوڵمانان لەماوەی تەمەندا یەك جار ، ئەبێ بزانین حەج کۆبوونەوەیەکی گشتی باوەڕدارانە لەلای ئەو خانووە ، بۆ ئەوە هەمویان لەگیرو گرفتی یەکتری بگەن و چارەیان بکەن .

لەپاش ئەو فەرموودە پێشووەی خوای مەزن فەرمانی پێ دا بەپێغەمەر ئەفەرموێ : جارێ تر ڕوو بکەرەوە بۆ لای خاوەن نامەکان ، هەڕەشەیان لێ بکە لەسەر هەڵوێستیان دەربارەی ئەو ڕاستیانەی ئەیزانن و خۆیانی لێ گێل ئەکەن و وازی لێ ئەهێنن و خۆیان ئەزانن ڕاستن . بۆیە خوا ئەفەرموێ :

قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٨﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ تَبْغُونَهَا عِوَجًا وَأَنتُمْ شُهَدَآءُ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٩٩﴾

﴿ قل ياأهل الكتاب لم تكفرون بآيات الله ﴾ موحەمەد تۆ بڵێ : ئەی خاوەن نامەکان : لەبەر چ شتێ ئێوە بێ باوەڕ ئەبن بەچەندین بەڵگەی ئاشکرای خوا لەسەر پێغەمەرایەتی

موحەمەد لەسەر ئەوەی کەعبە یەکەمین خانووە دانرابێ بۆ پەرستنی ئادەمیزاد و لەسەر پێویستی حەج .

﴿ والله شهيد على ما تعملون ﴾ وەخوا ئاگادارە لەسەر شتێ ئێوە ئەیکەن و ڕاستیەکان ئەشارنەوە ، دوایی خوا تۆڵەتان لێ ئەسێنێ و بەسزای خۆتان ئەگەن .

﴿ قل ياأهل الكتاب لم تصدون عن سبيل الله من آمن ﴾ موحەمەد تۆبڵێ : ئەی خاوەن نامەکان لەبەر چ شتێ ئێوە لائەدەن لەڕێگەی ئاینی خوا و پەرستنی خوا کەسێ باوەڕی هێناوە بەئایینی ڕاست ، گومان دروست ئەکەن بۆ هاوڕێکانی موحەمەد .

﴿ تبغونها عوجاً وأنتم شهداء ﴾ ئێوە داوا ئەکەن بۆ ئەو ڕێگەیە خوارو خێچی و لادان لەڕاستی و شاردنەوەی باسی موحەمەد ، گومانتان وایە پێغەمەر نیە و دەستکاری تەورات ئەکەن و ئینجیل ئەگۆڕن و ، ئێوە ئاگادارن کە ئاینی ئیسلام ڕاستە و ڕێگەیەکی پەسەندە و ئامۆژگاری پێ کراوی ئیبراهیم و یەعقوبە ، ئێوە بەخراپەکاری خۆتانەوە ناوەستن و ئەتانەوێ باوەڕداران لادەن لەڕێگەی خوا .

﴿ وما الله بغافل عما تعملون ﴾ وەخوا بی ئاگا نی‌یە لەشتێ ئێوە بیکەن لەڕێگە گرتن لەباوەڕداران و شاردنەوەی ڕاستیەکان .

قورئانی پیرۆز گرنگی زۆری داوە بەخاوەن نامەکان ، ئایەتی زۆری وای بۆ ناردوون کە یاسا و دەستوری تەورات و ئینجیلیان بیر ئەخاتەوە ، هەڕەشەیان لێ ئەکا لەسەر گۆڕینی ئەو نامانەی خوا ، بەشیرینترین زمان گفتوگۆیان لەگەڵ ئەکا . یەك بەیەك تاوانەکانیان ئەژمێرێ بۆیان بەتایبەتی ئەو دووئایەتەی پێشوو ، کەچی لەخراپەی خۆیان واز ناهێنن ، ئەیانەوێ جگەی خۆیان وەك خۆیان لێ بکەن و لەڕێگەی ڕاست لایاندەن ، پیشەی شەیتانیان وەرگرتووە لەو کارانەیاندا کەچی خوای مەزن لەگەڵ ئەو هەموو خراپەیاندا ئامۆژگاریان ئەکا بۆ ئەوەیە بگەڕێنەوە یا برو بیانویان نەمێنێ .

جولەکەکان دەستیان دایە پیلان نانەوەی تر بۆ موسوڵمانان بەهەموو توانای شێوەیانەوە بۆ نمونە : لەنێو هۆزەکانی ئەوس و خەزرەجی دانیشتوانی مەدینە دەستیان کرد بە بەرپا

کردن و گێڕانەوەی جەنگەکانی پێشوویان هەتا بەو بۆنەوە برینی کۆنیان تازە بکەنەوە ، ئاژاوە لەنێوانیانا پەیدا ببێتەوە ، بۆ ئەوەی لەئاینی خۆیان لایاندەن ، بەو بۆنەیەوە خوای مەزن فەرمووی :

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تُطِيعُوا فَرِيقًا مِّنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ كَافِرِينَ ﴿١٠٠﴾ وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ آيَاتُ اللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُ ۗ وَمَن يَعْتَصِم بِاللَّهِ فَقَدْ هُدِيَ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٠١﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا ۚ وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٠٣﴾

﴿ یا أیها الذین آمنوا إن تطیعوا فریقاً من الذین أوتوا الکتاب ﴾ ئەی کەسانێکی ئـەوتۆ باوەڕتان هێناوە ئەگەر ئێوە فەرمانبەرداری تاقمێ لەکەسانێکی ئەو تۆ بن بەخشراوە بەوان نامەی خوا کەئەیانەوێ برینی کۆنی نێـوان هـۆزی ئـەوس و خـەزرەج بێرنـەوە سـۆ ، بـۆ ئەوەدەست بکەنەوە بەجەنگ لەگەڵ یەکتری کەئەوەیش پاشەڕۆژێکی زۆر خراپی هەیە .

﴿ یردوکم بعد إیمانکم کافرین ﴾ ئەو تاقمە ئێوە بگێڕنەوە پاش ئـەوەی ئێـوە باوەڕتـان هێناوە بۆ لای باوەڕ نەهێنان ، ئێوە دەست بکەنەوە بەپیشەی جارانتـان لەکوشـتن و تـاڵان کردنی یەکتری و کینەی کۆنتان تازە بکەنەوە .

ئەو ئایەتە هەرچەندە بەرواڵـەت هاتوەتـە خـوارەوە بـۆ قەدەغـەکردنی فەرمانبەرایـەتی جولەکەکان و پەیڕەوی ئەوان ، نەوەك وەرتان گێڕن لەئاینی ئیسلام ، بەڵام هەموو لاسایی کردنەوەیەکی بێ باوەڕان ئەگرێتەوە کەببنـە هـۆی خـەشمی خـوای مـەزن ، وەك لاسـایی کردنەوەی ژنانی بەناو موسوڵمان بۆ بـێ بـاوەڕان کەناموسـی خۆیـاۆن پێشـێل ئەکـەن ، هەروەك بێ باوەڕان خۆیان ڕووت ئەکەنەوە ، جوانی خۆیان ئەفرۆشـن بـەداوێن پیسـان ، بەگوێرەی مۆدێل قژ ئەبڕن و بۆیە و دەرمان بـەکار دێـنن بـۆ ڕاکێشـانی لاوان و سـەرنج ڕاکێشانیان ، لاوەکانیشمان گاڵتە و گەپ و لاسایی بەکاردێنن بۆ ئـاینی پـاکی ئیسـلام و زانایانی ئاینی ، ڕەوشتی پاکی ئیسلام لەکەدار ئەکەن بەهەموو جۆرێ کـە بۆیـان بلـوێ ، چونکە هەر ئاینی ئیسلامە دوژمنی کاری خراپ بێ و ئەوان داوێن پیسی ئاواتیانە .

هەروەها داگیر کەران و هەموو گەڕۆکـە دڵ بەکینـەکانی گاورەکـان بـەپارە و پـوولی فاتیکـان دەسـت ئەکـەن بەگـەڕانی هـەرێم بەهـەرێم و شـار بەشـاری موسـوڵمانان لـەم سەردەمەی ئێمەدا لەهەوڵ و تەقەلادان بەبێ وچان لەگەڵ جوولەکەکان و بێ ئاینەکانی تر بۆ پارچەپارچە کردنـی ئـاین و نیشـتمانی موسـوڵمانان ، دوورخسـتەوەیان لەیـەکتری و وەرگەڕانیان لەئاینی پاکی ئیسلام بۆ نەهێشتنی هەست و سەربەخۆی موسوڵمانان ن هـەتا بەو بۆنەوە بەئاسانی بیان کەن بەنێچیری خۆیان و نۆشی گیانی خۆیانیان بکەن .

هەروەها خوێن مژانــی ڕۆژ ئـاوا بـۆ لادانـی موسـوڵمانان و وەرگـەڕانیان لـەئاین و ڕەوشتی پاکی ناوەستن ، بەهەموو شتێ وازیان لێ ناهێنن هەتا ئـەیان کـەن بەبـەندە هەڵقـە لەگوێی خۆیان بەمەی و قومار و داوێن پیسی بەنجیان ئەکەن و ئاگایان لـەخۆیان نامێنێ ناموس و سامان و نیشتمانیان داگیر ئەکـەن ، ئـەو کـارە خراپانـە بەتەنـها ناکەوێتـە سـەر ئەستۆی بێ باوەڕان بەڵکو بەکرێ گیراوەکانی نارەسەن و ناپاك بەئایین و بەنیشتمان باشتر ئەگرێتەوە . سوچی ئەمان زۆر خراپترە لەسوچی بێ باوەڕان ،چونکە بۆ وەرگەڕان لـەئایین هەرفەرمانێ لەگەورە بێ باوەڕەکانیانە و دەرچێ بەبێ وەستان و بەبێ سرەوتن وجێ بـەجێ ئەکەن ئیتر با ناموس و نیشتمان و خوێنی خۆیان و براکانیان بێ .

هەروەها ئەو ئایەتە ئەوانەیش ئەگرێتەوە ئەگبەتی و گێرە شێوێنی و داوێن پیســی و بـێ باوەڕی و گومڕایی و ستەم بلاو ئەکەنەوە ، ئیتر لەخاوەن نامەکانەوە بێ یا جگـەی ئـەوان بێ لەڕۆژئاوایی و ڕۆژ هەڵاتی و بەناو موسوڵمانیێ ئەو هەموە کارە خراپانە بێ بـاوەڕان و هەڵقە لەگوێکانیان بەکاری دێنن تەنها بۆ ئەوەیە کاربەدەستانی بێ باوەڕان پلــە و پایـەی خۆیان بسەپێنن بەسەر موسوڵماناندا ، بۆ ئەوەیش خزمەتکارە ناوخۆیی یـەکان سامانی زۆر و پارە و پولیان دەست بکەوێ ، بەڵام پاش ماوەیە لێیان بدزنەوە ، لەهەموو شتێ سەیر تر ئەوەیە کاربەدەستان بەچاوی خۆیان ئەو هەموو کارانەی بێ باوەڕان ئەبینن ، بەڵام خۆیانی لێ گێل ئەکەن ، بگرە زۆر جاران ڕێگەیان بۆ خـۆش ئەکـەن و یارمـەتیان ئەدەن ، نەوەك دڵیان بڕەنجێ و ئەمانیش پلە و پایەی بێ ئابڕوی خۆیان لەکیس نەچێ .

بەم بۆنەیەوە ئەگێڕنەوە کە شەیتان بەر لەوەی دراو و دینار لێ بـدرێ نەئەوەسـتا و بـێ پشوو خەریکی خەڵەتانی ئادەمیزادبو هەتا لەخوا پەرستی وەریان گێرێ بۆلای جگەی خوا پەرستی ، بەشەو و بەڕۆژ نەئەسرەوت بۆ ئەو مەبەستە . بەڵام کە دینار و دراو کە وتنە ناو پشوی خۆشی هەڵکێشا ، ئەوەندە خۆشحاڵ بوو کە هەرگیز شـتی وای بەخۆیـەوە نـەدی بوو ، بەو بۆنەیەوە کۆڕێکی زۆر گـەورەی شـەوانەی پێـك هێنـا بـوو کورونـەوە و ژێـر

دەستەکانی ، شەیتان دەستی کرد بەسووڕدان و دراوو دنیای دانابوو بەسەر هەردوو چاوانیەوە ، ئەی ووت : بەڕاستی منتان حەسانەوە ، بۆ لەمەو پاش باکم لەهیچ شتێ نیە ، لام ئاشکرایە ئادەمیزاد جگە لەئێوە کەسی تر ناپەرستن ، ئێوە و بت لای‌من یەکسانن ، بگرە ئێوە لەبتەکان بۆ من چاکترن چونکە ئەوەی ئێوە بەسەر ئادەمیزادی ئەهێنن نەمن و نەبتەکان ناتوانن بیکەن ، ناموسی خۆیان و ئایین و نیشتمانی خۆیان و کوشتنی برای خۆیان بەئێوە ئەفرۆشن .

ئەو چیرۆکە ڕاستبێ یا ئەفسانە جێگەی خۆیەتی ، زۆر ئاشکرایە لەهەموو چەرخ و کاتێکا هەر نەگبەتی و جەنگ و ئاژاوە و خوێن ڕشتن و بێ ناموسی و سەرشۆڕی بەسەر ئادەمیزادا هاتبێ هەر بەهۆی پارە و پوولەوە بووە .

﴿ وكيف تكفرون وأنتم تتلى عليكم آيات الله وفيكم رسوله ﴾ وەچۆن ئێوە بێ باوەڕ ئەبن و ، ئێوە بخوێنرێتەوە بەسەرتانا ئایەتەکانی قورئانی خوا و ، لەنێو ئێوەدا بێ نێردراوی خوا . ڕەوانیە بۆ موسوڵمانان تێك بچن و گوێ ڕایەڵی گومڕاکەران بن ، پەیڕەوی بێ باوەڕان بکەن لە ڕەوشتی خراپیانا ، کەچی قورئان ئەخوێنن و گوێ ئەگرن لەپێغەمەر و ڕاستیەکانتان بۆ ئەگێڕێتەوە ڕووبەڕووی خۆتان بەزیندوویی و پەردەی گومان لەسەر هەموو شتێ بۆتان لا ئەدا.

ئەبێ بزانرێ قورئانی پیرۆز هەتا هەتایە هەر ئەمێنێ . پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ باکۆچی دوایی بکا بۆ لای خوا ، بەڵام چرای ڕووناکی فەرموودەکانی بەهۆی زانایانەوەهەرگیز ناکوژێتەوە ، ئەو زانایانە هەتا هەتایە خزمتکاری ئەو چرایەن .

﴿ ومن يعتصم بالله فقد هدى إلى صراط مستقيم ﴾ وەهەر کەسێ دەست بگرێ بەئاینی خواوە قورئان بکا بەیاسای خۆی لەکاری ڕۆژانەیدا ، دوایی ئەو کەسە ڕانموویی کراوە بۆ لای ڕێگەی ڕاست ، دەست گرتن بەئاینی خوا بەوەئەبێ لانەدا لەئایین بەهیچ جۆرێ .

پرسیار / مانای ﴿ صراط مستقيم ﴾ بەوە لێ دراوەتەوە یانێ ئاینی ئیسلام ، لەسورەتی هوددا ئایەتی (٥٦) هاتووە ﴿ إن ربي على صراط مستقيم ﴾ ، ئەو فەرمودەیە وائەگەیەنێ خوا لەسەر ئاینی ئیسلامبێ .

وەلام / بەڕاستی ڕێگەی ڕاست بۆ بەندەی خوا مەبەست ئـاینی ئیسـلامە ، بـۆ خـوای مەزن بریتی‌یە لەداد پەروەری و زانینی خوا ، خوا بەڕێوە ئەبا هەموو کارێ بەداد پەروەری و زانینی خۆی و لانادا لەبەڕێوەبردنی بوونەوەران .

ئەو ئایەتـە ئەمـەمان فـێر ئـەکا جگـە لـەقورئان و فـەرمودەی پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ ئەگـەر موسوڵمانان شتێ تر بکەن بەیاسا بۆ خۆیان گومڕا و بێ بەهرە ئـەبن ، بـۆ نمونـە عومـەری کوڕی خەتتاب بە پێغەمەری ووت : فەرمانم داوە بەبرایەکی جوولەکە هەندێ لەناوەڕۆکی چاکی تەوراتم بۆ بنوسێ با نیشانت بدەم ، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ زۆری پێ نـاخۆش بـوو ڕەنگـی تێك چوو ، عەبدوڵای کوڕی سابیت کـە ئـەو ڕوداوەی گێڕاوەتـەوە بەعومـەری ووت : ئەبینی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ڕەنگی تێك چوو ، لەپاشا عومەر ووتی : ڕازیـم بەخوایـەتی خـوا ، ئیسلام ئاینمە ، پێغەمەر فروستادەمە ، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ڕوی پیرۆزی گەشبوەوە ، فەرمووی: بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر موسا زیندو ببێتەوە و بێتە ناوتان و پەیڕەوی بکـەن لەڕێگەی ڕاست لاتان داوە ئێوە بەشی منن و منیش بەشی ئێوەم .

دووکەس لـەهۆزەکانی ئـەوس و خـەزرەج دەسـتیان کـرد بـەخۆ هەڵکێشـان بەسـەر یـەکتریدا ، یـەکێکیان ووتـی : فـلان هـاوەڵی پێغەمـەر فـلان وفـلان لەمرۆڤـە هەڵکەوتووەکانی ئێمەن . پیاوەکەی تریان ووتی : ئێمـەش هەڵکـەوتوومان زۆرە ، فلان هاوەڵی پێغەمەر فلان لەئێمەن ، گەیشتنە ڕادەیەك لەیەکتری زیت بوونەوە ، هۆزی ئـەوس بەچەکەوە هەندێکیان خۆیانیان گەیاندە لای خزمەکەی خۆیان ، هـۆزی خـەزرەجیش بـەو جۆرە هاتن بۆ کۆمەکی خزمەکەی‌خۆیان. ئەو ڕووداوە گەیشـتە خزمـەت پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ چوو بۆ لایان . خوا فەرمووی :

﴿ یا أیها الذین آمنوا اتقوا الله حق تقاته ﴾ ئەی ئەو کەسانەی ئەوتۆ باوەڕتـان هێنـاوە ئێوە لەخوا بترسن و خۆتان بپارێزن لەبێ فەرمانی خوا بەڕاسترین شـایان تریـن و تـرس و خۆپاراستن کاتێ خوای مەزن باوەڕدارانی ترسان لەگومڕاکردنی بێ باوەڕان بۆیان و تێـك چوونی نێوانیان لەئایەتی پێشوودا ، لەم ئایەتەی دواییدا فەرمان ئەدا بەباوڕداران بەشـتێکی

زۆر گرنگ کە هەموو جۆرەکانی پەرستن ئەگرێتەوە و جێگەی گرێدانی هەموو چاکەکانە بەیەکەوە ، ئەوەتە بۆیەکەمین جار فەرمان ئەدا بەباوەڕداران بەترسانی خوا ، ئەفەرموێ : ئێوە لەخوا بترسن بەجۆرێ شایانی ترسان بێ لەخوا لە بەجێ هێنانی هەموو فەرمانەکانی خوا وخۆ پاراستن لە بێ فەرمانیخوا،مانای ئەو ئایەتەو مانای ئایەتی ﴿ فأتقوا الله ما استطعتم ﴾ دوایی ئێوە لەخوا بترسن بەگوێرەی توانای خۆتان وەك یەك وان و، دژایەتی لەنێوانا نییە ، خوا داوا لەئادەمیزاد ناکا شتێ لەتوانایانا نەبێ ، شتێ لەتوانادا نەبی پەیوەندی بەترسی خواوە نییە .

﴿ ولا تموتن إلاّ وأنتم مسلمون ﴾ وەئێوە نابێ بمرن مەگەر ئێوە موسوڵمانبن ، یانی نابێ ئێوە لەسەر هیچ ئاینێ بن لەکاتی سەرەمەرگدا جگەی ئاینی ئیسلام ، ئەو ئایەتە واز هێنانی لە ئاینی ئیسلام قەدەغە کردووە و پێویستە بەردەوامی لەسەر ئاین هەتا کاتی مردن .

باس کردنی ئسلام پاش باس کردنی ترسی خوا ئەمەمان فێر ئەکا ئەبێ مل کەچی خوا بین بۆ پەرستنی خوا ، نامەی خوا یاسامانبێ ، بەبێ ئەوانەکۆمەڵگای ئیسسلام پەیدانابێ .

بۆ دووهەمین جار خوا فەرمان ئەدا بەباوەڕداران و ئەفەرموێ :

﴿ وأعتصموا بحبل الله جميعاً ولا تفرقوا ﴾ وەئێوە دەست بگرن بەئاینی خوا بەهەمووتانەوە وەپەراگەندە و پارچە پارچە مەبنو هەریەکەتان بیر وباوەڕێکی جیاوازتان هەبێ ، بێگومان ئاینی ئیسلام بەوێنەی گوریسێکە هەر کەسێ دەستی پێ بگرێ بەئاواتی ئەگەیەنێ .

﴿ وأذكروا نعمة الله عليكم إذ كنتم أعداءً فألف بين قلوبكم ﴾ وەئێوە بیری چاکەی خوا بکەن بەسەرتانەوە ، ئاسایش و یەکبوونی داوە پێتان بەهۆی ئاینی ئیسلام و یاسای قورئانەوە بیر بکەنەوە ئێوە دوژمنی زۆر گەورەی یەکتر بوون بەر لەهاتنی ئاینی ئیسلام ، دوایی خوا خۆشەویستی خستە نێو دڵی ئێوەوە بەهۆی ئیسلامەوە .

﴿ فأصبحتم بنعمته إخواناً ﴾ دواییئێوە گەڕان بەهۆی ئەو چاکەی خواییەوە بوون بەبرای یەکتری ، پشتی یەکتریتان گرت ، ئەو سامانەی هەتان بوو وەك برا پشتی یەکتریتان

کرد بەهاوبەش، خوای مەزن بیری موسوڵمانانی ئەخاتەوە کەبەر لەئیسلام ڕق و دووبەرەکی و جەنگ و ئاژاوە زۆری پێ هێنابوون ، بۆ نمونە جەنگی (١٢٠) ساڵەی نێوان ئەوس و خەزرەج ، بەهۆی ئاینی ئیسلامەوە وازیان لەوانە هێنا و بوون بەبرای یەکتر و دوژمنایەتیان هەر لەبیر نەما .

﴿ وکنتم علی شفا حفرة من النار فأنقذکم منها ﴾ وەئێوە بەهۆی گومڕایی و نەزانینەوە لەسەر لێواری چاڵێکبوون لەئاگری دۆزەخ و لەوانەبوو بکەونە ناوی ، دوایی خوای مەزن ئێوەی ڕزگار کرد لەو چاڵە ئاگرەی دۆزەخ کە نزیکبوو ئێوە بکەونە ناوی .

﴿ کذلك یبین الله آیاته لعلکم تهتدون ﴾ بەو جۆرە بۆ ئێوە ڕوون کرایەوە خوا ڕوونی ئەکاتەوە ئایەتەکانی نامەی خۆی و بەڵگە لەسەر یەکێتی خوا ، بۆ ئەوەی ئێوە ڕانموییی وەرگرن بۆ ئاینی ئیسلام شارەزایی یاسا و دەستورەکانیبن.

مانای ئەو ئایەتە ئەمەیە : بەڕاستی موسوڵمانان هەتا پەیڕەوی ئاینی تەنهای ئیسلام بکەن، یەك خوا و یەك پێغەمەر و یەك ئاینیان هەبێ ، پێویستە لەسەریان چاودێری ئەو پەیوەستە توندە بکەن ، بەجۆرێ بەهێز تربێ لەپەیوەندی خزمایەتی و ڕەگەزی ، بەردەوامبن لەسەر کار پێ کردنی و نەبن بەچەند کۆمەڵ و چەند پارتێ ، لایەنی موسوڵمانەتی بگرن نەك ڕەگەز . پێویستە بزانرێ داواکردنی خۆشەویستی و برایەتی نێو موسوڵمانان نابێتە هۆی چاونوقاندن لەچاکەی مرۆڤایەتی بۆ هەموو ئادەمیزاد ، بگرە ئەبێ هێز و برایەتی نێوان موسوڵمانان ببێ بەکۆمەکی ئاسایش و خۆشی بۆ هەموو ئادەمیزاد ، چونکە ئادەمیزاد بەر لەئاینی ئیسلام بت پەرست و گۆشتی مرداربوو خۆر بوون ، داوێن پیس و خوێن مژ و ستەمکار بوون ، خزمایەتی و ئامەشۆی یەکتری لەنێوانیانا کەم بوو مەگەر بۆ ڕەگەز پەرستی ، ئازاردانی دراوسێیەتی ڕەوشتیان بوو . هەتا خوای مەزن بەمیهرەبانی خۆی ئاینی پاکی ئیسلامی نارد بۆ هەموو ئادەمیزاد بۆ چەسپاندنی مرۆڤایەتی بەهۆی پێغەمەرێکەوە لەڕەگەزێکی ڕاست گۆ و داوێن پاك . بۆ ئەوەی ئادەمیزاد فێری چاکەکردن و خراپە نەکردن بکات .

لەو ئایەتەی پێشوودا خوای مەزن ڕووئەکاتە هەموو بـاوەڕداران قەدەغـە ئـەکا لـەوان پەراگـەندە و پارچەپارچـە نـەبن لـەنێو خۆیانـا ، لـەبیرو باوەڕیانـا . پێمـان ڕائەگەیـەنێ پەراگەندەش ئەبن ، بۆیە لـەنێو ڕوناکی مانای ئـەو ئایەتـەوە پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ ئەفـەرموێ : جوولـەکەکان بوون بە (٧١) تاقم ، گاورەکان بوون بە (٧٢) تاقم ، پەیڕەوانی من ئەبن بە (٧٣) . هەموویان لـەنێو ئاگردان جگە لـەیەکێکیان ، بەپێغەمەریان ووت : ئـەو وتاقمـە چ کەسانێکن ؟ فەرمووی : ئەو کەسانەن پەیڕەوی کردەوەی من و هاوەڵەکانم ئەکەن .

بەو بۆنەوە وای بەچاك ئەزانم باسی هەندێ لەتاقمی ئادەمیزاد بکەم جگەی ئـەو ( ٧٣) تاقمە ، دوایی باسی ئەوانیش ئەکەم .

١- بێ باوەڕان : بی باوەڕان ئەو کەسانەن باوەڕیان بەبونی خوا نی‌یە ، یا لـەگەڵ باوەڕ بە خوادا باوەڕیان بەپەرستنی جگـەی خـوا هـەبێ ، یـا باوەڕیـان بەفریشـتەکان و خـوا و نامەکانی خوا و هەموو پێغەمەران و ڕۆژی دوایی و بەهەشت و دۆزەخ و دیـاری کردنـی هەموو شتێ لـەلایەن خواوە نەبێ ، باوەڕیان بەوە نەبێ چارەنووسی هەموو بوونەوەران خوا دیاری ئەکا .ئەو بێ باوەڕانە ئەکرێن بەدوو بەشەوە :

أ- ئەو کەسانەی ژیان و ڕابواردنی جیهان سەری لـێتێکداون ئەڵێن : ژیان و ڕابواردن هەر ئەمڕۆیە و پاشەڕۆژ کەلـەبەرچاو نەبێ هەر نابێ و نی‌یە ، ئەوکەسانەیش بـەدەم برِوایان بەخوا هەیە ، بـەلاَم فەرمانـەکانی خـوا بـەجێ نـاهێنن ، کـارە چاکـەکان بەئارەزوی پیسی خۆیان پیســی ئەکـەن و کەسـی تـر ئەکـەن بەهاوبەشـی خـوا ، ئەوکەسانەیش هاوبەشی بێ باوەڕانن و بەیەك چاو سەیر ئەکرێن .

ب- ئەو کەسانەن ئەڵێن : خواهەیە ، بەلاَم ئەگەر زیندوو بوونەوە هەبێ ئێمە شـیاوی ڕێزین و خاوەن بەهرەین لـەپاشەڕۆژدا نەك ئەم هەژار و بێ نرخانە .

٢- باوەڕداران : ئەو کەسانەن باوەڕیان بەخوا هەیـە بـەو جـۆرەی شـیاوی بارەگـای خوایە باوەڕیان بەبوونی فریشتەکان و فەرمانبەرداریان بـۆ ۆخـوا هەیـە ، بـەجۆرێ بـێ

گوناهن و خەوو خواردنیان نی یە ، نێر و مێ نین و باوەڕیان بەهەموو نامەکانی و بەهەموو پێغەمەران هەیە بڕوایان بەپاشەڕۆژ و زیندوو بونەوە دۆزەخ و بەهەشت هەیە ، بڕوایان بەوە هەیە چارەنووسی هەموو بوونەوەران خوا دیاری ئەکا .

لەناو موسوڵمانانندا زۆر تاقم و کۆمەڵی سەر لێ شێوا و هەن لەخۆیان بایی بوون و لە ڕێڕەوی ئیسلام لایانداوە ، ئەوکەسانە زۆر بەشیان هەیە ، وەك ئەمانەی خوارەوە :

١- هەیانە ئەڵێن : خوا لێخۆشبوونی زۆرە ، ئەو کەسانە پشت ئەبەستن بەمیهرەبانی خوا، فەرمانەکانی خوا بەجێ ناهێنن ، وادائەنێن خوا لەوان خۆش ئەبێ ، فەرموودەی خوایان لەبیر چوەتەوە ﴿ وان لیس للإنسان إلاّ ماسعى ﴾ وەنیە بۆ ئادەمیزاد هیچ شتێ مەگەر شتێ بەکۆششی خۆیان پەیدای بکەن ، کەچی ئەو کەسانە بەتەمەڵی دائەنیشن و فەرمانی خوا بەجێ ناهێنن .

٢- هەندێ تر هەن چاکەیان هەیە و گوناهباریشن ، بەڵام گوناهەکانیان زۆر ترە بەئاواتی ئەوەن تای تەرازوی چاکەکە یان قورس تر بێ بۆیان ، ئەو کەسانە لەگۆمی نەزانینا خنکاون .

٣- هەندێ تریان هەیە چاکەیان زۆرترە بەگوێرەی گومانی خۆیان ، بەڵام ئاوڕێ بۆ لای خۆیان نادەنەوە لەکاتی گوناە کردنیانا ، چاوی خۆیانی لێ ئەنوقێنن لەهەڕەشەی خوا ناترسن بۆ گوناهباران .

٤- هەندێ لەزانایان هەن هەموو جۆرەکانی زانین و زانیاری فێر بوون و خۆیانیان بۆ ماندووکردوون ، بەڵام لەشی خۆیان بەکار ناهێنن لەپەرستنی خوادا ، خۆیان ناپارێزن لەبێ فەرمانی خوای مەزن ،گومانیان وایە جێگەی ڕێزی خوان ، بەهۆی بەکار هێنانی زانیاری خۆیان بۆ سوودی گشتی لەخۆیان بایی بوون ، ئەو زانیاری یانە بەوێنەی پزیشکێ تیماری نەخۆشەکان بکا و گوێ نەداتە نەخۆشی خۆی ، خۆی کوێر ئەکا لەئاستی فەرموودەی خوا : ﴿ قد أفلح من زكا وقد خاب من وساها ﴾ بەڕاستی ڕزگاری بووە

کەسێ خۆی پاك کردوەتەوە لەگوناه ، وەبە ڕاستی زیانۆمەندە کەسێ خۆی پەنهان دابێ بەنەزانین و لادان لەسنوور .

٥- کۆمەڵێ تر هەن لەزانایان کاری چاك و زانستی زۆریان هەیە ، گوناهی ئاشکرایی ناکەن. بەڵام دەروونی خۆیان لەفیز و ناوبردنی بێ تاوان و پۆخلەواتی درۆبازی و داواکردنی پلەی بەرز و ئازاردانی هاوسەران خۆ پاك ناکەنەوە ، خۆیان کەڕ و کوێر ئەکەن لەمانای ﴿ إلاّ من أتى الله بقلب سليم ﴾ مەگەر کەسێ چوبێتە لای خوا بەدڵێکی ئاسوودەو بێ گەردەوە .

٦- کۆمەڵێ تر لەزانایان هەن خۆیان ئەزانن هەندێ ڕەوشتی خراپی شاراوەی وایان هەیە لەگەڵ یاسای ئیسلامدا ناگونجێ ، بەڵام لەبەر ئەوەی لەخۆیان بایی بوون گومانیان وایە لای خوا خاوەنی ڕێزن و تۆڵەیان لێ ناسێنێ ، وادائەنێن نەزانان تۆڵەی نەزانیان لێ ئەسەنرێ نەك ئەمانی زانا ، بەرگی بەنرخ ئەکەنە بەریان و گومانیان وایە بۆ پلەی زانایان واپێویستە بەزۆری ئامۆشۆی کاربەدەستان ئەکەن و بەسەریانا هەڵئەدەن بەپەخشان و بە هۆنراوە ، بەگومانی خۆیان بۆ سوودی گشتی ئەو کارانە ئەکەن ، بەڵام دانیشتوان مەبەستیان ئەزانن و نەفرەتیان لێ ئەکەن ، خوا ئاگاداری هەموو شتە .

٧- کۆمەڵێ تر لەزانایان هەن : زانیاری زۆریان هەیە ، ئەندامەکانی خۆیان پاك ئەکەنەوە ، لەگوناه بەپەرستنی خوا ئەیان ڕازێننەوە ، خۆیان ئەپارێزن لەبێ فەرمانی خوا ، دەروونی خۆیاین پاك ئەکەنەوە لەپیس و پۆخڵێ ، بەڵام تێکەڵاوی دانیشتوان ناکەن ، خۆیان بەگەورەتر دائەنێن ، تەماشای جگەی خۆیان بەسووکی ئەکەن ، بەو هۆیانەوە لەخۆیان بایی بوون و سەریان لێ شێواوە و خۆیان پێی نازانن .

٨- کۆمەڵێ تر لەزانایان هەن : ئەو شتانەی لەزانیاریدا پێویستن و گرنگن وازیان لێ ئەهێنن تەنها ئەو زانیارییانە ئەخەنەکار پەیوەندی یان بەجیهانەوە هەیە ، تەنها بۆ ئەوە سامانی زۆری پێ پەیدا بکەن ئەو کەسانە سەر لێشێواون بە دوو شێوە : بەکردەوەکانیان

کەمەبەستیان پەرەپێدانی سامانە ، گومانیان وایە زانین و زانیاری هەرئەوەیە سامانی پێ پەیدا بکرێ .

٩- کۆمەڵێ تر لەزانایان هەن : سەرگەرمی ئامۆژگارین ، باسی پلەی بەرزی پیاو چاکان ئەکەن کە دڵیان ڕوون و گەش بووە بەترسی خوا ، ئارام گر و پشت بەست بوون بەخوا ، جیهانیان نەویستووە ، بڕوای تەواویان هەبووە ، دڵپاك و ڕاست ویژبوون ، ئەو کەسانە زۆر داماوو سەر لێ شێواون ، بەوبۆنەوە گومانیان وایە کە لەو بارەوە گفتوگۆیان کرد و دانیشتوانیان ووریا کردەوە چاکەی ئەو پیاو چاکانە سوودیان پێ ئەگەیەنن ، سەرنجی گوێ گران ڕائەکێشن کە ئێمە وەك ئەوان واین ، ئەو کەسانە ئەوپەڕی سەر لێ شێواون بەهۆی لەخۆ بایی بوون و نەفامیانەوە .

١٠-کۆمەڵێ تر لەزانایان هەن : واز لەئامۆژگاری کردنی پێویست ئەهێنن ، وەك ئەو کەسانەی ئەمڕۆ کەخۆیان ماندوو ئەکەن بەجۆرە پەرستن و گفتگۆی پڕوپوچەوە کە بەکاریان ئەهێنن دەست ئەکەن بەقیڕقیڕ و ڕاوالین ، بەشێوەیە کەلەیاسای ئیسلامەوە دوورن . گفتوگۆی ڕەوان و وانەی ڕێك و پێکی زانایان بەکار ئەهێنن ، هەتا هەندێ لەئادەمیزادی ساوویلکە بخەڵەتێنن و بیان هێننە هەڵقونکی و سوڕدان ، بەبالای پیرەکانیان هەڵدەن ئەو جۆرە بەناو زانایانە گومڕان خۆیان و گومڕاکەری ئادەمیزادن .

١١-کۆمەڵێ تر لەزانایان هەن : دەست ئەکەن بەگێڕانەوەی فەرموودەی پیاو چاکان و یاسکردنی خراپەی جیهان و دارایی لەسەر مینبەر و لەنێو بازاڕو کوڵان و جێگە گشتی‌یەکاندا ، گومانیان وایە بەو جۆرە ڕزگاریان ئەبێ بەهۆی فەرمودەی پیاو چاکان و سەرئەکەون کەچی خۆیان لەو چاکانە دوورن سەر لێشێواوی ئەجۆرە زانایانە زۆر ڕوون و ئاشکرایە .

١٢-کۆمەڵێ تر لەزانایان هەن : کاتی خۆیان بەکۆکردنەوەی فەرموودەکانی پێغەمەر و نووسینەوەیان ئەبەنە سەر ، بۆ ئەوەی ناوبانگیان دەرچێ بەخاون کۆشش و لەو بارەوە

کەچی ئەو کەسانە لەفەرمانبەردارانی ناوەرۆکی فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە دوورن ، ئەو کەسانە وێنەی گوێ درێژێ وان بارکرابن لەنامە .

١٣- کۆمەڵێ تر لەزانایان هەن : لەخۆیان بایی بوون بەهۆی فێر بوونی زمان زانین و هونەرەکانی تر و جۆربەجۆری زانیاری و زانینەکان ، لەبەر کردنی هۆنراوەی زۆر ناوەستن ، گومانیان وایە خوا لەوان ئەبورێ ، هەرلەبەر ئەوەی ئەوان زانای ئاینین ، چونکە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بەوان نەبێ نازانرێ ، تەمەنی خۆیان بەوانەوە بە فیڕۆ ئەدەن ، لەچاکەکانی تر خۆیان دوور ئەگرن ، ئەو زانایانە ئەبوایە بیانزانیایە خۆ ماندووکردن بەزمانی عەرەبی‌یەوە بەرزترە لەوەخۆیان ماندوو بکەن بەزمانەکانی ترەوە ئەبێ لەگەڵ ئەو خۆماندوو کردنەدا دەروونی خۆیان لەفیز و ناڕەوایی پاك بکەنەوە خۆیان لەناو بردن و ڕووالەت دوور بخەنەوە، خوای مەزنیان مەبەستبێ بەتەنها .

هەتا ئێرە باسی هەندێ لەزانایان بوو کۆتایی پێ هات . تاقمی تریان زۆرن . لەنێو ئەو کەسانەدا خەریکی خوا پەرستین و خۆیان وانیشان ئەدەن وازیان لەجیهان هێناوە سەر لێشێواویان زۆرە ، هەریەکەیان بەشێوەیە بەم جۆرەی خوارەوە باسی هەندێکیان ئەکەین :

١- لەو بەناو خۆ پەرستانە هەن : هەندێکیان لەخۆیان بایی ئەبن بەنوێژ کردنی زۆریانەوە کەچی بەو جۆرەی پێویستە نوێژی فەرز بەجێ ناهێنن بەڵام هەموو نوێژە سوونەتەکان بەجێ ئەهێنن .

٢- کۆمەڵێ تریان هەن پەژارە دایان ئەگرێ لەکاتی دابەستنی نوێژەکانیانا ، شەیتان ئەیانخاتە پەژارەوە و گومانەوە ، وازیان لێ ناهێنێ نوێژەکانیان دابەستن هەتا نوێژی بەکۆمەڵیان لەکیس ئەچێ ، زۆر جارانیش کاتی نوێژ بەسەر ئەچێ ، خۆ ئەگەر بەهەر جۆرێ بێ نوێژەکەیان دابەست دڵیان لەخورپەدایە ئایا دابەستنی ئەو نوێژەی دروستە یان نە ؟ بەگوێرەی یاسای ئاین ئەو جۆرە دڵەخورپەیە یەکێکە لەو شتانەی نوێژ پووچ ئەکەنەوە، ئەو کەسانە لەخۆ باییەکانن و ، ئەیانەوێ بەو شتانە خۆیان واپیشان بدەن لەنێو دانیشتوانا کە خواپەرستن ! لەبەر چاودێری کردنی یاسا ئەو پەژارەیی‌یە بەکاردێنن .

٣- کۆمەڵێ تریابن هەن : دڵە ڕاوکێ (وەسوەسە) ڕایان ئەگرێ بۆ خوێندنـی پیتـەکانی فاتیحا ئایا لـەجێگەی خۆیانە دەرچووە (المخرج) لەوبارەوە خۆیان ماندوو ئەکـەن ، گـوی نادەنە ووردبوونەوە لـەمانای فاتیحـا ، بـێ ئـەوە ئاگایـان لـە خۆیـان بـێ دەسـت ئەکـەن بەخوێندنی و ئەڕۆن و ئەگەڕێنەوە بۆ پاشەوە نەك جارێ بەڵکو دەیان جار ، ئـەو جـۆرە پیشانە داوا لـەخاوەنەکانیان ئەکا بچن بۆ لای پزیشکی تایبەتی بـۆ چارەسـەر کردنـی ئـەو نەخۆشی‌یە ، هەتا بتوانێ بەگوێرەی یاسا نوێژەکانیان بەجێ بهێنن .

٤- کۆمەڵێ تریان هەن : لەشەو و ڕۆژێکا سێ جزم قورئان ئـەخوێنن و خۆیـانی پێـوە ماندوو ئەکەن و دڵیان لای خوێندنی قورئانەکەوە نی‌یە ، لـەمانای قورئـان وورد نابنـەوە ، ئەو کەسە با لـەشەو ڕۆژێکا بەبێ ووچان قورئان بخوێنن و بەهرەمەند نابن ، چونکە دڵیـان لای نی‌یە .

٥- کۆمەڵێ تریان هەن : لـەخۆیان بایی بوون بەڕۆژوو گرتن ، زۆر جاران سەرانسەری ساڵ بەڕۆژوو ئەبن ، بەخواردەمەنی قەدەغـەکراو ڕۆژووەکـەی ئەشـکێنێ ، ئـەو کەسـانە وازیان لـە فەرمانە گرنگەکانیان هێناوە ، خۆیـان خـەریك ئەکـەن بـە گوناهـەوە کەکـەس ئاگای لێ نە بێ بەدزی ڕواڵەتیانەوە .

٦- کۆمەڵێ تریان هەن : لـەخۆیان بایی بـوون بـەکردنی حـەجی زۆرەوە ، بـێ ئـەوەی خۆیان لـە ستەم کردن و کاری نالـەبار واز بهێنن ، زەکاتیـان نـەداوە و قـەرزی خـەڵکیان لایە، بگرە لـەچوون و هاتنەوەی ئەو ڕێگە نوێژەکانیان لـەکیس بچێ ، گفتوگۆی پڕوپوچی زۆر و جنێودان و گێرە شێوێنی ئازاری بێ تاوانان بەکار دێـن ، مەبەسـتیان لـەو حەجانـە ئەوەیە ناویان دەرچێ و باسیان بکەن کە حـەجی زۆر ئەکـەن ، ئەگەنـە لای خانـەی خـوا بەدڵێکی پیسەوە ، بەگومانی خۆیاون چاکەیان کردووە کەچی سەر لێ شێواون و داماون .

٧- کۆمەڵێ تریان هەن : خۆیان ماندوو ئەکـەن و فـەرمان بەچاکـە ئەکـەن و ، داوای لـەجگەی خۆیان ئەکەن خراپە نەکەن ، بەڵام خۆیانیان لـەبیر چۆتەوە ، ئەگەر یـەکێ بـەوان

بلێ : تۆیش چاکە بکە خراپە مەکە تورە ئەبێ و موی گرژ ئەبێ ، لەوەڵامدا ئەلێن : ئێوە چیتانە بەسەر ئێمەوە ، هەندێ جار ئەو کەسانە داوا لەهاو نیشتمانان ئەکەن کۆ بینەوە لەمزگەوتا یا لەجێگەیە تردا بۆ ئەوەی ئامۆژگاریان بکا ، ئەگەر یەکێ نەختێ درەنگ بێت ئەی شکێنێ لەناو کۆمەڵدا و دڵی بریندار ئەکا ، چونکە بەگومانی خۆی لەبەر خوا ئەو کارانە ئەکەن ، ئەگەر یەکێ تر جگە لەخۆیان بەو کارە هەڵسێ پەلاماری ئەدا و ئەیکاتە دەرەوە ، وایش ئەبێ ئەگەر یەکێ تر جگەی خۆی بانگی نوێژ ، یا پێش نوێژی بکا خۆیان گێز ئەکەنەوە و ئەلێن ، جارێ تر بەئێرەدا نەیەی ، بێ ئەوەی هۆی یاسایی بەدەستەوە بێ ، ساختەچیەتی خۆیان دەرئەخەن لای پیاوانی ژیر و ئایین پەروەری ڕاستەقینە .

٨- کۆمەڵێ تریان هەن : مەکە و مەدینە یا شوێنێکی تری بەناو پیرۆز ئەکەن بەجێگەی خۆیان ، بەلای خۆیانەوە دەری ئەبرن وازمان لەجیهان هێناوە ، بەجۆرێ لەخۆیان بایی ئەبن ئاگایان لەدڵی خۆیان نی‌یە ، ناوەوە و دەرەوەی خۆیان پاك ناکەنەوە لەکینە و پیسی. خۆیاون ئەزانن هەرچەندە لەو جێگە پیرۆزانەدا بن دڵیان هەر لای شار و نیشتمانی خۆیانە، زۆر جاران درێژە ئەدەن بەباس کردنی شارەکانی خۆیان ، لەهەمان کاتا ئەلێن ، ساڵەهای ساڵە ئێمە لەم جێگە پیرۆزەداین بۆ پەرستنی خوا . بەڵام ئەوەی لە ناوەڕۆکدا سوود بەخشی بۆ ئەوکەسانە ئەوەیە لەووڵاتی خۆیانا بونایە و دڵیان لای ئەو شوێنە پیرۆزە دابوایە ، خوا ئاگای لەنهێنی هەموو دڵان هەیە ، بەگومانی خۆیان درەخت و بەرد و خاکی ئەو شوێنە پیرۆزانە ئەگاتە فریایان ، هاوار بۆ ئەو کەسانە ، ئەی بۆ ئەگەر هەژارێ لەبرسا بمرێ ، پارەنانێکی نادەنێ ئەو هەموو پارانەیش هەڵئەگرن .

٩- تاقمێ تریان هەن : خواردەمەنی و بەرگی کۆن بەکار ئەهێنن ، وابەخەڵکی ڕائەگەیەنن وازیان لەجیهان هێناوە ، مزگەوت و تەکیە و خانەقا ئەکەن بەجێگەی دانیشتنی خۆیان ، گومانیان وایە بەو کارانە بەپلەی دۆستایەتی خوا ئەگەن ، کەچی هەوڵی

سەرۆکی و پلەی بەرزی جیهان ئەدەن ، ئەو کەسانە زۆریان لەخۆ بایین ، بەلای خۆیانەوە گۆشە گیرن و وازیان لەجیهان هێناوە ، زۆر جاران پارە و پوول وەرنـاگرن ، نـەوەك لای خەڵکی ئابڕوویان بچێ ، هەر لەو تاقمە هەیانە لەشەو و ڕۆژێکا هەزار ڕکات نوێـژ ئـەکا و قورئان ئەخوێنێ ، کەچی لەگەڵ ئـەوەدا ئاگایـان لـەدڵی خۆیـان نی‌یـە ، گومانیـان وایـە پەرستن بریتیە لەڕواڵەت و بەو جۆرە ڕزگاریان ئــەبێ ، وایـش لەقەڵـەم ئـەدەن دۆستـی خوان .

١٠- کۆمەڵێ تریان هەن : واز لەکارە پێویستەکان ئەهێنن ، ئەو کارانە پێویست نین زۆر بەتوندی ئەیان گرن ، پرچ و ڕیشیان درێژ ئەکەن و تەزبیح و سیواك هەڵئـەگرن ، نوێـژی هەینی و نوێژی بەکۆمەڵ ناکەن ، بەڵام ئەچن بۆ سەر گۆڕستان و نوێژی جـەژن ئەکـەن ، خزمەتی باوك و دایك و خزمەکانیان ناکەن ، واز لەماڵ و منالّی خۆیــان ئـەهێنن . بـەلام لەساڵێکا جارێ ئەچن بۆ لای پیرەکانیان ، ئەچن بــۆ حـەجی سـونەت و لای گۆڕسـتانی پیاوچاکان ، مزگەوت و تەکیە و خانەقا دروست ئەکەن ، قـەرز ئەکـەن و نـای دەنـەوە ، سامانی خۆیان لەلایە ترەوە دائەنێن . نمونەی ئەو کەسانە زۆرن ، مەبەستیان ئەوەیــە نـاوی ئەو کارانەیان دەنگ بداتەوە ، ئەو کەسانە ساویلکەن بیان خەڵەتێنن . ئێوەی ژیر ئـەتوانن تاقمی زۆر تر بدۆزنەوە لەو کەسانە .

لەنێو ئادەمیزادا زۆر کۆمەل هەن بــەهۆی سـامانی زۆرەوە لـەخۆیان بـایی بـوون وەك ئەمانەی خوارەوە :

١- کۆمـەڵێ هـەن زۆر خۆیـان مـاندوو ئەکـەن بـۆ دروسـت کـردن و ڕازانــەوەی مزگەوت و تەکیە و خانەقا و خەستەخانە و پرد و گۆلاوی ئاو و ڕێگە و بان ، ئەو جۆرە کارانـە هەرچـەندە بەڕوواڵــەت کـارێکی زۆر چـاکن . بـەڵام بەداخـەوە سـوودیان بـۆ خاوەنەکانیان نیە ، چونکە بۆ ئەوەیە ناویان لەسەر دەرگاکانیــان بنووسـن ، لەڕۆژنامـەو گۆڤارا ناویان بلاو ببێتەوە ، هەتا پاشە ڕۆژ ناویان گوم نەبێ و باسیان بکرێ ، گومانیــان

وایە بەختیارن . بەڵام تاوانباران ، چونکە کردەوەکانیان بەڵگەیەکە ئەو کەسانە بەو جۆرە پێویستبێ باوەڕیان بەخوا و بەپاشەڕۆژ نە بێ ، خۆیان ماندوو ئەکەن ، بۆ پەرەپێدانی سامان لەڕێگەی ناڕەوایدا. گرنگ نیە لایان ؟ گومانیان وایە ئەو کارانە ئەیکەن ئەگەنە فریایان کەچی بەپارەوە نانێ بیدەن بەهەژارێ ڕژدو چاو چنۆکن چونکە لەم لایەوە ناویان نابرێ ، نازانن مزگەوت بۆ ئادەمیزادە ، ئەگەر ئەوان برسی بن و نەتوانن بچن بۆ مزگەوت بۆ چ کەسێکی دروست ئەکەن ؟ لەئاستی فەرموودەی خوا کەڕن کە ئەو شتەی لەزەویدایە بۆ ئادەمیزادە .

٢- کۆمەڵێ تریان هەن : دارایی پاك و ڕەوایان هەیە ، بەگوێرەی توانای خۆیان خۆیان لەبێ فەرمانی خوا ئەپارێزن . بەڵام ئەو سامانەی هەیانە بۆ دروست کردنی مزگەوت لە ناوی ئەبەن هەتا ناویان دەنگ بداتەوە و سوپاس بکرێن ، کەچی هەژاران و بێ نەوایان بەزۆری هەن و دراوسێی ئەوانن بگرە خزمیانن دەست گیرۆییان ناکەن ، هەرچەندە مزگەوت دروست کردن زۆر چاکە ، بەڵام ئەبێ بەگوێرەی پێویست مزگەوت دروست بکرێ . مەبەست لەئایینا ئەوەنیە لەهەموو کۆڵانێ مزگەوتێکی تێدا دروست بکرێ ، ئەوانە بەجێگەی خۆی کەچی پارە و پولێکی زۆر بۆ نەخش و نیگار و بۆیە لەناو ئەبەن کەئەو جۆرە کارانە دژی یاسای ئایین و ئەبنە هۆی سەر لێشێوانی نوێژکەران ، خۆیان گێل ئەکەن لەفەرموودەی حوسەینی کوڕی عەلی کاتێ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ مزگەوتی مەدینەی دروست ئەکرد جبرەئیل فەرمووی : مزگەوت دروست بکە بەمەرجێ نەیڕازێنیتەوە ، کەواتە ئەو کەسانە بەو کارانە سەر لێشێواون و لەخۆیان بایی بوون .

٣- کۆمەڵێ تریان هەن : سامانی خۆیان ئەدەن بەهەژاران و بێ نەوایان ، بەڵام کۆڕی بۆ ئەگرن ئنجا ئەیان دەنێ ، زۆر جار دروایسێکانیان بەبرسێتی ئەیان خەنە پشتی گوێیان و دەست گیرۆییان ناکەن ، خۆیان لەهەڕەشەکانی قورئانی پیرۆز لەو بارەیەوە کوێر ئەکەن .

٤- كۆمەڵێ تریان هەن : دارایی‌یەكانیان ئەشارنەوە نایدەن بەكـس ، بـەڵام هەرشـتێ سامانی تێدا دانەنرێ و بەبێ پارە بكرێ سەریان پێوە نی‌یـە و ئەیكـەن ، ڕۆژوو ئـەگرن ، نوێژی زۆر ئەكەن ، قورئان ئەخوێنن . وێنەی ئەو كەسـانە بـەم جۆرەیـە : پیـاوێ مـارێ چۆتە سەر لـەشـی و نزیكـە پێـوەی بـدا و بیكـوژێ ، كـەچی لـەبریتی ئـەوەی چارەیـە بدۆزێتەوە بۆ لابردنی هەڵئەسی دەرمانی ڕەونی ئەخوا ، ماران گاز چۆن ئـەبێ كـاری وا بكا .

٥- كۆمەڵێ تریان هەن : جگە لـەزەكاتی پێویست هیچ شتێ تر بەهەژاران نادەن بگرە ئەوەی خراپ بێ ئەیدەن لـەزەكاتا ، خۆ ئەگــەر زەكـات بـدەن بەهـەژاران بـەڵێنیان لێ ئەسێنن ئەو كاتە یا لـەپاشەڕۆژدا ئەوانیش كارێ بۆ ئەوان بكەن ، ئەو كەسانە بەو مەرجـە یان زەكاتەكەیان پووچ ئەكەنەوە ، كەچی گومانیان وایە خواپەرستن و نازانن گوناهبـارن، چونكە پەرستنی خوا ئەفرۆشن بەو مەرجانە لـەگەڵ هەژاران ئەی بەستن .

٦- كۆمەڵێ تریان هەن : وائەزانن پەرستن ئەوەیە بچنە نێو كۆڕ و كۆمەڵەوە و گـوێ بگرن لـە ئامۆژگاری زانایان ، و اگومان ئەبەن ئەو شتانە ئەگەنە فریایـان لـەپاشـە ڕۆژدا ، ئەو زانایانە ڕزگاریان ئەكەن ، ئەو كەسانە هەرچەندە گوێ ئەگرن لـەئامۆژگاری ، بـەڵام بەو جۆرە پێویستە وەری ناگرن هەتا كار بەناوەرۆكی بكـەن ، وێنـەی ئـەو كاسـانە وەك نەخۆشێ وان گوێ لـەپزیشك ئـەگرێ و سـوودی دەرمـانی بـۆ دەرئەكـەوێ و بـۆ ئـەو نەخۆشی‌یە بەكاری ناهێنێ ، یاوەك مرۆڤێكی برسی وایە خواردەمەنی لـەلایا بـێ و نـەی خوا هەتا ئەمرێ .

بەشێ تری زۆر هەن لـەئادەمیزاد : ناوی خۆیانیان نـاوە مورید و تەوبـەكار و خـاوەن تەریقەت بەلای خۆیانەوە ڕێگەی خوا پرستیان گرتووە كەچی زۆربەیان سەر لێ شـێواون و داماوی ڕۆژی دوایین ، هەریەكەیان بەجۆرێ وەك لـەخوارەوە باسیان ئەكەین :

١- كۆمەڵێ لـەوانەهەن : لاسایی دۆستانی خـوا ئەكـەن لـەبـەرگ و ڕەنـگ و شـێواز و ڕەوشت و گفتوگۆ و درۆشما ، دەست ئەكــەن بـەگۆرانی ووتـن و سـوورڕدان و هـۆرە و

سیاچەمانە ، هەروەها لەبەجێ هێنانی نوێژ و دەست نوێژ دا و دانیشتنیان لەسەر کـەوڵ و بەرماڵ ، هەندێ جار دەست ئەکەن بەلەرزین و سەر سوڕان ، هـەندێ جاریش سەریان شۆڕ ئەکەنەوە و چاویان ئەنوقێنن و هەناسەی درێژ ئەدەن ، بەنزمی چپەچپ ئەوکەن لەناکاودا ڕاوالـێنێکی کی زۆر ناقۆڵا ئەدەن و قیڕەیەکی زۆر نالەبار ئەکەن ، ئەبنە هۆی ترساندنی ژن و منالّ و دانیشتوان ، کەچی ئەو کەسانە لەهەرلایەکەوە پاروە نانێ پەیدا بێ پەلاماری ئەدەن ، گۆێیان لەوەنیە قەدەغە بێ بەگوێرەی یاسای ئیسلام یانە؟ . لەدەرگای کۆشکی کار بەدەستان ئەدەن هەتا بچنە لایان بەهەر فێڵ و فڕو دەست برینێ بێ پارە و پوول و دانەوێڵە پەیدا بکەن لەژێر پەردەی خوا پەرستیدا ، گومانیان وایە ئەو کارە خراپانە ئەگەنە فریایان ، ئەو کەسانە وێنەی پیرەژنێ وان ئەبیسێ پیاوانی ئازاو پاڵەوان و کارامە و جەنگاوەر ناوی خۆیان ئەنووسن بۆ ڕزگاری نیشتمان ، پیرە ژنیش ئەچێ ناوی خۆی ئەنوسێ لەڕیزی ئەواندا ، بەرگ و چەکی ئەوان ئەدا لەخۆی خـۆی ئەگەیەنێتە خزمەت پاشا بۆئەو مەبەستە ، پاشا کەدەست ئەکا بەهەڵبژاردنیان تووشی ئەبێ بەچارەی پیرەژنەوە. پاشائەڵێ پیرەژن شەرم لەخۆت ناکەی و نەختێ گاڵتەی پێ ئەکەن ، لەپاشا فەرمان ئەدا ئادەی پێ شێلی کەن و بیکوژن .

٢- کۆمەڵێ تریان هەن : بەرگی پینە پیناوی و دڕاو ئەکەنە بەریان ، خواردەمەنی کـەم و کوڕ ئەخۆن ژن ناهێنن و خانوو بۆ خۆیان دروست ناکەن ، هـەوڵ و کۆشش نادەن بۆ پەیدا کردنی هۆی ژیان ، بەلام تەیلسان و بەرماڵ و تەزبیح هەڵئەگرن ، کەنرخیان زۆر گرانترە لەئاوریشم و قوماشی تر . مەبەستیان ئەوەیە بەتیکەی خۆش و قەڵەو دارایی زۆری کاربەدەستان بۆ لای خۆیان ڕاکێشن ، زۆر جاران خۆیان ئەکەن بەبار بەسەر خەڵکەوە و نانیان ئەخۆن ، گومانیان وایە ئەوانە کاری چاکن . ئەو جۆرە کەسانە زیانیان زۆر ترە بۆ موسوڵمانان لەدز و دزۆزن و جەردە . چونکە ئەمانە بەهۆی شێوازی ناڕەوایانەوە ئادەمیزادی ساویلکە ئەخەڵەتێنن و والەهەندێ کەس ئەکەن کە لاساییان بکەنەو ، ئەبنە هۆی شاردنەوەی ڕوی ڕوونی ئایین . دوژمنانی ئیسلام لەسەر موسوڵمانانی ئەژمێرن .

٣- کۆمەڵێ تریان هەن : ئەڵێن : ئێمە بەرچاومان ڕوونـە ، پلـە و پایـەمان زۆر بـەرزە ، زۆر پلەی تریشمان بەرێگەوەیە و کاری نهێنی ئەزانین ، چونکە پلـەی دۆستانی خوامـان بڕیوە و هەموویانمان بۆ پەیدا بووە ، نزیکین لەخواوە ، بەڵام جگە لـەگفتوگۆی درۆ نـەبێ فێری هیچ شتێ تر نەبوون ، گفتوگۆی بێ مانا و خوار و خێچ بەدەمیانا دێ ، وێنەی قلـی و بلی و قیجەج و بیجەج کەمانایان نازانرێ ، والە خەڵکی ئەگەیەنن لەگەڵ پیاو چاکـان و فریشتەکان گفتوگۆ ئەکەن ، گومانیان وایە بـەو شـتانە ئەگەنـە کۆتـایی پلـەی بـەرزی تەسەووف ، بەچاوی سووك و گاڵتەوە تەماشـای یاساناسـان و زانایـان ئەکـەن ، هـەموو بەشەکانی زانین و زانیاری لەپێش چاوی ئادەمیزاد ئەخەن . بـەو کـارە خراپانـە جوتیـار و جـۆڵاو خـەیات و بازرگـان و مووچـەخۆران و کرێکـاران و ژنـان و سـاویلکەکان واز لەپیشەکانی خۆیان بهێنن و بکەونە دوای ئەوان ، هەتا بەکاریان بهێنن بۆ مەبەستی خۆیان، پێیان ئەسەلمێنن بەجادوگەری خۆیان ئێمە پەیامان لەلای خواوە بۆ هاتووە و هەواڵی نـهێنی ئەدەین . ئەڵێن : جگەی ئێمە خۆیان ماندوو ئەکەن لەپەرستنی خـوادا وەك ئێمـە بەئـەنجام ناگەن . ئەڵێن : زانایان بەخۆڕایی خەریکی قورئان و فەرموودەی پێغەمەرن بۆیە بەرچاویان تاریکە . بەڵام ئێمە ئەو شتانە ناکەین و بەپلەی نزیك بوونـەوەی لای خـوا گەیشـتووین ، کەچی ئەو کەسانە لەناوەرۆکا ساختەچی و دەست بڕن و بەگوێرەی یاسای قورئان .

٤- کۆمەڵێ تریان هەن : کاری چاکە ئەکەن و بەشـوێن کـاری چاکـەدا ئـەچن ئاگایـان لەدەرەوونی خۆیاوزن هەیە و خۆیان ئەناسن ، بەڵام بەشێوەیە تر خۆیان ئەدۆڕێنن و ئـەڵێن : ئێمە پلەی بەرزی لای خوامان هەیە و جیـهانمان نـاوێ و پشـت بـەخوا ئەبەسـتین بـەهێچ جۆرێ ئاگایان لەپلەی سۆفێتی نی‌یە و نازانن مەرجەکانی چـین . هەیانـە ئـەڵێن : مەسـتی خۆشەویستی خواین ، ئاگامان لەدەوروبەری خۆمان نی‌یە ، ئەو کەسانە بەو کارە خراپانـە لەخۆیان بایی بوون و خۆیانیان کردووە بەجێگەی خەشمی خوای مەزن .

٥- کۆمەڵێ تریان هەن : ئازاری خۆیان ئەدەن بەخواردنی کـەم ، ئـەڵێن : خواردەمـەنی ڕەوامان دەست ناکەوێ ، ئەو کەسانە دڵێ خۆیان ناپشکنن بزانن چی تێدایـە ، ئـەندامانی

خۆیان ناخەنەکارەوە بۆ خواردەمـەنی ڕەواو پـاك ، هـەندێ تریـان هـەن : بەپێچەوانـەی ئەوانەی پێشوو خواردن و بەرگی ڕەوای گران بەهای زۆر بەکاردێنن بەجۆرێ لەئەندازەی یاسای دەرئەکەن ، ئەو دوو تاقمانە هەردوو لایـان خراپـن ، هەریەکـەیان بەشـێوەیە سـەر لێشێواون ، خوای مەزن فەرمانی داوە لەخواردن و پۆشـاکا مـام نـاوەندی بـن و لـەیاسـا دەرنەچن .

٦- کۆمەڵێ تریان هەن : ڕەوشتی چاکی بەڕواڵەتیان هەیە ، چاو پۆشـی و نـەرم و نیـانی دەرئەبڕن لەبەر چاوا بەمەبەستی خزمەتی سۆفێتی ، سۆفیەکان کـۆ ئەکاتـەوە و خزمـەتیان ئەکەن و نان و خواردەمەنیان بۆ ساز ئەکەن ، ئەیان کەن بەداو بۆ بەدەست هێنانی سـامان و پارە و پوول کۆکردنەوە ، بەناوی خزمەتی ئەو سۆفیانە کەهەژارن لەنێو ، ئەواندا هەندێ لەستەمکارانی زۆر کۆئەکەنـەوە ، بـەزمانی لـووس وایـان لێ ئەکـەن پـارە و فلسـیان لێ وەرگرن کەمێکی لەخزمەتی دەروێش و سـۆفیەکاندا لەناوئەبـەن . بـەڵام زۆربـەی زۆری هەڵئەگرن بۆ خۆیان ، لەمەبەستی خراپی خۆیانا دای ئەنێن . ئەو کەسـانە خۆیـان سـەر لێ شێواون و جگەی خۆیان ئەخەڵەتێنن .

٧- کۆمەڵێ تریان هەن : خۆیان ماندوو ئەکەن لەڕەوشتی خۆیانا بـۆ لابردنـی نـەنگی و شوورەیی خۆیان ، زۆر بەقوڵی بۆی دائەچن ، کاتی خۆیان بەفیڕۆ ئەدەن بۆ ئەو مەبەستە ، ئەوەندە بەجوان کـردن و ڕازانـەوەی خۆیانـەوە خـەریکن هەزاریـەکێکی ئـەوەی خۆیـان نابەستن بەفەرمانی خوای‌مەزنەوە ، خراپە و کاری نارەوایان ناژمێرێ ، وێنەی ئەو کەسـانە وەك ئەو کەسانەیە خۆیان ئەکەن بەناو خوا پەرست ، ئەگەڕێن بە شوێن دۆزینـەوەی کاتـە دیاری کراوەکانی حەج و کارەگرنگەکانی حەج ، کەچی بەهیچ جۆرێ بەڕێگەی حـەجدا ناڕۆن ، بابزانن ئەو خۆ ماندوو کردنەیان جێگەی حەجیان بۆ ناگری کەواتە ئـەو کەسـانە سەر لێ شێواون .

٨- کۆمەڵێ تریان هەن : پلەیە لەپلەکانی دەروێشی ؤ سۆوفێتی ئەبڕن ، دەسـت ئەکـەن بەبڕینی پلە و ڕێگەیە تر بەکردنەوەی دەرگای خواناسی ، بەڵام کـەبۆنی سـەرەتای پلـەی

خواناسینیان کرد بەلایانەوە سەیر دێتە برەچاویان و پێـی خۆشـحاڵ ئـەبن . بـەو بۆنەیـەوە لەخۆیان بایی ئەبن ، دڵیان بەو پلەوە ئەچەسپێ و هەموو کاتـێ بـیری لێ ئەکەنـەوە چۆن دەرگای ئەو پلەیەیان بۆ کرایەوە ، ئەیانـەوێ پلـەی زۆرتریـان دەسـت کـەوێ و بگەنـە کۆتایی پلەکان ، ئەو کەسانە گێل و نەزانن و نازانن ڕێگەی بەخوا گەیشتن کۆتایی نایـە ، ئەو کەسانە جگە لـەوە لـەوپلانە بیرئەکەنەوە خۆیان بەچاکەو فەرمانی تری ڕەوا وە خەریك نابن ، وێنەی ئەو کە سانە وەك ئەو کەسانە وان ئەیانـەوەێ بگەنـە لای پاشـا لـەڕێگـەدا و لەبەردەم کۆشکی پاشادا چاویان بەچیمەن و گوڵ و گوڵزاری جوان ئەکەوێ کەهـەرگیز شتی وای بەخۆیەوە نەدیوە ، خۆی بەتەماشـای ئەوانـەوە خـەریك ئـەکا ، کاتـێ ئـەوزانێ ماوەی بەخزمـەت گەیشـتنی پاشـای لـەدەسـت دەرچـووە ، پەنجـەی خـۆی بـەبێ سـوود ئەگەزێ، ئەو کەسانەیش بەرامبەر بەنزیك بوونەوەی خزمەتی خوای مەزن وێنەی کەسـانی وان ، کاتێ ئەزانێ سـەر بـەرەو خـوار ئەخرێتـە نێـو چـاڵی نەفرینـەوە . هـەردوو لایـان بەخەفەتەوە سەر ئەنێنەوە ، جارێ تر ئەو کارەیان بۆ ناگەڕێتەوە .

٩- کۆمەڵێ تریان هەن : ئەو پلانەی بۆیان دیاری کراوە بەسـادەیی ئـەیان بـڕن ، بـەڵام ئاوڕێ نادەنەوە بۆلای ئەو شتەپیرۆزانەی دەستیان کەوتووە ، لەهەڵپەدان بۆ بەرز بوونـەوە بۆلای پلەیە تر ، کاتێ بەو پلـەیەی خۆیە گەیشت وائەزانێ بەهەموو پلـەکان گەیشـتووە ، ئیتر واز لـەهەوڵ و کۆشش ئەهێنن و ئەوەستن لـەشوێنی خۆیانا ، بەو بۆنەوە ئەکەونـە بـێ جابی و پەرتەوازە ئەبن و لـەم لایش ئەبن و لـەو لایش .

ئـەو تاقمانـەی هـەتا ئـێرە باسمـان کـردن گەیشـتە (٤٣) تـاقم (٤١) تاقمیـان لـەنێو موسوڵمانانا هەن و لەڕیزی موسوڵمان ئەژمێرێن ، بەڵام ئازار و ئێشیان بۆ موسوڵمان زۆر ترە لە بێ باوەڕان ، خۆیان دۆڕاندووە جگەی خۆیان بەهەڵـەبردووە ، دەمـی ناحـەزان و دوژمنانی ئیسلامیان کردۆتەوە ، بەو باڵە ڕووانە خراپەیانەوە تەماشای پاکی ئیسلام ئەکـەن بەڵام ئیسلام لەوانەوە دوورە و قورئان بەڵگەیە بۆیان .

لەمەو پێش باسمان کرد کە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : پەیڕەوانی من ئەبن بە (٧٣) تاقم ، ئەو تاقمانە لەبارەی بیرو باوەڕەوە پەرتەوازەن کە پەیوەندییان بەبنچینەی ئاینی ئیسلامەوە هەیە ، هەیانە بەبۆنەی بیروباوەڕیانەوە لەئیسلام وەرگەڕاون ، ئێستا بەیاریدەی خوای مەزنەوە باسی ئەو تاقمانە ئەکەین ، زۆربەی ئەو تاقمانە لە بنچینە سەرەکییەکانی ئیسلامدا دژی یەکترین ، بەجۆری زۆربەیان وەك ووتمان لەئاینی ئیسلام دەرچوون ، ئەو تاقمانەیش ئەمانەی خوارەوەن:

١- ( أهل السنة والجماعة ) ئەو کەسانەن خاوەنی ڕەوشتەکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ و کۆمەڵێ موسوڵمانانن ، ئەوانە پەیڕەوی ئەو کارانە ئەکەن کە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ و هاوڕێکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لەسەری بوون . کەواتە بەگوێرەی فەرموودەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەو تاقمەن ڕزگاریان ئەبێ لەئاگردی دۆزەخ .

٢- ( الواصلية ) ئەو کەسانەن سەرەو لای واسیلی کوڕی عەتائی ئەلئەلسەعن قوتابی حەسەنی بەسریە و لای ئەو خوێندوێتی ، لەدواییدا لەبیروباوەڕدا لەمامۆستاکەی جیا بویەوە ، ئەو تاقمە لایان وایە خوا خاوەنی سیفات و شێواز نییە ، زانین و توانا و ویست و زیندەگانی جیاواز لەخۆی نییە ، بەڵکو خوا خۆی لەخۆیا بەتەنها هەموو شتێ ئەزانێ و هەموو شتێ دروست ئەکا و ئەیان بینێ و ئەیان بیسێ هەتا دێ ، بەلایانەوە وایە خوای مەزن چارەنووسی پاشەڕۆژی ئادەمیزادی بەدەست نییە ، خۆیان بۆخۆیان چارەنووس دروست ئەکەن ، چاکە و خراپە و هەموو شتێ بۆ خۆیان دیاری ئەکەن ، ئادەمیزاد ئەکەن بەسێ بەشەوە : بێ باوەڕان ، باوەڕداران ، مام ناوەندی نەباوەڕدار و نەبێ باوەڕە یانی خاوەنی گوناهە گەورەکان نەباوەڕدارن نەبێ باوەڕ، بەلایانەوە وایە ئەو دوو تاقمەی موسوڵمانان لەسەر خوێنی عوسمانی کوڕی عەفان چوون بەگژی یەکتریدا لەسەر کارێکی نارەوا بوون ، چونکە نازانرێ کام لایان ڕاست ئەکەن ، کەواتە عەلی کوڕی ئەبی تالیب و زوبەیر و تەلحە گوناهبارن و شایەتیان دروست نیە ، چونکە بۆمان دەرناکەوێ کام لایان ڕاست ئەکەن .

٣- ( الهذلية ) ئەو کەسانە سەر بەحەمدانی کوڕی هوزەیلن ، باوەڕیان وایە خوا خـۆی و سیفەکانی یەکن ، ویستی خوا بێ جێگەیە پەیوەندی بەشوێنێکی تایبەتیەوە نی‌یە ، فەرمانی خـوا وائـەبێ ئەچێتـە سـەر جێگەیـەك ، وەك ﴿ فـأقيموا الصـلاة ﴾ ، وائـەبێ پـەیوەندی بەجێگەیەکەوە نیە ، چاکە و خراپە هەردوولایان بەدەست خوایە و ئادەمیزاد بێ دەسـتەڵاتە و توانای هیچ شـتێکی نی‌یە ، جگە لەوانەیـش هـەندێ تـر بـیروبـاوەڕی نـاڕەوایان هەیە .

٤- ( النظامية ) سەر بە ئیبراهیمی کوڕی یەساری کوڕی هائینی نیزامن ، بەلایانەوە وایە خوا توانای بەسەر خراپەدا نی‌یە ، خوا بوونەوەرانی بەیەك جار دروست کردووە ، خاوەنی ویست و سیفاتی خۆی نی‌یە ، سیفاتی خۆی پاش خۆی دروست کـردووە ، کەواتـە خـوا یەکەمین جار خاوەنی زانین و دانا نەبووە ، ئادەم بەر لـەکوڕەکانی دروست نەکراوە . بەڵام خوا وێنەی هەندێ لەبونەوەرانی شاردوەتەوە بۆ ماوەیەك ، یەك لـەدوای یەك دەریان ئەخا ، پێشەوای موسوڵمانان پێویستە خوا و پێغەمەر دیاریان بکـەن ، وەك وێنـەی عـەلی کـوڕی ئەبی تالیب ، چەند بیرو باوەڕی تریان لـەو بابەتە هەیە .

٥- ( الحابطية) سەر بەئەحمەدی کوڕی حابتین ، بەلایانەوە وایـە عیسـا جـۆرە بەشـێکی خوای تێدایە ، ئادەمیزاد پاش مردنیان ئەگەر خاوەنی چاکە بن گیانەکەیان ئەکری بەبـەری زیندەوەرێکی بێ ئازاردا ، ئەگەر خاوەنی خراپە بن ئەکرێ بەبەری زیندەوەرێکی دڕندەدا ، چەندین بیروڕای تری لـەو بابەتەیان هەیە .

٦- ( البشرية) هاوڕێکانی بیشری کوڕی موعەمەرن ، بیروباوەڕیـان وایـە خـوا توانـای هەیە سزای منالانی بێ تاوان بدا ، لایشیان وایە ئەگەر سزایان بدا ستەمیان لێ ئەکا . بـەڵام سزایان نادا هەتا پێی نەوترێ ستەمکار ، ئەگەر مرۆڤێ گوناهی کردو پەشـیمان بوویـەوە و دووبارە گەڕایەوە بۆ لای گوناە هەتاهەتایە پەشیمان بوونەوەی تری لێ وەرناگیرێ ، ئەوانـە و چەندین بیروباوەڕی تریان هەیە .

٧- ( المعمرية ) هاورێکانی موعەمەری کوڕی عوبادن ، بیروباوەڕیان وایە کە خوا جگە لەلەشی بوونەوەران هیچ شتی تری دروست نەکردووە ، وەك ڕەنگ و ڕوخساریان و گەرمی و ساردی و هەڵسان و وەستان ، هەتادێ ، بەڵکو ئەوانە لەشەکان پەیدای ئەکەن بەبێ توانای خوای گەورە ، لایان وایە نابێ بەخوا بیێژرێ (قدیم ) یانی کۆن ، چەندین باوەڕی خراپی تریان هەیە .

٨- ( المرادية ) هاوسەرەکانی عیسای کوڕی سەبیحن و نازناوی مورداده ، ئەوانە لایان وایە جگەی خوا ئادەمیزادیش ئەتوانێ وێنەی قورئان دابنێ لەپاراوی زمان و ڕەوانیدا ، بەلایانەوە وایە هەرکەسێ بڵێ : قورئانە کۆنە بێ باوەڕ ئەبێ ، چەندین بیرو باوەڕی تریان هەیە .

٩- ( الثمامية ) هاورێکانی سنمامی کوڕی ئەشرەسن ، بەلایانەوە وایە شتی واهەیە خوا دروستی نەکردووە ، وەك ئازاری پاش لێدان کە دروست کراوی هیچ کەسێ نییە ، لایان وایە بێ باوەڕان بەگشتی لەڕۆژی دواییدا ئەبنەوە بەخاك بەوێنەی جانەوەرانی تر ، ئەوانە و چەندین بیرو باوەڕی تریان هەیە .

١٠-( الهشامية ) دەست و پەیوەندی هیشامی کوڕی عەمرن ، بیرو باوەڕی خراپیان وایە خۆشەویستی خوا نایخاتە دڵی موسوڵمانانەوە بۆ یەکتری ، بەخۆیان بەویستی خۆیان پەیدای ئەکەن ، بەلایانەوە وایە هەڵبژاردنی پێشەوا بۆ موسوڵمانان لەکاتی جەنگدا و ئاشوبەدا پوچە و دانامەزرێ ، بەهەشت و دۆزەخ هێشتا دروست نەکراون ، چەندین بیرو باوەڕی تری لەو جۆرانەی هەیە .

١١-( الجاحظية ) سەر بەعەمری کوڕی بەحری جاحیزن ، بەلایانەوە وایە دۆزەخیەکان هەتا هەتایە سزا ناکێشن ، بەڵکو خۆیان بەسروشت ئەبن بەئاگر ، چەندین بیرو باوەڕی تری خراپیان هەیە .

١٢-( الخياطية ) هاوەڵەکانی ئەبی لحوسەینی کوڕی ئەبی عەمری کوڕی خەیاتن ، بەلایانەوە وایە خوای مەزن ویستەکەی سیفەتی خۆی نییە و خاوەنی ویست نییە ، بەڵکو

ئەگەر بێژرا ، خوا خاوەن ویستە مانای وایە خاوەن زانا و توانایە ، لایان وایە خـوا کـەس زۆری لێ ناکا و زۆریش لـەکەس ناکا بۆ کردنی هیـچ شـتێ ، ئەوانـە و چـەندین بـاوەڕی تورەهاتی تریان هەیە .

١٣-( الجباثیة ) ئەوانە سەر بەئەبی عەلی موحەممەدی کـوڕی عـەبدولوەهابی جوپاسـن ، بەلایانەوە وایە ویستی خوا تازە پەیدا بووە ، خۆی نابەستێ بەجێگەیەکـەوە و ناچێتـە سـەر هیچ شتێ ، چەندین باوەڕی پۆخڵەی تریان هەیە.

١٤-(الجهمیة ) هاوڕێکانی جـەهمی کـوڕی سـەفوانن ، بەلایانەوەوایـە ئـادەمیزادی بـێ تواناو نەتوانێ هیچ شتێ بکەن ، وێنەی درەخت و بەردن بەرامبەر بەخوا ، کرداری ئـەوان خوا ئەیکا ، بلایانەوە وایە بەهەشت و دۆزەخ پاش ئەوە ئادەمیزاد چوونە ناویان و خۆشـی و ئازاریان چێشت لـەناو ئەچن و نامێنن .

١٥-( النجاریة ) سەربەحوسەینی کوڕی موحەممەدی نەجارن ، هەموویان بەلایانەوە وایـە خوا خاوەنی زانین و ویست و زیندەیی و بیستن و بینین نی‌یە ، کرداری هـەموو ئـادەمیزاد خوا دروستی کردووە ، ئادەمیزاد خۆیان کەمێ توانایان هەیەس ، خـوا لـەڕۆژی دواییـدا نابینرێ ،چەندین بیروباوەڕی تریان هەیە .

١٦-( الضراریة ) سەر بەزیراری کوڕی عەمرن ، بەلایانەوە وایە خـوا خـاوەنی زانـین و توانایە چۆنێتی خوا جگە لـەخۆی کەسی تر نایزانێ ، ئادەمیزاد بەس بەبەڵگـە ئزانـن خـوا هەیە ، ئادەمیزاد بەهەستێکی شەشەم جگە لـەو پێنج هەستەی هەیانە لەڕۆژی دواییدا خوای پێ ئەبینن ، هەموو کرداری ئادەمیزاد دروسـت کـراوی خـوان ، ئـادەمیزاد ئـەیان کـەن بەپیشە بۆ خۆیان ، چەندین بیرو باوەڕی تریان هەن هەندێکیان نەگونجاو نین .

١٧-( الأشعریة ) هاوەڵەکانی بەڕێز ئەبی‌حەسەنی ئەشعەرین باوکی نـاوی ئیسـماعیلە ، بەلایانەوە وایە ئادەمیزاد بیری کـردەوە لـەدروسـت بوونـی خۆیـان و چـۆن پـەیدابوون و گەشەیان کردووە و پێ گەیشتن ، بەهیچ جۆری خۆیان ئاگایان لـەدروست بوونـی خۆیـان

نەبووە ، کەواتە ئەبێ پەروەردگارێ ببێ و سەلماندیان خوا هەیە ، خاوەنی زانین و زیندەیی و ویست و توانا و بیستن و بینین و فەرمودەیە ، بێ وێنە و بێ هاوبەش ، خواردن و خواردنەوە و خەوتن و نوستنی نیە ، ئاگاداری هەموو شتە و چارەنووسی هەموو بوونەوەران بەدەستی ئەوە بەهیچ جۆرێ ناکومی و ناتەواوی لەهیچ ڕوویەکەوە ڕووی تێ ناکا ، خاوەنی ئەو بیرو باوەڕانە ئەو تاقمن لەمەو بەر باسکران و ناوبران بە (أهل السنة والجماعة ) ، چەندین بیروباوەڕی تریان هەن هەموویان جێگەی شایستەن ، کەمێکیان نەبێ ئەوانیش جێگەی خراپە نین .

١٨-( المشبهة ) ئەو تاقمەن وێنە بۆ خوا دائەنێن ، هەیانە ئەڵێن : خوای مەزن خاوەنی ئەندام و گیانە ، لەش و قەوارەی هەیە ، لەوانەیە بەروژوور و بەرەو خوار بڕوا و ئارام بگرێ ، وائەبێ دەست بدا لەلەشی ئادەمیزادەوە و دەستیان بگوشێ . ڕۆژباشیان لێ بکا ، بە لایانەوە وایە ئادەمیزاد بەهۆی پارێز و وەرزشەوە بگەنە ئەو پلەیە باوەش بکەن بەملی خوادا ، بەو بۆنەوە لەوانەیە ئادەمیزاد و خوای مەزن دیدەنی یەکتری بکەن ، هەیانە گومانیان وایەخوا خاوەنی لەش و گۆشتە و خوێن و دەست و قاچ و سەر و زمان و چاو و گوێ و شتی ترە ، بەڵام ئەوانەی خوا هەنی وێنەی ئەوانە نین زیندەوەرانی تر هەیانە ، چەندین بیرو باوەڕی تری خراپیان هەیە .

١٩-( الكرامية ) هاوەڵەکانی ئەبی عەبدوولای موحەمەد کوڕی کەرامن ، ئەوانەی لەنێو خۆیانا ئەبن بە (١٢) بەش ، هەیانە ئەڵێن : خوا بەسەر تەختەوە دانیشتووە لەبڵندترین جێگەدا ، خاوەنی لەش و تەنە ، وائەبێ لەسەر ئەو تەختە دابەزێ و جێگەکەی خۆی بگوێزێتەوە بۆ شوێنی تر ، هەیانە گومانیان وایە خوا خاوەنی وێنەیە و بۆش و خرە دەست گوشین و باوەش پێدا کردن و گوشینی بۆ هەیە ، بەلایانەوە وایە پێشەوا عەلی و مەعاویە سەرۆکایەتیەکانیان دروستبێ و ڕەوابێ ، عەلی جێگەی گومانی نارەوایە چۆن چاوپۆشی لەکردەوەکانی عوسمانی کوڕی عەفان کرد ؟ چەندین بیرو باوەڕی تری ناپەسەندیان هەیە .

٢٠- ( المحكّمة الأولى ) ئەوانەن وازیان لەپێشەوا عەلی هێنا کەڕازی بوو لەناوبجی گەری سەلمان لەنێوان خۆی و مەعاویە دا ، بەلایانەوە وایە پێشەوای موسوڵمانان لەجگەی قورەیش پەسەند و دروستە ، عەلی کارێکی ناپەسەندی کردووە کە بەجگەی فەرمانی خوا ڕازی بوو کە ناوبژی سەلماند ، نەفرەت لەعوسمان ئەکەن لەسەر کارەکانی ، پێشەوا عەلی بێ باوەڕە لایان ، چەندین بیرو باوەڕی خراپی تریان هەیە .

٢١- ( الأزارقیة ) ئەوانەن سەر بەڕاشیدی نافیعی کوڕی ئەلئەزرەقن ، بەلایانەوە وایە کەپێشەوایانی بەڕێز عەلی و عوسمان و تەلحە و زوبەیر و عایشە و عەبدولآی کوڕی عەباس و هەموو ئەو کەسانەی سەر بەوانن هەموویان بێ باوەڕن هەتا هەتایە لەدۆزەخدان ، بەلایانەوە وایە کوشتنی منالّ و ژنی جگەی خۆیان ڕەوایە ، زینا کەر بەردەباران ناکرێ ، بۆیان هەیە بۆ سوودی خۆیان بەزمان درۆو کردەوەی دژ بەبیروباوەڕی خۆیان بەکار بهێنن، بۆ ئەوەی خۆیان لەئازارو کوشتن بیان پارێزن ، چەندین بیرو باوەڕی تری خراپیان هەیە .

٢٢- ( النجدات العازریة ) هاوڕێکانی نەجدەی کوڕی عازیرن ، بەلایانەوە وایە ناسینی خوا و پێغەمەر و بڕوا کردن بەقەدەغە کردنی خوێنی موسوڵمانان و دەست بەسەراگرتنی دارایی موسوڵمانان و ، بڕواکردن بەهەموو ئەو شتانەی لای خواوە هاتوون پێویستن بەبێ گومان ، بۆ ناسینی جگەی ئەوان ، ئادەمیزاد بیانویان لێ وەرئەگیرێ ئەگەر نەزانن قەدەغەن یان ڕەوان لای خوا ، بەلایانەوە وایە ئەو کەسانە لەسەر بیرو باوەڕی ئەوانن خوا سزایان نادا بەئاگرێ سزای جگەی ئەوانی پێ ئەدا ، مەی خۆران لای ئەوان دارکاری ناکرێ ، هەر کەسێ لەسەر بیروباوەڕی ئەوان نەبێ دۆزەخ جێگەیەتی ، چەندین بیرو باوەڕی تری خراپیان هەیە .

٢٣- ( البیهسیة ) تاقمی ئەبی بەیهەسی کوڕی جابیرن ، بەلایانەوە وایە جگە لەمردارەوەبوو خوێنی ڕەوان و گۆشتی بەرازو کوشتار بۆ جگەی خوا خواردن و

خواردنەوەی هیچ شتێ قەدەغە نی‌یە ، بەلایانەوەو ایە پێشەوای موسوڵمانان کە لەئاین وەرچەرخا هەموو ژێر دەستەکانی بەجارێ ئەگەڕێن بەبێ باوەڕ ، بیرو باوەڕی خراپی تریان هەیە .

٢٤-(العجاردة ) تاقمی عەبدولکەریمی کوڕی عەجرەون ، بەلایانەوە وایە ئەو کەسەی گوناهی گەورە بکا ئەبێ بە بێ باوەڕ ، گومانی خراپیان وایە سورەتی یوسف بەشێ نی‌یە لەقورئان ئەو تاقمە ئەگەنە شەش تاقم ، ئەو تاقمانە بیرو باوەڕی خراپی زۆریان هەیە .

٢٥-( الثعالبة ) تاقمی سەعلەبی کوڕی عامیرن ، ئەوانە زۆر بەشن بەلایانەوە وایە ئەو کەسانە لە نوێژدا ڕووبکەن بۆ لای ڕوانگەی موسوڵمانان جەنگیان لەگەڵ ناکرێ هەتا داوایان لێ نەکرێ بۆ ئەوەی باوەڕ بهێنن بەبیرو باوەڕی داواکەران ، دوایان لێ کردن و سەر پێچیان کرد ئەو کاتە جەنگیان لەگەڵ ئەکرێ ، گومانیان وایە ئەو کەسانە لەسەر بیرو باوەڕی خۆیان بن بەهەشتین و (إن شاء الله ) ی ناوێ ، چەندین بیرو باوەڕی خراپی تریان هەیە .

٢٦-( الأباضية ) هاوڕێکانی عەبدوڵای کوڕی ئیبازن ، ئەوانە چەند تاقمێکن ، بەلایانەوە وایە هەرکەسێ لەسەر بیرو باوەڕی ئەوان نەبێ بێ باوەڕە ، خاوەنی گوناهی گەورە لای ئەوان بێ باوەڕە بەلایانەوە وایە خوای مەزن لەپاش پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فرۆستادەیەکی تر ئەنێرێ لەنێو عەجەمدا ، بەیەکجار نامەیەکی بۆ ڕەوانە ئەکا ، ئادەمیزاد ئەبێ واز لەئاینی پێغەمەر بهێنن ئەو کاتە . چەندین بیرو باوەڕی خراپتری زۆریان هەیە .

٢٧-( الصفرية ) تاقمی زیادی کوڕی سوفەرن ، بەلایانەوە وایە نوێژنەکردن ئادەمیزاد ئەبن بەبێ باوەڕ ، ژنی موسوڵمان دروستە شوبکەن بەبی باوەڕان لەو جێگانەدا موسوڵمانان سەربەخۆییان نەبێ ، بیرو باوەڕی تری نالەباریان هەیە .

٢٨-( اليونسية) تاقمی یونسی کوڕی عەونی نەمیرن ، گومانیان وایە باوەڕهێنان بریتی‌یە لەناسینی خوا و مل کەچ کردن بۆ خوا و وازهێنان لەفیزکردن بەسەر خوادا ، بەلایانەوە

وایە واز هێنان لەهەمو فەرمانەکانی خوا نابێتە هۆی سزادان ، بەمەرجێ دەروونی پوختە و خاوێن بێ .

٢٩- ( العبيدية ) هاورێکانی عەبیدی ئەلموکتەئیبن ، بەلایانەوە وایە جگە لە هاوبەشدانان بۆ خوا چاو پۆشی لێ ئەکرێ ، گوناە کردن لەپاش مردن زیان بەخاوەنەکەی ناگەیەنێ ، گومانیان وایە خوا لەسەر وێنەی مرۆڤێکە ، بیرو باوەڕی تری خراپیان هەیە.

٣٠- ( الغسانية ) تاقمی غەسانی کونین ، بەلایانەوە وایە باوەڕهێنان بریتی‌یە لەناسینی خواو پێغەمەر و قورئان ، گومانیان وایە خواردنی گۆشتی بەراز قەدەغە نی‌یە چونکە نازانرێ ئەو زیندەوەرە مەڕە یا بەرازە یا شتی تر ، حەج لای کەعبە پێویستە . بەلام ئەو خانووە کەعەبەیە یان نە ؟ نازانرێ و لەوانەیە کەعبە لەهیندوستان بێ . بیرو باوەڕی ناپەسەندی زۆریان هەیە .

٣١- ( التومينية ) تاقمی ئەبی مەعازی توومەنن ، بەلایانەوە وایە باوەڕهێنان بریتی‌یە لەناسینی خوا و خۆشەویستی ، بڕوا بەخوا بەبێ خەوش لەناوەڕۆکی دڵەوە . کەواتە کڕنۆش بردن بۆ مانگ و خۆر و بت نابنە هۆی بێ باوەڕی ئادەمیزاد بەڵکو نیشانەی بێ باوەڕین و بەس .

٣٢- ( الثوبانية ) تاقمی ئەبی سەوبانی ئەلمورجیئین ، بەلایانەوە وایە ئەگەر خوا لەگوناهبارێ خۆش بوو ئەبێ لەهەموو گوناهبارێ وێنەی ئەو بێ خۆش ببێ ، کەسێ بڕوای بە یەکێتی خوا هەبی هیچ گوناهێ تووشی سزای ناکا ، بیرو باوەڕی خراپتریان هەیە.

٣٣-(الصالحية ) تاقمی صالحی کوڕی عومەرن ، بەلایانەوە وایە نوێژ یەکێ لەپەرستنەکانی خوا نی‌یە ، جگە لەناسینی خوا هیچ پەرستنێ تر نی‌یە و پێویست نەکراون، چەندین بیر و باوەڕی تری نەگونجاویان هەیە .

٣٤- ( الكيسانية ) تاقمی کەسانی بەندەی ئازاد کراوی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە ، بڕوایان وایە کەموحەممەد کوڕی عەلی هەموو شتێ ئەزانێ و ئاگای لەهەموو ڕووداوی بونەوەران

هەیە ، زانینی هەموو چاکە و خراپەی لایە ، ، بەلایانەوە وایە پەرستن بریتی‌یە لــە پەرستنی هەندێ لەئادەمیزاد ، گومانیان وایە کە موحەممەدی کوڕی عەلی نەمردووە ، بۆ جــارێ تــر دێتەوە بۆ سەر زەوی .

٣٥-( المضارية ) تاقمی ئەلمزاری کوڕی ئەبی عوبەیدی سەقەفیە ، ئەو ئــەلموختارە یەکــەم جار سەر بەپێشەوا عەلی بوو ، لەپاشا سەر بەعەبدولای کوڕی زوبەیر ، لەدواییدا دووبــارە گەڕایەوە بۆلای تاقمی عەلی ، لەپاشا هەلگەڕایەوە بوو بەتاقمی کەیسانی ، لایان وایە پــاش عەلی پێویستە موحەممەدی عەلی پێشەوا بێ ، گومانیان وایە ئەبێ بەپێچەوانــەی زانینــی خــوا شتێ پەیدا ببێ ، وایش ئەبێ دژی ویستی خوا شتێ ببێ واش ئەبێ ئەمڕۆ خوا فــەرمان بــدا بەشتێ لەدواییدا دژی ئەو فەرمانە دەربکا ، لایان وایە موحەممەد کــوڕی عــەلی نــەمردووە لەکێوی (رضوی ) ئارامی گرتووە لە لەنێو شێر و پلنگایە و ئەیپارێزن دوو سەرچاوە لای موحەممەد هەلقولاون یەکێکیان ئاو و ئەوی تریان هەنگوین ، پاش ماوەیە دێتــەوە بــۆ ســەر زەوی و پڕی ئەکا لەفەڕ و داد پەروەری .

٣٦-( الهاشمية ) پەیڕەوانی ئەبی هاشمی کوڕی موحەمــەدی ئەلحەنیفــە ، لایــان وایــە پــاش موحەممەدی کوڕی عەلی ئەبێ هاشمی کوڕی موحەممەد پێشــەوای موســولمانانە ، موحەمــەد هەموو زانین و زانیاری و چارەنووسی بوونەوەرانی فێری هاشم کردووە ، بەلایانــەوە وایــە گیانی ئادەمیزاد پاش مردنیان لەتەنێکەوە ئــەکرێ بەتــەنێکی تــر ، چــەندین بــیرو بــاوەڕی خراپتریان هەیە .

٣٧-(البيانية ) پەیڕەوانی بەیانی کوڕی سەمعانی تەیمیە، لایان وایە پێشەوایی پــاش هــاشمی کوڕی موحەممەد دراوە بە بەیان ، گومانیان وایە عەلی خوایە ، هەورەگرمە دەنگی عەلی یــە، چەندین بیرو باوەڕی تری خراپیان هەیە .

٣٨-( الرّزامیــة ) پــەیڕەوانی ڕەزامــی کــوڕی زەمــن ، لایــان وایــە پــاش پێشــەوا عــەلی موحەممەدی کــوڕی پێشــەوای موســولمانانە ، پــاش موحەمــەد هــاشمی کــوڕی موحەمــەد

پێشەوایە، لایان وایە کەئەبی موسلیمی خۆراسانی دوواهەمین پێشەوای موسوڵمانانە ، گومانیان وایە گیانی خوا لەلەشی ئەبی موسلیما دانراوە ، چەندین بیرو باوەڕی خراپی تریان هەیە .

٣٩-(الزيدية ) پەیڕەوانی زەیدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی‌یە ، بەلایانەوە وایە جگە لەنەتەوەی فاتیمەی کچی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کەسی تر نابێ بکرێ بەپێشەوای موسوڵمانان ، بەڵام دانانی یەکێ تر دروستە لەجگەی ئەوان لەبەر سوودی گشتی موسوڵمانان کەواتە بۆیە کە ئەبوبەکر کرا بەپێشەوا عەلی ڕازی بوو ، هەرچۆنێ بێ ئەو تاقمە مام ناوەندین لەناو هەموو شیعەکاندا ، زۆر تر بەلای چاکە و دادپەروەری‌دا ڕۆیشتوون .

٤٠-( الجارودية) هاوڕێکانی ئەجارودی کوڕی زیادی کوڕی ئەبو زیادن ، بڕوایان وایە کە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەسیفات و بەڵگە فەرمانی داوە بەجێگە نشینی عەلی بۆ خۆی و ناوی نەبردووە بەئاشکرا ،موسوڵمانان خۆیان ماندوو نەکردووە بۆ دۆزینەوەی ، بۆیە هەموویان گەڕان بەبێ باوەڕ لایان وایە پێشەوایەتی بەم جۆرەیە : عەلی ، حەسەن ، حوسەین ، زەینولعابدین ، زەیدی کوڕی زەینولعابدین ، موحەمەدی کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی . بیرو باوەڕی نەگونجاوی تریان هەیە .

٤١-(السليمانية ) هاوەڵەکانی سولەیمانی کوڕی حەریرە ، بەلایانەوە وایە ئەبێ دیاری کردنی پێشەوای موسوڵمانان بەڕاوێژبێ لەنێو موسوڵماناندا ، پێشەوایی ئەبو بەکرو عومەر لایان پەسەندە ، لەوانەیە کە عەلی هەڵنەبژێراو بێ و تووشی هەڵە بووین ، بەڵام نەگەیشتونەتە ڕادەیە پێی گوناهبار بین ، بەلایانەوە وایە عوسمان بێ باوەڕە و تووشی هەڵەبووە ، عایشە و زوبەیر و تەلحە بێ باوەڕن ، چونکە چوون بەگژ عەلی‌دا ، چەندین بیرو باوەڕی تری ناڕەوایان هەیە .

٤٢-( الصالحية والبرّية ) تاقمی حەسەنی کوڕی صالحی کوڕی حەیین لەگەڵ هاوەڵەکانی کەسیری ئەلقەوی ئەلئەبتەرن ، لایان وایە کەپێشەوای ئەبوبەکرو عومەر

دروستە . بەلآم سەرگەردانن ئایا عوسمـــان بـێ بـاوەڕە یانـە؟ هەرچـەندە ئـەو ڕووداوانـە لـەوانەوە ڕووی دا لـەڕەوشتی هاوەڵەکانی پێغەمەرەوە دوورن ، چەندین بیرو باوەڕی تـری ناجۆریان هەیە .

٤٣- ( الباقریة والجعفریة ) پەیڕەوانی پێشەوا موحەمەد باقر و جەعفەری کـوڕی ئـەون ، لایـان وایـە ئـەو دوو پێشـەوانە و پێشـەوا زەینولعـابدین باوکیـان پێشـەوای ڕاسـتی موسوڵمانانن، هەیانە لایان وایە هەر پێشەوا محمد باقر پێشەوایە نـەك جەعفـەر ، گومانیـان وایە موحەمەد باقر دێتەوە بۆ سەر زەوی ، بیرو باوەڕی تریان هەیە زۆربەیان ناجۆرن .

٤٤- ( الناوسیة ) پەیڕەوانی پیاوێکی بەناوبانگە بەناوس ، لایان وایـە پێشـەوا جەعفـەری صادق زیندووە و نەمردووە ، دێتەوە بۆ سەر زەوی ، ئـەوە ( القـائم المـهدی ) ڕاوەسـتاو ڕاگیراوی کراوە ، چەندین بیرو باوەڕی نارەوای تریان هەیە .

٤٥- ( الأفطحیة ) تاقمی عەبدولای ئەلئەفتحن کە کوڕی پێشـەوا جەعفـەری سـادیقە ، لایان وایە عەبدولا پاش باوکی پێشەوایە ، گومانیـان وایـە پێشـەوایان نابـێ بشـۆردرێن و نوێژیان لـەسەر بکرێ ، چەندین بیرو باوەڕی نارێکی تریان هەیە .

٤٦- ( الشمیطیة ) پـەیڕەوانی یـەحیای کـوڕی ئـەبو شـەموتن ، لایـان وایـە پێشـەوایی موسوڵمانان ئەبێ موحەمەد کوڕی پێشەوا جەعفەری سادیق بـێ ، چـەندین بـیرو بـاوەڕی نەگونجاوی تریان هەیە .

٤٧- ( الإسماعیلیة ) تاقمی ئیسماعیلی کوڕی پێشەوا جەعفەری سادیقن ، بەلایانەوە وایە پاش پێشەوا جەعفەر ئیسماعیلی کوڕی پێشـەوای موسـوڵمانانە ، هەیانـە گومانیـان وایـە ئیسماعیل نەمردووە ، خۆی لـەستەمی عەباسیەکان شاردۆتەوە ، چەندین بیرو باوەڕی تـری نەگونجاویان هەیە .

٤٨- ( الموسویّة المفضلة ) بەلایانەوە وایە پێشەوا موسای کازیم کوڕی پێشەوا جەعفـەری سادیق حەوتەمین پێشەوای وەستاوی موسوڵمانانە ، هەیانە گومانیـان لـە مردنیـدا هەیـە ، چەند بیرو باوەڕی نارەوای تریان هەیە .

٤٩- ( الأثنا عشرية ) ئەوانە لایان وایە پێشەوایانی موسـولـّمانان دوازدە پێشـەوان ، بـەم جۆرە ڕیز ئەکرێن : (١) عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەلمورتەزا . (٢) حەسەنی کـوڕی عـەلی ئەلموجتەبا . (٣) حوسەینی کوڕی عەلی ئەلشەهید . (٤) عـە لی زەینولعـابدین ئەسـەجاد . (٥) موحەمەد ئەلباقیر . (٦) جەعفەری سادیق . (٧) موسای کـازیم . (٨) علـی ڕەزا . (٩) موحەمەد تەقی . (١٠) عەلی نەقی . (١١) حەسەنی عەسـکەری . (١٢) موحەمـەدی کوڕی حەسەنی عەسکەری ( الحجة القائم المنتظر ) بەڵێنی وەستاوی چاوەڕوان کراو ، ئەو تاقمە هەرچەندە دەربارەی ئەو پێشەوایانە بیرو باوەڕی زۆری دژی یەکتریان هەیەس بـەڵام زۆربەیان لایان وایە پێشەوای دوازدەهەم چووەتە نێو ساردای سـامەڕاوە و لـەوێ خـۆی ون کردووە ، هـەتا خـۆی بپـارێزێ لـە ستەمی عەباسـی‌یەکان و زینـدووە و نـامرێ ، گومانیان وایە دوو جار ون ئەبێ ، یەکەم جـار ون بوونەکـەی مـاوەی کەمـە و خـۆی ئاشکرا ئەکا ، بۆ جاری دووەم خۆی ون ئەکا بەر لەکۆتایی پێهاتنی جیـهان بەیـەکجاری دێتەوە بۆ سەر زەوی و ئەبێتە پێشەوای دوایـی موسـولـّمانان ، گومانیـان وایـە وەسـتاوی چاوەڕوان کراو ئەو مرۆڤەیە ، سەر زەوی پڕ ئەکا لەفەڕ و داد پەروەری ، دەربارەی ون بوونی بیرو باوەڕی دژیەکتریان هەیە چەندین بیرو باوەڕی نەگونجاوی تریـان هەیـە لەگـەڵ یاسای ئیسلام و ڕەوشتی پێغەمەر و هاوڕێکـانی ناگونجـێ ، بـۆ نموونـە گومانیـان وایـە کـە پێشەوایان بەتایبەتی پێشەوای دوازدەهـەمین چـاك و خراپـی هـەموو بوونـەوەران ئـەزانن، گـەورە و بچوکـی کـارو کـرداری بوونـەوەرانیان لێ ون نابـێ ، کـە ئـەو پلەیـە خـوا بەپێغەمەرانی نەداوە ، هەندێکیان گومانیان وایە پێشەوای دوازدەهەم خوایە ، لەهەموو شتێ سەیر تر و درۆی ناقۆڵا ئەمەیە : شێخ ناجی نـەجار لەنامـەی ( في مجـار الشـيخ المجلسـي ) لەدەمی یەکێ لەو دوازدە ئیمامیانـەوە ئەگێڕێتـەوە کـەناوی شـێخ زەینەدینـە لـەو دیـوی (مثلث) ی بەرمۆدا دورگەیە هەیە بەناوی (جزيرة الخضراء ) چـەندین شـار هـەن جێگـەی دانیشتنی پێشەوای دوازدەهەمینە ، ئەو شێخ زەینەدینە ئەڵێ من چوومەتە ئەو شارە و ئیمام

زیندووە و نەمردووە ، ئەڵێ ئەو دورگەیە بەهۆی ئیمامەوە هیچ شتێ ناتوانێ بچێتە ناویەوە نەفرۆکە و نە پاپۆڕ، ئەو ڕووداوە لەساڵی (٦٩٩) ی کۆچی دا بۆ ئەو شێخە ڕەخساوە ، ئەوە کورتەیەکە لەو باسە ، چەندین بیرو باوەڕی خراپی تریان هەیە .

٥٠- ( السبائية ) هلوڕێکانی عەبدوڵای سەبەئن ، لایان وایە عەلی خوایە و نامرێ بەشێکی خوای تێدایە ، عەلیە دێت و دەچێ بەناو هەوردا ، هەورە گرمە دەنگی ئەوە و بزیسکە و چەخماخە زەردەخەنەی ئەوە ، دێتەوە بۆ سەر زەوی ، چەندین بیرو باوەڕی خراپی تریان هەیەو بێ باوەڕن .

٥١-(الكاميلية) هاوڕێکانی ئەبو کامیلن ، لایان وایە هاوەڵەکانی پێغەمەر بەگشتی بێ باوەڕن بەو بۆنەوە دەنگیان بۆ عەلی نەدا ، نەفرەتیش لەعەلی ئەکەن بۆچی داوای مافی خۆی نەکرد ؟ چەندین بیرو باوەڕی تری خراپیاۆن هەیە .

٥٢-( العلبانية ) هاوڕێکانی عەلبانی کوڕی زیراعی دەوسین ، گومانیان وایە عەلی لە پێغەمەر گەورەترە ، عەلی موحەمەدی کردووە بەپێغەمەری نێردراو ، لا یان وایە عەلی خوایە، خراپەی پێغەمەر ئەڕاوێنن ، گومانیان وایە پێغەمەر نێردراوە بۆ ئەوەی جاڕی پێغەمەرایەتی بدا بۆ عەلی کەچی جاڕی بۆ خۆی دا ، گومانیان وایە لای هەندێکیان کە موحەمەد و عەلی هەردوکیان خوان ، بەڵام عەلی لەپێش ترە ، بیرو باوەڕی خراپی تریان هەیە .

٥٣-( المغيرية ) تاقمی موغەیری کوڕی سەعیدی ئەلعەجەلین ، لایان وایە موحەمەد (النفس الزكية ) پێشەوای موسوڵمانانە پاش موحەمەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەین ، زیندووە و نەمردوە ، ئەلموغەیرە داوای پێشەوایی موسوڵمانانی کردووە ، لەپاشا خۆیشی کرد بە پێغەمەر و تاقمەکەی باوەڕیان پێ هێنا هەموو قەدەغەکراوەکانی گێڕاوە بەڕەوا بەدەیان بیرو باوەڕی خراپتریان هەیە .

٥٤-( المنصورية ) تاقمی ئەبو مەنسوری عەجەلین ، لایان وایە عەلی پارچەیەکە لەئاسمانەوە هاتۆتە خوارەوە بۆ سەر زەوی ، دوای پێشەوایی‌یەکەی چوەتەوە بۆ ئاسمان ،

خوا دەستی هێناوە بەسەریا ، خوا پێی ووت : کوڕی خۆم بڕۆرەوە بۆ سەر زەوی جێگە نشینی منبە . چەندین بیروباوەڕی خراپتریان هەیە .

٥٥- (الخطابية) تاقمی ئەبوخەتا بی موحەممەدی کوڕی زەینەبەی ئەلئەسەدین ، لایان وایە هەموو پێغەمەران و جەعفەری کوڕی موحەممەدی باقیر و باوك و باپیرەکانی هەموویان خوان ، بیرو باوەڕی تری زۆر نالەباریان هەیە .

٥٦- ( الكيالية ) پەیڕەوانی ئەحمەدی کوڕی کەیاڵن ، یەکەمین جار داوای پێشەوایی کرد بۆ یەکێ لەنەوەکانی فاتیمەی کچی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لەپاشا بۆ خۆی ، ئەی ووت من پێشەوای ڕاوەستاوم ، بەکورتی لا یان وایە پێشەوای موسوڵمانان کەم و زۆری هەموو بونەوەران و سەرو ژێریان بەدەستیانە ، هەڵسوڕاندنی بوونەوەران و چارە نووسیان ئەوان بۆیان دیاری ئەکەن ، لایان وایە ئەو کەسە شایانی ئەو کارانەبێ جگە لەئەحمەدی کوڕی کەیاڵ کەسی ترنی‌یە ، چەندین بیرو باوەڕی زۆر خراپتریان هەیە .

٥٧- (الهشامية) پەیڕەوانی هیشامی کوڕی حەکەمن ، لایان وایە خوای ئەوان لەناو هەموو لەشێکدایە و وێنەی یەکن بەبێ جیاوازی ، بۆیە بەبۆنەی بوونەوەرانی خاوەن لەشەوە خوا ئەدۆزێتەوە ، گومانیان وایە عەلی خوایە و پێویستە بپەرسترێ ، چەندین بیرو باوەڕی خراپی زۆرتریان هەیە .

٥٨- (النعمانية ) هاوڕێکانی موحەممەدی کوڕی نەعمانن ، لایان وایە خوا بۆنی هەموو شتێ ئەبیستێ و ئاگای لێیان هەیە ، خوا خاوەن ئەندام و قەبارەیە ، چەندین بیرو باوەڕی خراپی تریان هەیە .

٥٩- ( اليونسية) هاوەڵەکانی یونسی کوڕی عەبدورەحمانی قومین ، لایان وایە فریشتەکان عەرشیان هەڵگرتووە ، عەرشیشی خوای لەسەرە ، خوا بەخاوەن لەش دائەنێن .

٦٠- ( النصيرية والأسحاقية ) هاوەڵەکانی موحەممەدی کوڕی ئەسیری نەمیرین ، لەگەڵ پەیڕەوانی ئیسحاقی کوڕی پێشەوا موسای کازیمن ، لایان وایە پاش پێغەمەر عەلی و کوڕ و

نەوەکانی لەهەموو ئادەمیزاد گەورە ترن ، خوا لەوێنەی عەلی دایە بەدوو وێنەی عەلی خۆی دەر ئەخا ، بەزمانی خوا گفتوگۆ ئەکا ، لایان وایە هەموو کارێ ڕەوایە ، هیچ شتێ قەدەغە نیە، بەلایانەوە وایە ئەبولحەسەنی ئەلعەسکەری موحەمەد کوڕی نەمیری کردووە بەپێغەمەر، بەدەیان بیرو باوەڕی خراپی وایان هەیە مرۆڤ شەرم ئەکا باسیان بکا .

٦١-( الحنثبية) لایان وایە جیهان بۆ هەموو بەندەکانی خوایە و یەکسانن بۆ بەکارهێنانی بەرووبوومی ،گەورە و بچوك لەنێو ئادەمیزادا نیە ، چونکە هەموویان پاش کەوتووی ئادەم و نەوەکانی ئادەمن و یەکسانن .

٦٢-(الفكرية ) لایان وایە ئادەمیزاد کە زانین و زانیاری و وریایی زۆری هەبوو ، بەو ئەندازەیە پەرستنی لەسەر کەم ئەکرێتەوە .

٦٣-(السابقية ) لا یان وایە مرۆڤ چ شتێ ئەکا بیکا بەگوێرەی ئارەزوی خۆی ، ئەو کەسە بەختیارە لەجیهاندا گوناە کردن زیانی پێ ناگەیەنێ و سزای نادرێ ، ئەو کەسەی خراپ بێ هەرچی چاکە هەیە بیکا سوودی پێ ناگەیەنێ .

٦٤-(الشريعيّة ) پەیڕەوانی شوریعن ، بەلایانەوە وایە خوا لەنێو پێنج کەسدایە : (پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ، عەلی کوڕی ئەبی تالیب ، عە باسی مامی پێغەمەر ، جەعفەری کوڕی ئەبی تالیب ، عوقەیلی کوڕی ئەبوتالیب) .

٦٥-(المفوضية ) ئەو کۆمەڵەن لایان وایە خوای گەورە هەڵسوڕاندنی بونەوەرانی داوەتە دەست پێشەوایان ، خوا توانای دروست کردنی ئادەمیزاد و بەڕێوەبردنیانی داوەتە دەست پێغەمەر و عەلی .

٦٦-(السالمية ) تاقمێ کوڕی سالمن بەلایانەوە وایە خوا لەپاشە ڕۆژدا لەوێنەی مرۆڤێ لەپەیڕەوانی موحەمەدا ئەبینرێ ، گومانیان وایە خوا لەرۆژی دواییدا خۆی بۆ دێوو ئادەمیزاد و ئاژەڵ دەرئەخا .

٦٧- ( البزيقية ) هاورێکانی بەزیقن ، لایان وایە پێشەوا جەعفەر خوایە و نابینرێ ، ئەو لەو ئەچێ کەئەبینرێ .

٦٨-(الطيارية) پەیڕەوانی عەبدولڵای کوڕی مەعاویەی کوڕی عەبدولڵای کوڕی جەعفەری تەیارن ، لایان وایە گیان لەبەدەنێکەوە ئەچێتەبەدەنێ تر ، گومانیان وایە گیانی ئادەم خوایە .

٦٩-(الصليتية) تاقمی عوسمانی سەلتن ، لایان وایە ئەو کەسەی لەوان بێ و منالێکی هەبوو ئەو منالە بەموسولمان دانانرێ هەتا گەورە ئەبێ و ئەوان بانگی بکەن بۆلای ئاین و وەری بگرێ ئەو کاتە موسولمانە .

٧٠-(الطفرية ) بەلایانەوە وایە کەسێ خوای ناسی ڕزگاری ئەبێ لەهاوبەش دانان بۆ خوا ئیتر باباوەڕی بەپێغەمەر و بەهەشت و دۆزەخ نەبێ هەموو گوناهێ بکا ، بیرو باوەڕی خراپی تریان هەیە .

٧١-(العبيدية) بڕوایان بەپێغەمەران نیە بەو جۆرەی لای خواوە کرابن بەفرۆستادە . بەڵکو گومانیان وایە بە مرۆڤێکی زانا و ڕۆشنبیر دائەنرێن ، وێنەی سوقرات و ئەرستۆ .

٧٢-(الحشوية ) لایان وایە ئەو کەسانە واز لەسونەت بهێنن وێنەی ئەو کەسانەن واز لە فەرزەکان بهێنن و سزایان وەك یەك وایە .

٧٣-(الواردية) لایان وایە ئەو کەسانەی خوایان ناسی ناچنە دۆزەخەوە ، ئەو کەسانە خرانە دۆزەخەوە هەتاهەتایە نایەنە دەرەوە .

بەکورتی و شێوەیەکی ڕوون باسی ئەو (٧٣) تاقمانەمان کرد کە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لەفەرمودەکەیا ناوی بردوون ، ئەو تاقمانە وائەبێ بەناوی ترەوە باسیان ئەکرێ ، بەڵام مەبەستەکە ناگۆڕێ و بیرو باوەڕەکانیان وەك یەك وان ، باناوەکانیان بەو جۆرە نەبێ من نووسیومن ، ئەبن بە (١٢) تاقم بەم جۆرەی خوارەوە :

| تاقم | |
|---|---|
| ١ | أهل السنة والجماعة |
| ١٣ | الجهمية |
| ١٣ | القدرية |
| ١٣ | الجبرية |
| ١٣ | الرافضية |
| ١٣ | المرجئة |
| ١٣ | الحرورية |
| ٧٣ | المجموع |

ئەو (٧٣) تاقمانە بەو ناوانـــەوە لـەپاش كۆچـی دوایـی پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ پـەیدابوون ، بەتایبەتی پاش کوشتنی پێشەوا عوسمـــانی کـوڕی عـەفان هـەتا نزیکـەی کۆتـایی چـەرخی سێهەمی کۆچی ..

لـەم چەرخەی ئێمەدا چەندین تاقم و کۆمەڵی تر هەن هەر یەکەیان خاوەنی بیرو باوەڕی تایبەتی خۆیانن : وەك ئەمانە : (الأخوان المسلمون ، التكفير والهجرة ، الأنقاذ ، الأسلامي) ئەوانەو چەندین کۆمەڵی تر نایەنە ژمارە بۆمن ، ئەوانە هەموویان ئـەناوی ئیسـلامەوە کـار ئەکەن .

هەروەها ئێستا کەچەرخی سەرەتای (١٥٠٠)ی کۆچی‌یە جار بـەجار بیروبـاوەڕی تـر پەیدا بوون لـەوانەیە بۆ لـەمەو پاش تاقم و بیرو باوەڕی تر زۆر پەیدا بـبن ، زۆربـەیان دژی ئاینی پاکی ئیسلامن ، هەریەکەیان کۆمـــەڵێکی زۆر بڕوایـان پێـهێناون ، بـەڵام ئیـتر بـیرو باوەڕیان بگونجێ لـەگەڵ یاسای ئیسلامدا یانەگونجێ لـەو (٧٣) تاقمە بەدەرنین ئەگـــەر زۆر بەووردی بەراوردی بیرو باوەڕیان بکرێ .

بەم جۆرەی خوارەوە باسی هەندێ لـەتاقم و کۆمەڵی تر ئەکەین کەدژی یاســای پـاکی ئیسلامن و پەیوەندی‌یان بەئاینی ئیسلامەوە نی‌یە :

١- ( اليزيدية وعبدة الشيطان) یـانی یەزیدیـیەکان و شـەیتان پەرستـەکان ، زانایـان بیریان جیاوازە لـەبارەی مانای یەزیدیە ، هەندێکیان ئەڵێن : یانی یەزدان پەرسـت یـەزد یـا خوا، هەندێ تریان لایان وایە سەر بەیەزیدی کوڕی مەعاویەن ئـەو تاقمـە گومانیـان وایـە یەزیدی کوڕی مەعاویە خوایە ،ئەم بیرو بۆچوونە زۆر درۆیە چونکە ئەو تاقمە بەر ئیسـلام هەبوون بەهەمان ناو ، ئیتر چۆن ئەبی سەر بە یەزیدی کوڕی معاویە بن ، ئەو تاقمە کوردن و هەر کوردبوون و نوێژیش بەکوردی دەکەن ، خوایش گەورەی هەموو خواکانە ، بەڵام ئەو خـوا گەورەیـە پـەیوەندی بەهەڵسـوڕاندنی کاروبـاری بونەوەرانەوەنـەماوە ، هـەموو چارەنووسی بونەوەرانی سپاردووە بەمەلـەکەتاوس یانی شەیتان کەئەویش خوایە ، گومانیـان وایە شێخ عەدی خوایە و هاوبەشی شەیتانە لـەخواوەندیا ، گـۆڕی شـێخ عـەدی لـەلاشـە کەوتووە نێـوان دوو کێـوو شـیوێکی تەسـك و قوڵـەوە ، سـەربەقەزای شـەنگاری سـەر بەپارێزگای موسڵە ، ئەو گۆڕەی شێخ عەدی ڕوانگـەی ئـەو تاقمەیـە جێگـەی حەجیانـەو لایان زۆر پیرۆزە ، ئەوەی باسکرا کورتەی بیرو باوەڕیانە ، چـەندین بـیرو بـاوەڕی تـری نەگونجایان هەیە ، هەموویان ئەفسانەن ، ئەو تاقمە بەزۆری لـەئێران و ناوچە کرند و سـە ڕیێلی زەهاو هەن . هەندێکیان لـەسوریا و لـەڕو سیا هەن ، بەلایانەوە وایە عەلی کوڕ ی ئەبی تالیب خوایە ، باوەڕی زۆر نەگونجاویان بەمناڵانی عەلی کوڕی ئـەبو تـالیب هەیـە ، بەلایانەوە وایە گیانی خوای لـەدەروونی پیرەکانیانا هەیە ، ئەوانەی ئێران بڕوایان زۆر بەتینە بەداودی کەوە سوار .

٢- (البابية والبهائية ) یەکەمین کەس ئەو بیرو ڕایەی دانا عەلی کوڕی موحەمەدی شیرازی بەناوی خۆیەوە ناوی ناوە (الباب) یانێ هۆیەکە بۆ گەیشتن بانـاوەرۆکی ڕاستەقینەی خـواو دەرگایە، ئەو کەسانەی دوای کەوتن پێیان ئەڵێن بابی ، یەکەمین جار (١٨) کەس باوەڕیان پی هێنا لـەنێو ئەواندا دوو براهە بوون بەناو میرزا حسێن عەلی نوری خۆی ناونا (بهاء الله ) یانی ڕوناکی خوا بەو بۆنەوە ئەوانەی دوای کەوتن ناو یان نرا بەهائیـیـەکان ، براکەیشـی میرزا یەحیا نوری بوو ناوی خۆی نا ( صبح أزل ) ئـەو دوو برایـە بـیرو بـاوەڕی بابیـان بەباشی بلاو کردەوە ، ژنێکیش بەناوی خاتوون ( زەڕین تاج کـە زۆر جـوان و زیـرە ك بوو ئەویش باوەڕی بەباب هێنا و دەورێکی گەورەی هەبوو بۆ بلاو کردنـەوەی ئـەو بـیرو

باوەڕە. باب ڕووی کردە ئەو (١٨) کەسانە و ووتی : من ( باب الله) م ، بەگوێرەی نامەکەی خۆی ئەو خوا یە و پەرستن ئەبێ هەر بۆ ئەو بکرێ بوونەوەران هەموویان د رو ستکراوی ئەون ، لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە بیرو باوەڕە خراپە لەنێو موسوڵمانانندا بێ ڕەواج و نەگونجا و بوو ، باب ڕوی کردە ئەوروپا بۆ بلاو کردنەوەی بیروباوەڕە ژەهراویەکەی ، لەبەریتانیاو فەرەنسا و ئەڵمانیا و ئەمەریکا ڕەواجی زۆری پێدا و قۆز تیانەوە ، بەتایبەتی بەریتانیا بەهەموو جۆرێ یارمەتی ئەدا ، چونکە ئەیزانی بۆ دژی ئاینی ئیسلام درو ست کراوە ، باب ئەو زەڕین تاجەی کەباسکرا ناوی نا ( قره العين) ، چەندین بیرو باوەڕی خراپی تریان هەیە ، ئەوەی با سکرا کورتە مێژووی باب و بەهائی بوو لەنامەی ( حاضر الأسلامي ) بەدرێژی باسی کردوون .

٣- (القاديانية ) پەیڕەوانی غلام ئەحمەدی قادیانین لەهیندستان ، گومانیان وا یە غلام ئەحمەد عیسایە و ڕانمویی کەرە ، ئەی ووت : من خوا ڕەوانەی کردووم بۆ ئەوکەسانەی خراپە ئەکەن ، خوا بەمنی فەرمووە : تۆ مەسیحی کوڕێ مەریەمی ، گومانی وایە پێغەمەری دواکاتە ، تاقمێکی زۆر باوەڕیان پێهێنا ، کار بەدەستانی بەریتانیا یارمەتی زۆریان دا بەچەك و بەپارە ، ئەو تاقمەی کرد بە کوتەکی دەستی خۆی بۆ دژی ئایینی پاکی ئیسلام ، چونکە ئەو تاقمە باوەڕیان وابوو نابێ جەنگ لەدژی هیچ کەسێ بکرێ بەتایبەتی بەریتانیا . ئەو دووتاقمەی بابی و قادیانی لەهندستان و ئەوروپا ، بە تایبەتی یەکەم لەمیسرو ئێران و عێراق و سوریا و فەلەستین زۆر بوون ، بەتایبەتی تربابیەکان لەفەلەستیندا زۆرن و کاربەدەستانی زایۆنی یارمەتی زۆریان ئەدەن ، لەسەر زەوی هەرێمەکانی تربابیەکان هەن .

٤- ( البكطاشيته ) ڕێگەیەکە لەڕێگەکانی ئیسلام ، سەروە لای یەکێکن لەدۆستانی خوا کەناوی (حاجی بەکتاشە) لەئێران لەدایك بووە ، چووە بۆ لای (ئەنادۆڵ ) هەندێ ئەڵێن دانەری ڕاستەقینەی ئەو ڕێگەیە (باليم بابا) یە کۆچی دوایی کردووە لەساڵی (٩٢٢) ، دەروێشەکانی ئەڵێن : قوتبی دووهەمە ، لەکوردستانا تاقمێ هەن بەناوی (قزڵ باشی یا

عەلی ئیلاهی ) بیرو باوەڕیان وێنە بەکتاشیەکان ، ئەوان هەموویان هەر چەندە ئەڵێن : ئێمە ( أهل السنة والجماعة ) ین ، بەڵام لەڕاستیدا لەڕێگە لادەرەکانی شیعەی دوازدە ئیمامین ، مێژو نووسانی فەرەنگ گومانیان وایە بەکتاشیەکان لەبنچینەدا گاورن ، بەوبەڵگەیەوە گاورەکان بڕواداری سێ شتن ئەمانەش بڕواداری: ألله ، موحەمەد ، عەلی ، پیریان لەگوناه خۆش ئەبێ بەوێنەی کەشیش ، ئەوانە مەی خواردنەوە ڕەوائەکەن ، ژنانیان بێ سەرپۆشن، زۆریان ژن ناهێنن ، کەواتە دەرکەوت جگەی موسوڵمانانن ، بەلایانەوە وایە گیانی مرۆڤ دوای مردن ئەچێتە لەشێ ترەوە ، هیچ پێویستی‌یەکی ئایینی بەجی ناهێنن ، نوێژ و زەکات و ڕۆژوو و حەجیان نیە ، فەرمانەکانی خوایان لەسەر خۆیان هەڵگرتووە ، بەڵگەیان ئەو فەرمانانە بۆ کەسێکە سەرەتایی بێ لەئایینداکە گەیشتن بە کۆتایی ئادەمیزاد بۆی ڕەوا یە هەموو شتێ بکا ، بیرو باوەڕی خراپتریان هەیە ، نامەی (حاضر الأسلامي ) دانراوی ( لۆسرۆپ شۆدازو )ی ئەمەریکایی ، وەرگێڕاوی ( ئەمیر شەکیب ئەرسەلان) ..

لەم سەردەمەی ئێمەی ئێستادا پارت و کۆمەڵێ تر لەنێو نیشتمانی ئیسلامدا پەیدابوون بناوی جیاجیاوە خۆیان ئەنوێنن ، ژمارەیان نایەتە ئەندازە ، کەمێکیان نەبێ هەمویان دژی ئاینی ئیسلامن ، بۆیە پێویستە زانایانی موسوڵمانان خۆیان کۆ بکەنەوە قورئان بکەن بەیاسا و فەرموودەی پێغەمەر بکەن بەدەستور ، وەك یەکەمین جاری سەردەمی پێغەمەر یەك بگرن، وێنەی کۆچ کەران و یارمەتی دەران خۆیان بڕازێننەوە ، دووبەرەکی و ئاژاوە و پەرتەوازە ئەبن . خۆیان و سامان بکەن بەسەر گەردانی بەرزبوونەوەی ئالاَی ئیسلام ، هیچ کەسێ لایان شایانی پەرستن نەبێ جگەی خوا ، موحەمەد ڕەوانەکراوی خوایە ، قورئان یاسایە . فەرموودەی پێغەمەر دەستوور بێ ، ئاینی ئیسلام هەتا ڕۆژی دووایی بەردەوامبێ . فەرماندانی خوا بەئایەتی (١٠٣) ی ئەم سورەتە لەبیری خۆمانی نەبەینەوە ، خۆمان نەکەین بەجێگەی خەشمی خوا ، بەری نەفرەتی هاو ئایینانی پێشەوە و پاشی خۆمان نەکەوین . لەنیشتمانی خۆماندا بەسەر بەرزی بژین ، دوژمنانی خۆمان بناسین ، پیت و فەڕو بەروو

بومی پشتمانی خۆمان ئـەدەین بەداگیرکـەران و خوێـن مژانـی ئـادەمیزادی سـەر زەوی ، لـەڕۆژ ئـاوایی و ڕۆژ هـەلآتی و زایۆنـی و ڕەگـەز پەرسـتانی خۆمـان و دەروە ، خـوا لەخۆمان ڕازی بکەین و ئێمەش بەپاداشتی پاشەڕۆژی خۆمان بگەین .

لەئایەتەکانی پێشوودا و لەئایەتەکانی دووایشدا بۆمان ڕوون بویەوە لەپشـتی پـەردەوە جووڵانەوەیەکی هەمیشەیی بەردەوام لەلایەن جوولەکەکان و جگـەی ئـەوانیش بەتایبـەتی دووڕووەکانی نێو ئیسلام کە لەژێر نـاوی ئیسـلامدا ، وەك مـاری ژێـری کـا خۆیانیـان مـەڵاس داوە ، ئـەو کەسـانە هـەموویان خـەریکن و ناسـرەون بـۆ پارچـە پارچـەکردنی موسوڵمانان و دوور خستنەوەیان لەیەکتری هەر لەکۆنـەوە ، بەتایبـەتی لـەم سـەردەمەی ئێمەدا و لەمەو دوایش ، بۆیە خوای مەزن ئەمان ترسێنێ لەپەیڕەوی کردنی بێ باوەڕان و گوێ گرتن لەفێڵ و تەڵەکەیان ، کەواتە ئەبێ موسوڵمانان بزانن و ئاگایان لەخۆیانبێ ئەو فەرمانانەی لەسەریانە بۆ بەرگری کردن لەژەهری کوشندەی دوژمنانی خۆیان سستی تێدا نەکەن ، بەهەموو هێز و توانا و سامان و دارایی خۆیان کۆمەڵێ مرۆڤ و قوتابی کارامـەو هەڵکەوتوو زیرەك و دانا و نەخەڵەتاو ساز بکەن ، بڵاویان بکەنەوە بەهەموو لایەکا بـۆ فێربوونی خوێندنی هەموو شتێ کەسوودی ئادەمیزادی تێدابێ بەتایبەتی موسـوڵمانان ، بـۆ ئەوەی لەکاتی گەڕانەوەیانا ڕەوشت و دەروونی دۆست و دوژمن فێر بن و بیـان ناسـن ، ئەو تاقمەیش بۆ هەموو ئادەمیزاد لەدۆست و دوژمـن یاسـای پـاکی ئیسـلامیان بـۆ ڕوون بکەنەوە لەفەرماندان بەچاکە و قەدەغە کردنی خراپە ، تاوانی بێ باوەڕان و داگیر کـەران وخوێن مژان و تالآن کەران بۆ هەموو کەسێ ڕوون بکەنەوە و بیانکەن بەجێگەی نەفرین ، بۆیە خوای مەزن ئەفەرموێ :

وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾

﴿ ولتكن منكم أمة ﴾ وەپێویستە ببێ لەئێوە موسوڵمانان هەموو کاتێ کۆمەڵێ لە ئێوە ، ووشەی (منکم) ئەمەمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە وە پێویستە ئەو کەسانە ئەکرێن بەنوێنەری مو سوڵمانان و ئەنێرن بۆ دەرەوەی وولاّت یا لەنێو خۆیاندا پێویستە موسوڵمان بن ، چونکە ئەگەر جگەی موسوڵمانبن نابنە جێگەی بڕوا بەو جۆرەی پێویستبی بۆ سوودی موسوڵمانان ، بەتایبەتی ئەگەر ئەو نوێنەرانە گاور بن یا جوو لەکە ، چونکە ناسەلمێنرێ واز لەسوودی هاو ئاینی خۆیان بهێنین بۆ سوودی موسوڵمانان .

بەداخەوە ئێستا هەندێ لەموسوڵمانان شالیاری دەرەوەیان و نوێنەرانیان گاورن و ئەیان نێرن بۆ لای کاربەدەستان گاور هەتا لەسوودی موسوڵمانا گفت و گۆ بکەن ئەمەیشمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە کەبەهەندێ لەموسوڵمانان پێویستەکەمان لەسەر نامێنێ .

﴿ يدعون إلى الخير ويأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر ﴾ ئەو کۆمەڵە بانگی ئادەمیزاد بکەن بۆ لای چاکەکردن و بۆ لای ئاینی ئیسلام و یەك گرتنی موسوڵمانان و ، فەرمان بدەن بەپەرستنی خوا و ئەو شتانەی یاسا و دەستوری ئیسلام و ئەقڵ وەری ئەگرێ، نەیەڵن ئادەمیزاد خراپە بکەن بۆ دژی خۆیان و بۆ دژی مرۆڤایەتی ، نەیەڵن زیان بەدانیشتوانی سەرزەوی بگەیەنرێ ، ئەو شتانە ئەقڵ و یاسا بەلایانەوە چاکە بیکەن ئەوەی بێزی لێ ئەکاتەوە نەیکەن .

﴿ أولئك هم المفلحون ﴾ ئەو کۆمەڵە بەو بانگ و فەرمان و جڵەو گرتنە هەڵئەسن ، ئەو کەسانەن ڕزگاریان بوەو جێگەی پاداشتی خوان ، شایانی سو پاسی ئادەمیزادن .

ئەبێ بزانرێ پێویستە کۆمەڵێ هەبێ بەو کارانە هەڵسن ، ئەبێ دەسەلاّتیان هەبێ لەسەر زەویدا کەبەو فەرمانە هەڵسن ، خۆئەگەر ئەو کۆمەڵە کاربەدەست نەبن ئەوا ناتوانن بانگی ئادەمیزاد بکەن بەتەنها ، ناتوانن فەرمانیان پێ بدەن بەچاکە و جڵەویان بگرنەوە لەخراپە ، کەواتە ئەو کارانە پێویستی سەرشانی موسوڵمانانە کاتێ کار بەدەستبن ، بانگ کردن و فەرماندان و جڵەو گرتن داواکراوێکی ئاسان و سووك نین ، و ائەبێ ئەو کۆمەڵە

ئەچن بەگژی ئارەزوی خراپی ئادەمیزادا ، وایش ئەبێ لەدژی سوودی هەندێ بڕۆن ، وایش ئەبێ تووشی ستەمکارێکی دڕەندە و خوێن مژ و خاوەن فیزبن ، وایش ئەبێ تووشیان ببێ بەتووشی داوین پیس و نارەسەن و خراپەکارەوە یا زۆردارێکی نالەبار ، وایش ئەبێ لەگەڵ مرۆڤێکی نەرم و نیان گفتوگۆ بکەن ، لەوکاتانەدا ئەو کۆمەڵە پێویستیان ئەبێ بەچەك و بەتوانا بۆ ئەو بیرو باوەڕە و چەسپاندنی کەواتە لەو کاتانەدا کاربەدەستان لای خوا لێپرسراون بۆ جێبەجێ کردنی ئەو کارانە . نەك ئەو کەسانە خاوەنی چەك نین بازۆریش بن .

هەندێ لەیاساناسان لایان وایە بانگ کردن و فەرماندان و جڵەو گرتن لەئادەمیزاد کاتێ پێویستە ئەو کەسانەی بەو شتانە هەڵئەسن تووشی ئازارو دەردی سەری نەبن بەو بۆنەوە بەڵام ئەو مەرجە بۆ هەمووکاتێ نیە ، چونکە موسوڵمانان کاتێ بێ باوەڕان پەلاماری خۆیان و نیشتمانیاندان ئەیان ویست لاوازیان بکەن ، ئاینی ئیسلام پێویستی کردوە لەسەرهەموو موسوڵمانان لەدژی بێ باوەڕان ڕاپەڕن بەگشتی ، جەنگیان لەگەڵ بکەن بۆ بەرگری لەڕێزی خۆیان ، شتێکی ئاساییە لەکاتی جەنگدا موسوڵمانان خۆیان و سامانیان ئەکەوێتە مەترسیەوە بۆیە ڕەوایە هەموویان خۆیان بکەن بەفیداکار بۆ سوودی گشتی ، سوودی گشتی گرنگترە لە مانەوەی مرۆڤێ ، بەڵام پێویستە موسوڵمانان بۆ بەجێ هێنانی ئەو کارانە جێگە و کاتی شایانیان بۆ دانێن ، هەندێ جار بەتوندی و هەندێ جار بەنەرمی بەگوێرەی جێگە و کاتی خۆیان ، بۆیە موسوڵمانان لەو بارەیەوە پەیڕەوی قورئانی پیرۆز بکەن ، ئەبینرێ جارێ بەهەڕەشەو جارێ بەنەرمی ڕوو ئەکاتە ئادەمیزاد ، بانگ کردن و فەرماندان بەچاکە و گەڕانەوەی ئادەمیزاد لەخراپە پیشەی هەموو خاوەن ئاین و باوەڕادارانە ، لایان مەرجە دژی دوژمنانی خۆیان بەچەك و ڕاپەڕین لەهەندێ کاتا نەك هەموو کاتا ، بەڵکو وائەبێ ئامۆژگاری کارئەکاتە سەر دوژمنان هەرگیز تۆپ و فڕۆکە و بۆنباکاری واناکا ، پێویستە یەکەم جار چەك بەکار نەهێنرێ .

پرسیار / چۆن ناوەرۆکی ئەو ئایەتەی پێشووی ژمارە (١٠٤) دژی ناوەرۆکی ئایەتی (١٠٥) ی سورەتی مائیدە نیە کە لەوێدا هاتووە ئەفەرموێ ﴿ علیکم أنفسکم ﴾ کەئایەتی یەکەم ئەوە ئەگەیەنێ فەرماندان بەچاکە پێویستە ، ئایەتی دووهەم بەهۆی ئەو ڕستەیەوە وائەگەیەنێ فەرماندان بەچاکە پێویست نیە ، چونکە ئە فەرموێ پابەستی پاراستنی خۆتانین؟

وەڵام / مەبەست بەئایەتی دووهەم ئەمەیە : ئەو کەسەی هەڵسا بەفەرماندان بەچاکە و بەقەدەغە کردنی خراپە بەگوێرەی پێویست،زیان بەو کەسە ناگەیەنێ گومرایی ئەو کەسەی گومڕا بووە ووازی هێناوە لەچاکە بەو مەرجەی ئەو کەسە هەڵسابێ بەپێویستی سەرشانی خۆی ( فإنما علیك البلاغ ) دوایی بەڕاستی لەسەر تۆ ڕاگەیاندن بەتەنها .

وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا۟ وَٱخْتَلَفُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٥﴾ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿١٠٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبْيَضَّتْ وُجُوهُهُمْ فَفِى رَحْمَةِ ٱللَّهِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١٠٧﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ ۗ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٨﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿١٠٩﴾

﴿ ولا تكونوا كالذين تفرقوا ﴾ وەئێوەی موسوڵمان مە بن بەوێنەی کەسانێکی ئــەوتۆ پارچە پارچە بوون ، بەهۆی دوژمنایەتی نێوان خۆیانەوە وەك جوو لەکەکان بوون بە (٧١) تاقم ، گاورەکان بوون به (٧٢) تاقم .

﴿ وأختلفوا من بعد ماجاءتهم البينات وأولئك لهم عذاب عظيم ﴾ وەئاژاوەو ناکۆکیـان لێ پەیدابوو لەنێو خۆیانا ، دەستیان کرد بەنووسینەوەی نامیلکەی پڕوپـوچ و شـاردنەوەی ڕاستیەکانی نامەکانی خوا بۆ پەیدا کردنی سامان و پلەی نـاڕەوا بـۆ خۆیـان لـەپاش ئـەو شتەی چوو بو بۆلایان چەندین بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا لەنامەکانی خوادا کەپێویست بوو لەسەریان ئادەمیزاد بانگ بکەن بۆ لای خوا پەرستی و فەرماندان بەچاکە و گەڕانـەوەیان لەخراپە . ئەو ڕستەیە وامان پیشان ئەدا کە ئادەمیزاد سزایان نادرێ بەواز هێنان لەچاکە و پەیڕەوی خوا هەتا خوا چاك و خراپیان بۆ ڕوون نەکاتــەوە و ، ئـەو کەسـانە پارچەپارچـە بوون و ئاژاوەیان نایەوە لەنێوان خۆیانا سزایەکی گەورەیان بۆ هەیە .

ئەو ئایەتە تەواو کەری مانی ئایـەتی ژمـارە (١٠٣) ی ئـەم سـورەتەیە ، خـوای مـەزن گرنگی زۆری داوە بەوە کە موسوڵمانان یەکبن و پەرتەوازەی بیروباوەڕ نەبن و ئاژاوە بــۆ خۆیان دروست نەکەن ، چونکە ئەو گەلەی پار چەپارچە بوون مافی ژیان و مانیان نی‌یە بۆ خۆیان ، ئیتر چۆن ئەتوانن نەتەوەکانی تر بانگ بکەن بۆلای چاکە و فەرماندان بۆ پەرســتن وجڵەو گرتنــی بــێ بـاوەڕان لــەگێرە شـێوێنی ، کـەچی لەگـەڵ ئـەو هـەموو هاندانـەی موسڵمانان بۆ یەکێتی نێوان خۆیان و موسوڵمانان لەپاش پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بــوون بــە (٧٣) تاقم ، وەك بەکورتی لەکۆتایی مانای ئایەتی (١٠٣) ی ئەم سورەتە باسیان کرا ، بۆیە ئـەو تا قمانە سزای گەورە ئەدرێن .

﴿ يوم تبيض وجوه وتسود وجوه ﴾ بۆیان هەیە سزای گەورە لەڕۆژێکا ســپی و ڕوون ئەبێتەوە ڕوومەتی باوەڕداران کەڕۆژی دواییە و خۆشحاڵن بەپاداشــتی خۆیـان و ، ڕەش و

تاریك ئەبێ ڕوومەتی بێ باوەڕان و خەفـەتبارن لـەسـەر سـزادانیان و لـەسـەر بـێ بـاوەڕی خۆیان و پارچەپارچەییان و ئاژاوەی نێوان خۆیان .

﴿ فأما الذین أسودّت وجوههم أكفرتم ﴾ دوایی كەسانێكی ئـەوتۆ ڕوویـان ڕەش بـووە سەرزەنشت ئەكرێن لـەلایەن خوای مەزنەوە بەوان ئەبێژرێ : ئایا ئێوە بۆ باوەڕتان نەهێنا ؟

﴿ بعد إیمانكم فذوقوا العذاب بما كنتم تكفرون ﴾ لـەپاش باوەڕ هێنانتان بەپێغەمـەر بـەر لـەكردنی بەفرۆستادەی خـوا ، دوایـی ئێـوە بچێـژن سـزای دۆزەخ بـەهۆی ئـەو شـتەی باوەڕتان پی نەهێنا ، وەك قورئان و پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ . خوای گەورە بـەو ئایەتـە ڕو ئەكاتـە هەموو بێ باوەڕان كە باوەڕیان بەئاینی ئیسلام نەهێناوە ، بەتایبەتی ئـەو كەسـانەی لـەپاش پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لـەئاین وە رئەگەڕێن و پارچەپارچـە ئـەبن و ئاژاوەیـان نایـەوە لـەو (٧٣) تاقمانە .

﴿ وأمّا الذین أبیضت وجوههم ففي رحمة الله هم فیها خـالدون ﴾ وەكەسـانێكی ئـەوتۆ ڕویان سپی و گەش هەڵگەڕاوەو باوەڕیان هێناوە لـەسەر ڕەوشـتی پێغەمـەر و هاوەڵـەكانی پێغەمەر بوون ، دوایی ئـەو كەسـانە لـەنێوی بـەزەیی و چاكـەی خـوادان و ئـەیان خاتـە بەهەشت ، ئەو كەسانە لـەنێو چاكەی خوادان بەبەردەوامی .

بەكورتی ئەو كەسانەی دەست بەئاینی ئیسلامەوە ئەگرن ، لـەبـەرخوا خۆیـان فیداكـار ئەكەن و پارچە پارچە نابن و یارمەتی یەكتری ئەدەن لـەســەرچاكە و سـوودی ئـادەمیزاد ، لـەپاشە ڕۆژدا زیندوو ئەكرێنەوە بەڕویەكی سپی و گەشـەوە ، مـوژدە بەیـەكتری ئـەدەن و بەچاكەی خوا خۆیان ئەڕازێننەوە ، لـەخوا ڕازین و خوایشی لـەوان ڕاز ی‌یە .

ئەو كەسانە ئاژاوەیان ناوەتەوە پەرتەوازە بـوون و لـەباوەڕیانا ، وەرگـەڕاون و وازیـان لـەئاین و نیشتمان هێنـاوە ، جگـە لـەسـوودی خۆیـان و كۆمـەڵی خۆیـان كەسـی تریـان نەویستوە ، ئەو كەسانە لـەڕۆژی دواییدا زینـدو ئەكرێنـەوە بـە ڕو ڕەشـی و سـەركزی و جێگەیان دۆزەخە و سزای گەورەیان بۆ هەیە .

﴿ تلك آيات الله نتلوها عليك بالحق ﴾ ئەو موژدە و هەڕەشانە باسیان کرا لە هەواڵ و پاداشتی پیاو چاکان و سزای بێ باوەڕان و ئاژاوەچیەکان ، ئایەتەکانی قورئانی خوان ئێمە ئەیخوێنینەوە و بەسەر تۆدا بەڕاستی و بەبێ گومان .

﴿ وما الله يريد ظلماً للعالمين ﴾ وەخوا ویستی ستەم ناکا بۆ بونەوەران و سزای هیچ کەسێ نادا بەبێ تاوان و پاداشتی چاکەی هیچ کەسێ کەم ناکاتەوە ، ئەو ئایەتە هەرچەندە ڕووی پێ کراوە بۆ لای پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەڵام مەبەست ئەو کەسانەیە گومانیان وایە ئەو ئایەتانە لەلای موحەمەدەوە هاتوون ، نەك لەلایەن خوای مەزنەوە ، ئەگینا پێغەمەر بڕوای بێگومانی هەیە بەو ئایەتانە .

﴿ ولله مافي السماوات وما في الأرض وإليه ترجع الأمور ﴾ وەبۆ خوایە بەتەنها شتێ لەنێو ئاسمانەکاندان لەئەستێرە و فریشتە و ئەوانەی ئێمە نایزانین و ، شتێ لەنێو زەویدایە لەئادەمیزاد و جنۆکە و ئاژەڵ و پیتی کانگاکان ، هەموویان خوا هەڵیان ئەسوڕێنێ و ، بۆلای خوا ئەگێڕرێنەوە هەموو کارێ ، بەخێو کەری بوونەوەرانە و پاداشت و تۆڵەی هەموان بەدەست خوایە و کەس توانای خوای نیە بۆ بەخێو کردنیان .

کاتێ زانیمان ئەو کەسانەی لەبەرخوا کار ئەکەن بەگوێرەی فەرموودەی خوا ، ئەوانەن دەست بەیاسای قورئان ئەگرن بەگشتی و پارچەپارچە نابن و بانگی ئادەمیزاد ئەکەن بۆ لای ئاینی ئیسلام و فەرمان ئەدەن بەچاکە و ئادەمیزاد ئەگێڕنەوە لەخراپە و لەداد پەروەریە و نزیکن و ، زانیشمان ئاسمانەکان و زەوی لەسەر داد پەروەری ڕاوەستاون ، بۆیە خوا ئەفەرموێ :

كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَوْ ءَامَنَ

أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم ۚ مِّنْهُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿١١٠﴾ لَن يَضُرُّوكُمْ إِلَّآ أَذًى ۖ وَإِن يُقَٰتِلُوكُمْ يُوَلُّوكُمُ ٱلْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١١١﴾

﴿ كنتم خير أمة أخرجت للناس ﴾ ئێوەی موسوڵمانان چاکترین کەسن ئاشکراکراون بۆ چاکەی ئادەمیزاد . کەواتە ئێوە پێویستە نرخی خۆتان بزانن کە خوای مەزن ئێوەی کردووە بەپێشەوای هەموو نەتەوەکان ، ویستی خوایش وایە پێشەوایەتی بداتە دەست کۆمەڵێکی زانا نەك بەگەلێکی نەزان و خراپ . کەواتە بۆ ئەوەی ئێوە شایانی پێشەوایی بن پێویستە بڕوایەکی پاك و پەیڕەوی کردنێکی ڕاست و ڕەوشتێکی دروست و زانستێکی ڕەواتان هەبێ ، هەتا بتوانن ئەو بارە گرانە هەڵگرن و نەی دۆڕێنن و پێشەوایەتی گەلان لەدەستی خۆتان نەدەن ، ئەوەیش کاتێ ڕوون ئەبێتەوە ئێوە چاکترینی نەتەوەن :

﴿ تأمرون بالمعروف ﴾ فەرمان بدەن بەهەموو کار و بیرو باوەڕێ کەلەلایەن یاساسی خواوە پەسەندبێ و چاکبێ ، لەو ڕێگەیەدا هەموو تاڵێ و ترشی بچێژن بۆ پاراستنی ئادەمیزاد لەچەوسانەوە و خوێن مژی ، هەتا ئادەمیزاد هەناسەی خۆشی بدەن ، ئەوەیش پێك نایە بەبێ باوەڕ بوون بەخوا .

﴿ وتنهون عن المنكر ﴾ وەئێوە ڕێگە بگرن لەهەموو کارێ لای یاسای قورئان پەسەند نی‌یە و بێزی لێ ئەکرێتەوە ، بۆ ئەوەی کۆمەڵگایەکی پاك و خاوێن پەیدا ببێ لەهەموو ڕویەکەوە و ، ئێوەی موسوڵمانان مەهێڵن ئەو کۆمەڵگایە بڕوشێ و لەتەوەرە دەربچێ ، بێ دادی و ئاژاوە و کوشتن و برین و تالآن لەنێویاندا نەمێنێ ، پێشەوایەتی ئێوە پەرەناسێنێ هەتا ئێوە ڕێگە لەخراپە نەگرن . بۆ بەردەوامی ئەو کارە گەورانە خوا ئەفەرموێ :

﴿ وتؤمنون بالله ﴾ وەئێوە باوەڕ بەخوا بـهێنن ، بـۆ ئـەوەیخوای مـەزن تـەرازوی داد پەروەری پایەدار بکا و چاك و خراپەتان پێ بناسێنێ .

لەئایەتی (١٠٤) ی ئەم سوورەتەدا خوای مەزن بانگی ئادەمیزادی کرد بۆ لای چاکـە و فەرماندان بەکاری پەسەند و ڕیگەگرتن لەخراپـە و بـێ بـاوەڕی ، بـەڵام لـەم ئایەتـەدا بۆمانی ڕوون ئەکاتەوە کەئەو کارانە پێك نایەن لەهیچ نەتەوەیەکدا مەگەر تاقمـێ بـن کـە خوا دەری خستبن و بەو کارانە خۆیان بنوێنـن ، ئەوانـەیش بریتـین لەوکۆمەڵـە پـەیڕەوی موحەمەد بکەن . بەم ئایەتە و بەتایبەتی بەو ڕستانەی سـەرەوە ئـەم خاڵانـەی خوارەوەمـان پیشان ئەدا :

١- بێگومـان ئـەو کۆمەڵـە بریتـین لـە پـەیڕەوانی پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ بـەهۆی دارژاندنـی ئایەتەکانەوە کـە یـەك لـەدوای یـەك ڕوی خۆیـان ئەکەنـە بـاوەڕداران ، ئەوانـەیش هـەر پەیڕەوانی پێغەمەرن کەبەڕاستی باوەڕدارن .

٢- ئەو تاقمە کە چاکترین نەتەوەبن بۆ خزمـەتی ئـادەمیزاد بریتـین لەپـەیرەانی موحەمـەد لەهەرکاتێکا بن و لـەهەر نەتەوە ڕەگەزێ بن و هەر زمانێکیان هـەبێ ، بەتایبـەتی ئەوانـەی سەردەمی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ .

٣- ناوەڕۆکی ئەو ڕستانە ڕووئەکاتە موسوڵمانان کەخاوەنی باوەڕن ، ئیـتر هیـچ کەسـێ ناتوانێ خۆی هەڵکێشێ و بڵێ : ئێمە چاکترین نەتەوەین لەهەر ڕەگەزێ بن و بەهەر زمانێ گفتوگۆ بکەن مەگەر باوەڕدار بن و فەرمان بدەن بەچاکە و ڕێگە بگرن لەخراپـە ، ئەگـەر خاوەنی ئەو سێ خا ڵانەبن نابێ خۆیان بەموسوڵمان و پەیڕەوەی پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ دابنێـن و نابنە پێشەوای هەموو نەتەوەکان لەهەر گـەلێ بـن و لـەهـەر خێزانـێ بـن و بەهـەر زمانـێ گفتوگۆ بکەن ، ئیتر باخزمی زۆر نزیکی پێغەمەر بن ، وەك ئەبو لەهـەب و ئـەبو جـەهل و ئەوانەی ئێستاش .

٤- ئەو ئایەتە بۆمان دەرئەخا کە خوای مـەزن موحەمـەد و پـەیڕەوانی ئـەوانی دروسـت کردوون هەتا ببنە پێشەوای هەموو نەتەوەکانی سەرزەوی ، بـەجۆری بـن قورئـانی پـیرۆز

بگرن بەدەستێکیاینەوە و فەرموودەکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەدەستەکەی تریانــەوە ، بەیاسـای ئەوان بانگی ئادەمیزاد بکەن چین لەدوای چین هەتارۆژیی دوایی کە دەست بگرن بەو دوو سەرچاوە روونانەوە ، لەهەموو بیرو باوەرو دەستوریان پەلاماری ئەوان بدەن ، نەك یاسای دەست کردی نارەواو ستەمکار ، چونکە بەختیاری ئادەمیزاد بەوانەوە پایەدار ئەبێ ، نـەك بەو یاسا دەستکردانەوە .

٥- ئەگەر موسوڵمانان بەو کارنە هەڵسن کە بانگ کردنە بۆ چاکە و فەرماندانە بـەکاری رەوا و رێگە گرتنە لەخراپە ، پێشەوایی نەتەوەکانیان لەکیس ناچێ و پێویسـت و شایانی ئەوەن کە ئەو پێشەواییە موسوڵمانان کۆ بکاتەوە لەسەر ئەو کارە پیرۆزانە و لەسـەرئەوەی کاریان بەراوێژ و پرسی یەکتری بێ هەتا مرۆڤێکی ئازاو کارامە و دڵسۆز و دادپـەروەربن. خاوەن ئاین هەڵبژێرن بۆ سەرۆکایەتی خۆیان و ئەوانیش بەگوێرەی یاسای قورئان ملیـاۆن بۆ کەچ کەن و خۆیان بکەن بەفیداکار بۆ پەرەپێدانی ئائینی ئیسلام و بڵاو کردنـەوەی داد پەروەری .

کاتێ لەکاتان کە موسوڵمانان بـەو کـارە گەورانـە هەڵسـابوون ، بـەو بۆنـەوە بـوون بەپێشەوای هەموو ئادەمیزاد ، لەپاشا بەداخەوە کەوازیان لەو یاسا پیرۆزەی خۆیان هێنـا ، ئاینی ئیسـلامیان واز لێ هێنـا ، فـەرمانیان دا بەخراپـە ، توانـای خۆیـان خسـتە کـار بـۆ نەچەسپاندنی یاسای ئیسلام ، بەجۆرێ ئەگەر مرۆڤ ببیـنرێ نوێـژ بکـا یـا رۆژوو بگـرێ تانەی لێ ئەدەن و ئەڵێن نوێژ و رۆژوو لەچەرخی بیستەمدا باوی نەماوە ، بەراستی هـەندێ لەکاربەدەسـتان بـەو کـارە خراپـە هەڵئەسـن ، رێگـە ئاسـان ئەکـەن بـۆ بـەکار هێنـانی خواردنەوەی مەی و یاری کردن بەقومار و فەرماندان بەرووت کردنەوەی ژنان ، دروست کردنی مەی خانە و جێگەی سووڕدانی ژنان ، مەلەوانگە بۆ مەلە کردنـی ژنـان و پیـاوان بەیەکەوە بەرووتی و بگرە بۆ داوێن پیسی و کاری نـارەوای تـر ، یارمـەتی دانـی سـوود خۆران و بەرتیل وەرگرتن ، بۆیە خۆیانیان کرد بەئەڵقە لەگوێی بێ بـاوەڕان و خۆیشـیانی پێوە هەڵئەکێشن و ئەڵێن : پێش کەوتووین .

پاش باسکردنی پێشەوایەتی موسوڵمانان بۆئادەمیزاد ، خاوەن نامەکان هان ئەدا کە ئەوانیش باوەڕ بهێنن بەئاینی ئیسلام و ئەفەرموێ :

﴿ ولو آمن أهل الكتاب لكان خيرا لهم ﴾ وەئەوگەر خاوەن نامەکان بەتایبەتی زاناکانیان باوەڕیان بهێنایە بەموحەمەد وەك ئێوە بەڕاستی لەهەموو کاتێکدا باوەڕهێنانیان چاکترە بۆ ئەوان .

﴿ منهم المؤمنون وأكثرهم الفاسقون ﴾ هەندێ لەوان باوەڕدار بوون و زۆرتر لەوان لەیاسای خوا دەرچوون و باوەڕیان نەهێنا بەموحەمەد ... کاتێ خوای مەزن باوەڕدارانی هاندا کە لە ئاینی خۆیانا بەتین بن ، گوێ نەدەنە پڕوپاگەندەی بێ باوەڕان ، چونکە ئەوان چاکترین کۆمەڵن ، ئاگاداریان ئەکا بێ باوەڕان بێ هێزن و لێیان مەترسن بازمارەی ئێوەیش کەم بن و ئەوان خاوەنی دارایی زۆر بن ، ئەفەرموێ :

﴿ لن يضروكم إلاّ أذى ﴾ لەمەودوا خاوەن نامەکان زیان لەئێوە نادەن مەگەر ئازارێکی کەم وەك تاوانج گرتنە ئاینی ئیسلام و بوختان کردن بۆ موسوڵمانان و بلاّو کردەنەوەی پڕوپاگەندەی نارەوا .

﴿ وإن يقاتلوكم يولوكم الأدبار ثم لا يبصرون ﴾ وەئەگەر بێ باوەڕان جەنگ لەگەڵ ئێوە بکەن پشت ئەکەنە ئێوە و ئەشکێن و بێ هێز ئەبن ، کوشتن و دیل کردنی ئێوە بەوان ناکرێ ، لەپاش ئەو لاوازییانەیان یارمەتی نادرێن سەرناکەون ... بەڕاستی خوای مەزن موژدە ئەدا بە موسوڵمانان هەر کاتێ قورئان و فەرموودەکانی پێغەمەر بکەن بەیاسا بۆ خۆیان و بیکەن بە ژیانی ڕۆژانەی خۆیاوْن و پارچە پارچە نەبن ، بانگی ئادەمزاد بکەن بۆ لای ئیسلام و فەرمان بدەن بەچاکە و بەرگری بکەن لەخراپە ئەبن بەچاکترین تاقم بۆ چاکەی ئادەمیزاد ، خوا موژدەیشیان ئەداتێ کە بێ باوەڕان لەبەرانبەر ئەواندا خۆیان ناگرن لەجەنگدا و هەڵدێن ، موسوڵمانان سەر ئەکەون و ئەوانیش مل کەچی یاسای خوا ئەبن ، مێژوو باسی کردووە کە موسوڵمانان سەر کەوتوو بوون لەهەموو جەنگێکا لەگەڵ

بێ باوەڕانی عەرەب و خاوەن نامەکان و ئاگر پەرستەکان کردبێتیان هەتا ئەوان پابەندی فەرموودەکانی خوا بوون .

سەرۆکەکانی جوولەکە دەستیان کرد بەهەڕەشە کردن لەعەبدولڵای کوڕی سەلام و هاوڕێکانی لەسەر ئەوەی باوەڕیان هێنا بەئاینی ئیسلام ، دوایی خوای گەورە ئەو شتەی شایانی جولەکەکانە لەسەر شۆڕی روونی ئەکاتەوە و ئەفەرموێ :

ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ أَيْنَ مَا ثُقِفُوٓا۟ إِلَّا بِحَبْلٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَحَبْلٍ مِّنَ ٱلنَّاسِ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْمَسْكَنَةُ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿١١٢﴾

﴿ ضربت عليهم الذلة أينما ثقفوا ﴾ دراوە بەسەر جولەکەکانا بێ نرخی و سەرشۆڕی و لە ناوچونی خۆیان و سامانیان لەهەرجێگەیەکا بن و لەوان جیا نابێتەوە .

﴿ إلاّ بحبل من الله وحبل من الناس ﴾ مەگەر دەست بگرن بە نامەی خوا و بەو بەڵێنانەی خۆیان داویانە کە موسوڵمان بن و بەو بەڵێنەش داویانە بەموسوڵمانان سەرانە بدەن بە موسوڵمانان بۆ پاراستنی گیان و دارایی خۆیان ، ئەو کاتە سەرشۆڕی لەسەریان لائەچێ . یانی بەهیچ جۆرێ رزگاریان نابێ بەجگەی ئەوەنەبێ خۆیان بدەنە پاڵ بەڵێنی خواو موسوڵمانانەوە ، بچنە ژێر ئاڵای ئاسایشی یاسای ئیسلام ئەو کاتە خۆیان و سامانیان پارێزراو ئەبێ . جوولەکەکان ئاسایشیان بەخۆیانەوە نەدیوە بەجگەی بەڵێنی موسوڵمانان ،

بەڵام ئەو دوژمنایەتی‌یە ئەوان کردویانە و ئەیکەن لەگەڵ موسوڵمانانەندا لەگەڵ کەسی تریان نەکردووە ، ئەگەر دەست بگرن بەئاینی ئیسلام و بەڵێنی موسوڵمانان ئەوە سەر بەست و ئازاد ئەبن ، بۆیان ئەگونجێ بەگوێرەی یاسای قورئان دەستوری ئاینی خۆیان بەجێ بهێنن و ببنە خاوەنی سامانی زۆر ، مێژووی ڕابوردووی خۆیان بەڵگەیە لەسەر ئەو مەبەستە ، کەچی ئەو ئاسایشەیان نەویستوو گەڕانەوە بۆ لای خواری و کینەی خۆیان بۆ ئادەمیزاد .

ئەتوانرێ مانای ئەو ڕستانە بەم جۆرە بکرێ : سەر شۆڕ ئەبن مەگەر بەهۆی ئەو بەڵێنە خوا بەموسوڵمانانی داوەو فەرمانی داوەبیکەن بەیاسا بۆ خۆیان بۆ ئەوەی هەموو ئادەمیزاد لەژێر سێبەری ئەو یاسایەدا بەخۆشی و ئاسایش بژین و ، مەگەر بەهۆی بەڵێنی بێ باوەڕان و داگیر کەران کە یارمەتی جولەکەکان بدەن و بیان کەن بە بنکەی دەست درێژی خۆیان بۆ سەر دانیشتوانی بێ تاوان ، داگیر کەران بەڵێن ئەدەن بەپاراستنیان وەك لەمەو پاش باس ئەکرێ .

﴿ وباء وإبغضب من الله ﴾ وەجوولەکەکان گەڕانەوە بەخەشمی خوا و لەڕۆژی دواییدا و شایانی ئەو خەشمەیشن لەو ڕۆژەدا .

﴿ وضربت عليهم المسكنة ذلك بأنهم يكفرون بآيات الله ﴾ وەدراوە بەسەریانا هەژاری و بێ نرخی و هەر چوارلای لێ گرتوون ، هەرگیز توانای ڕزگار بوونیان نابێ ، دڵیان پڕە لە پەژارە و کینە بۆ دژی هەموو ئادەمیزاد ، ئەو بێ نرخی و هەژاری و خەشمە بەو هۆیەوە بوو باوەڕیان نەهێنا بەنیشانە ڕوونەکانی نامەی خوا و دەستکار نامەی خوایان کرد هەتا باوەڕ بەپێغەمەر نەهێنن .

﴿ ويقتلون الأنبياء بغير حق ﴾ وەپێغەمەرەکانیان بەناڕەوا کوشت ، زۆر جاران هەر زانایە ئامۆژگاری چاکەی بکردنایە ئەیان کوشت ، یائازاریان ئەدان . وەك کاربەدەستانی ئەم سەردەمە کەخۆیانیان کردووە بەقوتابی ئەو جولەکانە ، ئەو کەسانە ناوی چاکە و ڕەوشتی پاکی ئیسلام بەن لایان ئاڵۆز ئەبن و وەختە گیانیان دەرچێ ، ئەوپەڕی دار و

فەلاقـە و سـزا و کوشـتن و بـەندیان بـۆ بـەکار ئـەهێنن ، مەبەسـتیان خزمـەتی مامۆسـتا بێباوەڕەکانیانە ، پەرەپێدانی سامان و مانەوەی پلەوپایەکانیانە.

﴿ ذلك بما عصوا وكانوا يعتدون ﴾ ئەو بێ نرخی و هەژاری و خەشمە بـەهۆی ئـەوەوە بوو بێ فەرمانی خوایان کردبوو ، لەفەرموودەی خوا دەرچوو بون ، وەبەهۆی دە سـت درێژی ئەو جوولەکانەوە بۆ سنوورەکانی خوا و پێ شێل کردنی فەرمانەکانیانەوە بوە .

کوشتنی پێغەمـەران و زانایـان هەرچـەندە نـاڕەوان بەهـەر چۆنـێ بـێ ، بـەڵام بـەلای بیروباوەڕی جوولـەکەکانەوە زۆر پەسەند و ڕەوایە ، هەرچەندە هـەندێ لـە جوولـەکـەکان پێغەمەرانیان نەکوشتووە بەڵام چونکە بەکردەوەی پێشوەکانی خۆیان ڕازیــن ، وەك ئـەمان کردبێتیان وایە .

زانایان بەگشتی پێك هاتوون کەئەو ئایەتە هاتووەتە خـوارەوە دەربـارەی جولـەکـەکان هەروەها لەسەر ئەمـەیش پێـك هـاتوون کـەبێ نرخـی و هـەژاری لەسـەر جوولـەکـەکان نوسراوە لـەیەکەم جاری سەرهەڵدانی ئایینی ئیسلامەوە هەتا ڕۆژی دوایی ، چونکـە ئـەوان لـەگێرە شێوێنی یاخی بوونا گەیشتوونەتە پلـەیە بەر لـەوان کەسی تر بەو پلـەیە نەگەیشـتووە لـەمەو پاشیش کەسی تر پێی ناگا . بەڵام هەریەکە لـەزانایان بەجۆرێ دەسـت نیشـانی بـێ نرخی و کزۆڵی ئەوانیان کردووە کەهەرگیز لـەوان جیـا نەبێتـەوە هەرزانایـە بـەگوێرەی کـات و سـەردەمی خـۆی باسـی بـێ نرخـی و کزۆڵـی و هـە ژاری ئـەوانی کـردووە : لـەسەردەمی یەکەم کاتی پەیدابوونی ئیسلام بەوەرگرتنی سەرانە لـەوان بـێ نرخـی ئـەوانی دیاری کردووە ، لەهەموو هەرێمەکانی تردا هەریەکە بەگوێرەی بینراوی خۆی پەنجەی بـۆ بێنرخی ئەوان درێژ کردووە بەهەر جۆرێ دەست نیشانی ئەوبێ نرخییـەی ئـەوان بکـرێ ئەوەی مێژوو بۆیـانی ڕوون کردوەتـەوە و خۆیشـمان ئـەیزانین سـەر شـۆڕی و هـەژاری بەهەرشتێ بێ لـەجوولـەکەکان جیا نەبوەتەوە : بۆ نموونە پەرتەوازە یـی و بـڵاو بوونـەوەی جوولـەکەکان بەسەر هەموو ڕوی سەرزەویدا ، بێ نیشـتمانی ئـەوان و بەژمارەیـەکی کـەم هەریەکەیان لـەووڵاتێ و پاش کەو تووبی ئەوان و ژێر دەستەیی ئەوان بۆ جگـەی خۆیـان ، ئەوانە هەموویان نیشانەی سەرشۆڕی و بێ نرخی و پەستی جولـەکەکانە .

بەلاّم ئەو تاقمەی ئێستا ناوی خۆیانیان ناوە ڕژێمی ئیسرائیل ، بوون بەخاوەنی خاك و دارایی موسولّمانان و داگیریان کردوون ( تەلئەبیبیان ) کردوە بەپایتەختی شومی خۆیان، ئەوانە بەناو سەربەخۆن لەناوەڕۆکدا بنکەیەکن لە بنکەکانی وولاّتەدا داگیرکەرەکان، کردوویانە بەفرۆکە خانە و جێگەی مۆڵدانی سەربازەکانی خۆیان ، بۆ ئەوەی هەرکاتێ ویستیان بەکاریان بهێنن بۆ پەلاماردان و دەست درێژی و خوێن مژینی هەر نەتەوەیە لجغزی ئەوانا نەبێ ، بەتایبەتی وولاّتانی موسولّمان ، بۆ نمونە ئەو ڕژێمە پێك هاتووە بەبەڵێنی کاربەدەستانی خۆرئاوا ، گەورەترین بەڵگە بەڵێنی بلفۆرە شومەکەیە، بەدەیان بەڵێنی کاربەدەستانی ئەمەریکای داگیر کەر و خوێن مژ ، بەڵێنی تری کاربەدەستانی فەرەنسا و ڕوسیای داگیر کەری تازە و چەندین ڕژێمی تری خاوەن کینە بۆ موسولّمانان. هەموو ئەو بەڵێنانە . بۆ پاراستنی ڕژێمی جولەکەکان و سوودی گشتی خۆیان ، ئەگەر هەر نەتەوەیە پەلاماری ئەو ڕژێمە بدەن ، ڕژێمە داگیر کەرەکان پەلاماری ئەدەن بە هەموو هێزی خۆیان ، کەواتە مەبەست لەمانای ﴿ وحبل من الناس ﴾ بریتی‌یە لەیارمەتی ئابووری و ڕامیاری ڕژێمە داگیرکەرەکان بۆ ئەو ڕژێمە کە بنکەی خۆیانە .

بەیارمەتی خوا ئەو ڕژێمە ڕوو لەنەمانە درەنگبێ یا زوو چونکە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێ : ( لاتقوم الساعة حتى تقاتلوا اليهود ، وإن الحجر يقول : يا مسلم هذا يهودي فأقتلوه ) ڕۆژی دوایی پەیدا نابێ هەتا ئێوەی موسولّمان جەنگ نەکەن لەگەڵ جوولەکەکان و بەڕاستی بەرد ئەڵێ : ئەی موسولّمان ئەوە جولەکەیەکە دوایی ئێوە بیکوژن .

پرسیار / جگە لەجوولەکەکان نەتەوە و کۆمەڵی تر هەن بڕوایان بەخوا نەهێناوە ، بێ تاوانان ئەکوژن و لەخوا یاخی ئەبن ، دەست درێژی ئەکەنە سەر بێ گوناهان و سامانیان زەوت ئەکەن ، کەچی خوای مەزن سەرشۆڕی و بێ نرخی ناهێنێ بەسەریانا ؟

وەلاّم / ئادەمیزاد وا ئەبێ لەجگەی جوولەکەکان لەخوا یاخی ئەبن و درێژەیشی پێ ئەدەن بۆ سوودی تایبەتی خۆیان ، لەناوەڕۆکدا بەخراپی ئەزانن و بێزی لێ ئەکەنەوە ،

بەڵام یاخی بوون و خراپە کردنی ئەوان لەقوڵایی دەرونیانەوە دەرئەچێ و زۆری پێ کەیف خۆش ئەبن و خۆیانی پێوە هەڵئەکێشن و مەبەستی پیرۆزیان تاڵان و برۆی جگـە خۆیانـە ، ئەو جۆرە ڕەوشتە لەجگەی جوولەکەکان لەکەسی ترەوە نەزانراوە ، بڕوایان وایە جگـەی خۆیان بۆ سوودی ئەوان دروست کراوە ، جگەی خۆیان بەئاژەڵ دائـەنێن و بـۆ ئـەوان ، بەلایانەوە وایە خوا لەگەڵیانە بۆ کردنی هەموو شتێ . لەبەر ئەوانەیە بەتەنها خـوا چادری کزۆڵی و سەرشۆڕی هەڵداوە بەسەریانا .

لەپاش باسکردنی تاوانی زۆری جولەکەکان ، خـوای مـەز ن باسـی ترمـان بـۆ ئـەکا لەخاوەن نامەکاندا هەندێکیان باوەڕدارو دادپەروەرن ، هەیانـە بـێ بـاوەڕ و سـتەمکارن ، هەموویان وەك یەك نین و ئەفەرموێ :

لَيْسُوا سَوَآءً ۗ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُسَـٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١١٤﴾ وَمَا يَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ﴿١١٥﴾

﴿ ليسوا سواء ﴾ خاوەن نامەکان وەك یەك نین ، هەیانەبێ باوەڕن و ، هەیانە باوەڕدارن و پەیڕەوی فەرمانی خوان ، وەك خوا فەرمویی :

﴿ من أهل الكتاب أمة قائمة يتلون آيات الله ﴾ کۆمەڵێ هەن لـــەخاوەن نامـەکان وەك عـەبدوڵای کـوڕی سـەلام ڕاوەسـتاون لـەسـەر ئـاینی بـەرێك و پێکـی و داد پـەروەری، ئایەتەکانی قورئان ئەخوێنن کەبەڵگەی ڕاستی و دروستی ئاینی ئیسلامە .

﴿ أناء الليل وهم يسجدون ﴾ لـەکاتەکانی شەودا ، بەتایبەتی کاتەکانی خەوتن و کەس بێدار نیە و ، ئەو کۆمەڵە لـەو کاتانەدا سوژدە ئەبەن بۆ خوا و نوێـژ ئەکـەن و قورئـان ئـە خوێنن ئیتر ئەو نوێژە نوێژی پێویستبی یا شەو نوێژی تر مەبە ستەکە ناگۆڕێ .

﴿ يؤمنون بالله واليوم الآخر ﴾ باوەڕ بەتەنهایی خوا و بـەڕۆژی دوایـی ئـەهێنن ، نـەك وەك بێ باوەڕان عوزەیر و عیسا بەکوڕی خوا دائـەنێن و هـەندێکیان باوەڕیـان بـە ڕۆژی دوایی نی‌یە .

﴿ ويأمرون بالمعروف وينهون عن المنكـر ﴾ وەفـەرمان ئـەدەن بەچاکـەو بـەباوەڕهێنان بەخوا و بەپێغەمەر و بەئاینی ئیسلام و ڕێگە ئەگرن لـەخراپە و لـە بەدرۆ خستنەوەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەگوێرەی یاسا و ئەقڵ ، بەپێچەوانەی خاوەن نامە بێ باوەڕەکانی تر گـوێ نادەنـە چاکە و خراپەی ئادەمیزاد ، هەرشـتێ بکـەن ئـەوان هـەر دۆسـتی خـاوەن خراپـەکانن ، فەرمانیان پی ئەدەن بەخراپە کردن و چاکەیان لێ قەدەغە ئەکەن و گومڕایان ئەکەن .

﴿ ويسارعون في الخيرات ﴾ وەئەو کۆمەڵە پەلـەئەکەن بۆ لای کردنی هـەموو چاکەیـە لـەبەر ترسی خوا . ئەو کۆمەڵەلەکاتی لاویدا توێشوو هەڵئەگرن بۆ کاتی پـیری و لــەکاتی ساغیدا بۆ کاتی نەخۆشی و لەکاتی ساماندariدا بۆ کاتی هەژاری و لــەکاتی زیندویـدا بـۆ کاتی مردن ، بەڵام خاوەن نامەکانی تر تەمەڵ و سستن بۆ چاکەکردن ، بگــرە پەلـەئەکـەن بۆ لای کردنی خراپە .

﴿ وأولئك هم الصالحون ﴾ وئەو تاقمانە ئەو کارە چاکانە ئەکەن ئەوانن لــەرێزی پیـاو چاکانن لای خواو شایستەی ڕەزامەندی خوان .

﴿ وما يفعلوا من خيرٍ فلن يكفروه ﴾ وەئەو شتەی ئەو کۆمەڵە ئەیکەن لـەهەر چاکەیە لـەو شتانەی باسکران و چاکەی تریش ، دوایـی ئەوانـە لـەمـەوپاش ناسوپاسـی ئـەو شـتە ناکەن و بەوانە ڕازین و پاداشتی هەموویان بەبێ کەم و کوڕی وەرئەگرن .

﴿ والله عليم بالمتقين ﴾ وەخوا ئەزانێ بەو کەسانە لــەخوا ئەترســن و خۆیـان ئـەپارێزن لەخراپە و بەرێزن لای خوا .

مانای ئەو سێ ئایەتانەی پێشوو وێنەیەکی تــری جوانــی خـاوەن نامـە باوەڕدارەکانمـان پیشان ئەدا کەباوەڕەکانیان لەقوڵایی دڵیانەوە دەرئەچێ بـۆ ئـاینی ئیسـلام و پاڵیـان داوە بەپۆلی موسوڵمانانەوە ، پاسەوانی ئەو ئایینە ئەکەن ، باوەڕیان بەخوا و پاشــەڕۆژ هێنـاوە و بەچـەندین فـەرمانێکی گـران هەڵسـاون ، بـۆ خۆیانیـان دیـاری کـردووە دروشمـی ئـەو موسـوڵمانانە ئـەمن چوونەتـە ڕیزیانـەوە کـەچاکترین نەتـەوەی ڕاوەسـتاون بـۆ سـوودی ئادەمیزاد. کەواتە بۆیە ئەمانیش فەرمان ئەدەن بەچاکـە و ئـادەمیزاد ئەگێڕنـەوە لـەخراپـە ، ئارەزویان لەکردنی هەموو چاکەیە هەیە و کردویانە بەنیشانەی خۆیان ، پەلــە ئەکـەن بـۆ لای چاکەکان ، بۆیە خوای مەزن شایەتیان بۆ ئەدا کەلـەڕیزی پیـاو چاکـاندا ئـەژمێرێن و شایەتی دانی خوا بۆ ئەوان زۆر گرنگە و پاداشتیان زۆر بــەرزە لای خـوا و بـەبێ کـەم و کوڕی وەری ئەگرن خوا پێمان ئەفەرموێ : من لـەگەڵ خۆ پارێزان و لـەخوا ترسانم .

بانگ کردنی ئـادەمیزاد بـۆ بـاوەڕ هێنـان بەموحەمـەد وەك پێغەمـەرێکی نـێردراو لـە ئاسمانەوە هەربووە و بەردەوامە یاساکەی هەتا ئەمڕۆ و پاشەڕۆژیش ، ڕەوانە کراوە بــۆلای هەموو ئادەمیزادی سەر زەوی بێ جیاوازی ، یاسای موحەمــەد ﴿ﷺ﴾ بـۆ بـەرێوە بردنـی کاری ڕۆژانە بەڵگە و نیشانەی ڕاستی ئەو پێغەمەرەن بەگوێرەی ئــەقڵ و کـاری بەهـەموو کەس نەکراو ، دەستوریشی شیاوی هەموو کات و جێگەیەکە ، لەبەرئەوانە پێویست ناکـا زۆر لـەسەری بڕۆیــن . بـەڵام ئـەوەی پێویسـتبێ باسـی بکـەین ئەمەیـە : ئایـا هەرکەسـێ لەدانیشتوانی سەر زەوی باوەڕی بەفروستادەیی پێغەمــەر نـەبێ ﴿ﷺ﴾ سـزاوار و شـیاوی تۆڵە و سزایە لەڕۆژی دواییدا هەتا هەتایە یانە ؟ کەواتــە پێویسـتە بەشـی کراوەیـی باسـی بکەین کەبەچ جۆرێ شیاوی سزان و بەچ شێوەیە سزاوارنین . پێشــەکی ئـادەمیزاد بەهـەر شێوەیەبن و لـەسەر هەر ئاینێ بن شایستەی سزا و تۆڵە نین هەتا بەڵگەیان بۆ ئەهێنرێتـەوە و

بیانوویان نەبڕێ ، لەتوانایانا هەبێ تووشیان ببێ بەتووشی بەڵگە و بیانوی ڕاست و دروست و بتوانین بیان خەینە کار بۆیان ، ئەو کاتە ئەوانیش بەبێ بیانوو بە فیزەوە بەنارەوایی وەریان نەگرتوو باوەڕیان بەپێغەمەر ﴿ﷺ﴾ نەهێنا لەو کاتەدا شایستەی سزان بەبێ گومان ... خۆ ئەگەر لەبنچینەدا بەڵگەیەکی ڕاست دەست نەکەوت بۆیان لەسەر فرۆستادەیی موحەمەد ﴿ﷺ﴾ ، یادەستیان کەوت . بەڵام نەتوانرا بەوانی بگەیەنین تێگەیشتنی ئەو بەڵگانە بەو جۆرە پێویستبێ و ڕاستیمان دەست نەکەوت لەم کاتەیشدا خاوەنی بیانوون شایستەی سزانین ، مەگەر تەمەڵی بەکاربهێنن لەدەست کەوتنی بەڵگەی ڕاست .

ئەو کەسانەی بیانویان لێ وەرئەگیرێ بۆ باوەڕنەهێنان بەپێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەمانەن .

١- ئەو کە سانەن تەماشای بەڵگەکان بکەن و بەوان ڕازی نەبن و بەبێ لایەن ڕاوەستا بن، نەئەیان توانی بلێن : موحەمەد پێغەمەر نیيە و نەیشیان ئەتوانی بلێن : پیێغەمەرە ، بەلایانەوە وابێ ئەگەر ڕاستیان بۆ دەرکەوت باوەڕ بە موحەمەد ﴿ﷺ﴾ ئەهێنن ، ئەو کەسانە ئەو بیانووەیان لێ وەرئەگیرێ و سزایان نادرێ .

٢- ئەوکەسانەن دانیشتوی جێگەیەکی دوور لەئیسلام و موسوڵمانان بن ، بانگی ئاینی ئیسلامیان پێ نەگەیشتبێ و ناوی موحەمەد یان بەفرو ستادەیی نەبیستبێ ، بەدڵیانا نەهاتبێ لە نزیك و لەدوور کەلەم سەر زەوییەدا ئا ینێ هەیە ناوی ئیسلامە ، بێگومان ئەو کەسانە خاوەنی بیانوو شایستەی سزانین .

٣- ئەو کەسانەن ناوی ئیسلام و موحەمەدیان بیستوە ، بەڵام توانای ئەوەیان نیيە ڕاست و پوچ لەبەڵگەکان جیا بکەنەوە ، چونکە بەو جۆرە پێویست بێ مێشکیان وەری ناگرێ و ناتوانن لەڕاستی بگەن و بیزانن ، ئەو کەسانە وەك منداڵ و شێت وان ، خاوەنی بیانوون و سزایان نادرێ .

ئەو کەسانەی بیانوویان لێ وەرناگیرێ ئەم کەسانەی خوارەوەن :

١- ئەو کەسانەن تەماشای بەڵگە بکەن بۆ وەرگرتنی ڕاستی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ، ڕوو بکەن بەدڵسۆزییەوە بۆ لای ئەو ڕاستییە ، بەڵام ڕانموییی وەرنەگرن بۆ ڕێگەیە بیانگەیەنێ

بەباوەڕ هێنان بەموحەممەد ﴿ﷺ﴾ بەهۆی ئەوەوە خۆیانیان بەستووە بەگومانێکی پوچەوە ، بی ئەوەی ئاوڕێ بدەنەوە بۆ لای پوچی ئەو بیرو باوەڕە پێوە بەستراون ، ڕانمویی نابن بە بۆنەی ئەو بیرو باوەڕە خوار و خێچەوە ، ئەگەر ئەو کەسانە بەگشت دڵیانەوە بڵێن : موحەممەد ﴿ﷺ﴾ پێغەمەر نیە ، ئەو کەسانە بیانوویان لێ وەرناگیرێ ، بەبێ گومان سزایان ئەدرێ ، ئەو کەسانەیش باوەڕیان بەو شتانەنەبێ نەی بینن و لایان وابێ ئەو شتانە نین ، بۆیە باوەڕ بەیاسای ئیسلام ناهێنن ، ئەو کە سانە هەموویان بیانوویان لێ وەرناگیرێ .

٢- ئەو کەسانەن باوەڕ بەموحەممەد ناهێنن ، لەگەڵ ئەوەیشدا تێگەیشتنی تەواویان هەیە و خاوەنی ئەقڵن و ئەتوانن لەڕا ستی بگەن و بیدۆزنەوە ، بەڵام ئەیخەنە پشت گوێ و بەلایانەوە گرنگ نیە بەهیچ جۆرێ ، یا ئەگەڕێن بەشوێن بەڵگەی ڕاستیدا بەکەم و ناتەواوی ، وازی لێ ئەهێنن پێش ئەوەی بگەن بەئەنجام ، لەوێنەی ئەو کەسانە زۆرن بەتایبەتی زۆربەی لاوانی ئەم سەردەمەی ئێمە ، ئەو جۆرە کەسانە بیانویان لێ وەرناگیرێ و سزایان ئەدرێ وەك بێ باوەڕان .

کاتێ خوای مەزن باسی باوەڕدارانی کرد لەئایەتەکانی پێشوودا ، لەم ئایەتانەی دواییدا باسی بێ باوەڕان ئەکا بەگشتی ، بەتایبەتی ئەوانەی دووروون ، ئەفەرموێ :

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغْنِىَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۚ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١١٦﴾ مَثَلُ مَا يُنفِقُونَ فِى هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَثَلِ رِيحٍ فِيهَا صِرٌّ أَصَابَتْ حَرْثَ قَوْمٍ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ فَأَهْلَكَتْهُ ۚ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِنْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿١١٧﴾

﴿ إن الذين كفروا لن تغني عنهم أموالهم ولا أولادهم من الله شيئاً ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەو تۆ باوەڕیان نەهێناوە بەئاینی ئیسلام ، وەك کەعبی کوڕی ئەشرەف و هاوڕێکانی ئەو کەسانە بەڕوالەت باوەڕیان هێناوە نەك بەڕاستی ، لەمە دووا سوود ناگەیەنێ بەوان داراییەکانیان و منالەکانیان لای خوا هیچ شتێ لەڕۆژی دواییدا ناگاتە فریایان .

﴿ وأولئك أصحاب النار هم فيها خالدون ﴾ وەئەو کەسانە دانیشتوی ئاگری دۆزەخن و هاوڕێی ئاگرن ، ئەوان لەنێو ئاگری دۆزەخدا بەردەوامن .

پاش ئەو فەرموودانە خوای مەزن وێنەیەکمان بۆ ئەهێنێتەوە دەربارەی ئەو کەسانە دارایی خۆیان ئەبەخشن بەمەرامێکی خراپ و ئەفەرموێ :

﴿ مثل ما ينفقون في هذه الحياة الدنيا ﴾ وێنەی شتێ ئەو بێ باوەڕانە ئەیبەخشن لەم ژیانەی جیهاندا بۆ ئەوە باسیان بکرێ و خۆیانی پێوە هەڵکێشن .

﴿ كمثل ريح فيها صر أصابت حرث قوم ظلموا أنفسهم ﴾ وەك وێنەی بایەك وایە لەنێویدا هەبێ سەرمایەکی زۆر سەخت و کوشندە تووشی چێنرا و سەوزایی کەسێ ببێ ستەمی لەخۆی کردبێ و مافی خوای نەدابێ و باوەڕی بەخوا نەهێنا بێ .

﴿ فأهلكته وما ظلمهم ولكن أنفسهم يظلمون ﴾ دوایی ئەو بایە چێنراو سەوزاییەکە لەناو ببا ، خوا ستەمی لەو کەسانە نەکردووە بەلەناو چوونی ئەو چێنراوە و بەڵکو خۆیان ستەمیان لەخۆیان کردووە .

یانێ ئەو کەسانە دارایی ڕەواو نارەوای زۆر کۆ ئەکەنەوە ، بۆ ئەوەی بەرگری کاری ڕاستی پی بکەن و لەدژی ڕاستی هەڵسن ، ئەیبەخشن بۆ پەیدا کردنی پلە و پایەی بەرز و ڕابواردن ، ئاوڕی بۆلای ئاین و ئادەمیزاد نادەنەوە ، بەو کردارانە یان ئەقڵی خۆیانیان لەناوبردووە ، ڕەوشتی پەسەندیان پایە ماڵ کردووە ، وێنەی ئەو بایەن کۆششی سالانەی ئەو تا قمەی لەناوبردووە لەکاتی هەڵگرتنی بەرهەمیاندا و دەستیان لەبەرو دوابڕاوە .

ئەو کەسانە با چەند ڕۆژێکی کەم ڕایان بوارد و بێ و سکی خۆیانیان لەئاڵف پڕکردبێ لەڕاستیدا زیانیان لەخۆیان داوە ، لەپاشەڕۆژدا تووشی سزای بەردەوام ئەبن ، کەواتە ستەمی لێ نەکردوون خۆیان ستەمیان لەخۆیان کردەوە بەخوایشی خۆیان و دوای ئارەزوی خۆیان کەوتوون هەندێ لەموسوڵمانان دۆستایەتی خۆیانیان پەرە ئەدا لەگەڵ بێ باوەڕان و دوو ڕووەکان بەهۆی دۆستایەتی کۆنیان و خزمایەتی و دراوسێیەتی و هاوسوێندی و هاوشیرەیی ، خوای مەزن بۆ ئەو هۆیانە ئەفەرموێ :

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا وَدُّواْ مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ ٱلْبَغْضَآءُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْأَيَٰتِ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١١٨﴾ هَٰٓأَنتُمْ أُوْلَآءِ تُحِبُّونَهُمْ وَلَا يُحِبُّونَكُمْ وَتُؤْمِنُونَ بِٱلْكِتَٰبِ كُلِّهِۦ وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْاْ عَضُّواْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَنَامِلَ مِنَ ٱلْغَيْظِ قُلْ مُوتُواْ بِغَيْظِكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١١٩﴾ إِن تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِن تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُواْ بِهَا وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿١٢٠﴾

﴿ یاأیها الذین آمنوا لا تتخذوا وابطانة من دونکم ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە بەخوا و بەپێغەمەر : ئێوە وەرمەگرن دۆستی نهێنی لەجگەی خۆتان و لەجگەی هاو ئاینی خۆتان لەبێ باوەڕان .

﴿ لا یألونکم حبالا لا ودوا ماعنتم ﴾ ئەو کەسانەی جگەی خۆتان کۆتایی لەئێوە ناکن و واز لەئێوە ناهێنن لەشتێ ئێوە تووشی خراپە بکا و لاوازتان بکا و پەرتەوازە بن ، ئەوان ئاوات ئەخوازن بۆ شتێ ئازار و زیان بەئێوە بگەیەنێ و ئاینتان لاواز بێ .

﴿ فقد بدت البغضاء من أفواههم وما تخفي صدورهم اکبر ﴾ بەڕاستی دەرکەوتووە نیشانەی ڕق و دوژمنایەتی لەدەمی ئەوانەوە لەگفتوگۆیانا بەجنێودان و تێکدانی ڕیزی موسوڵمانان و ، شتێ دڵیان پەنهانی دا وەگەورەتر لەوەی ئاشکرای ئەکەن .

﴿ قد بینا لکم الآیات إن کنتم تعقلون ﴾ بەڕاستی ئێمە هەموو کاتێ ڕونمان کردوەتەوە بۆ ئێوە چەندین نیشانەی ئاشکرا کە پێویستە ئێوە دۆستایەتی باوەڕدارانی خۆتان بکەن و دوژمنی بێ باوەڕانین و پابەندی ئاینی خۆتانبن ئەگەر ئێوە بەئەقڵەوە وورد ببینەوە لەو شتانەی ئێمە بۆمان ڕوون کردوەتەوە لەدۆستایەتی باوەڕداران و دوژمنایەتی بێ باوەڕان .

پرسیار / ئەوەی زانراوە لەسەرۆکی هەموو ئاینێ لەهەموو نەتەوەیەکدا کەبڵاوی ئەکەنەوە لەنێوان پەیڕەوەکانی خۆیانا دوژمنایەتیو ڕەگەز پەرستی بەکار بهێنن لەگەڵ نەتەوەکانی تردا . ئەمەیش قورئانی پیرۆز هەمان ڕێگەی گرتووە ، چونکە فەرمانی داوە بەباوەڕداران بەو ڕێگەیە ، بەدوورە پەرێزی لەجگەی خۆیان ، کەواتە ئاسانی و چاو پۆشی کامەیە لەنێو ئیسلامدا ، جیاوازی لەنێوان موسوڵمانان و جوو لەکەکاندا چ شتێکە ؟ کە جوولەکەکان بەیەکتریان ئەووت ﴿ ولا تؤمنوا إلا لمن تبع دینکم ﴾ وەئێوە باوەڕ بەهیچ کەسێ مەهێنن مەگەر بەکەسێ دوای ئاینی ئێوە کەوتوە ؟

وەڵام / بەڕاستی ئەو ئایەتە موسوڵمانانی نەترساندووە لەجگەی خۆیان لەو بارەیەوە کە ئاینی ئیسلام ناکەن بەئاین بۆ خۆیان ، بەڕاستی ئەیان ترسێنێ لەکەسانێکی ئەوتۆ فێڵ و داو

دائەنێن بۆ ئاینی ئیسلام و بۆ موسولمانان ، ئەو وەلام و مەبەستە بەڕونی دەرئەکەوێ لەفەرموودەی خوای مەزنەوە ﴿ لایألونکم خبالاً ﴾ یانی بێ باوەڕان واز ناهێنن ، خۆیان ماندوو ئەکەن بۆ زیان گەیاندن بەئێوە و تێکدانی کارەکانتان ، هەتا ئەگاتە ﴿ وإن تصبکم سیئةٌ یفرحوا بها ﴾.

﴿ ها أنتم أولاء تحبونهم ولا یحبونکم ﴾ ئێوەی موسولمانان ئاگاداربن : ئێوە ئەو کەسانەن ئەو تاوانبارانەتان خۆش ئەوێ کەئەوپەڕی دوژمنی ئێوەن و ئەتانەوێ ئەوان بانگ بکەن بۆ لای چاکترین شتێ کەئاینی ئیسلامە و ، ئەوان ئێوەیان خۆش ناوێ و بەدۆستیخۆیانتان نازانن و ئەیانەوێ ئێوە تووشی خراپترین دەردی سەری بکەن ، بەتایبەتی بتان کەن بەبێ باوەڕ و واز لەئا ینی ئیسلام بهێنن .

ئەو ڕستانە بۆ سەرزەنشتی کردنی هەندێ موسولمانانە ، نەك بۆ هەموویان ، چونکە لەیەکەم کاتی هاتنی ئیسلام هەتا ئێستا نەبینراوە و نەبووە کە هەموو موسولمانان پێك هاتبن لەسەر دۆستایەتی بێ باوەڕان ، بەلام لەهەمان کاتدا هەندێ لە بەناو موسولمانان سی خوری ئەکەن بۆ بێ باوەڕان و ئاین و نیشتمان و ناموسی خۆیان ئەفرۆشن بۆ دەست کەوتنی پلە و پایە و سامان.

﴿ وتؤمنون بالکتاب کله ﴾ وەئێوە باوەڕ ئهێنن بەهەموو نامەکانی خوا بەبێ جیاوازی و بێ باوەڕان بڕوا ناهێنن بەهەموو نامەکان ، جوولەکەکان بڕوا ناهێنن بەئینجیل و بەقورئان، گاورەکان بڕوا ناهێنن بە قورئان ، ئیتر ئێوە چۆنتان خۆش ئەوێن .

﴿ وإذا لقوکم قالوا آمنا ﴾ وەهەرکاتێ ئەوان توشی ئێوە بوونایە ئەلێن : ئێمە باوەڕمان هێناوە بەئاینی ئێوە ، ئەو کەسانە دووڕوون و چاوبەست لەئێوە ئەکەن و شایەنی دۆستایەتی نین .

﴿ وإذا خلوا عضواً علیکم الأنامل من الغیظ ﴾ وەهەرکاتێ بێ باوەڕان لەنهێنیدا لەگەڵ خۆیانا کۆببنەوە سەری پەنجەکانی خۆیان ئەگەزن لەسەر زیانی ئێوە لەڕقی ئەوەی ئێوە ئەبینن یەکتان گرتووە و ڕێگەی ڕزگاری بۆ نەخۆشی کینەی دلیان نادۆزنەوە .

﴿ قل موتوا بغیظکم إن الله علیم بذات الصدور ﴾ تۆ بلّێ بەبێ باوەڕان یاخوا ئێوە بمرن بەرقی خۆتانەوە بەڕاستی خوا ئەزانێ بەشتێ لەدڵی بێباوەڕداراندایە و ئەوشتەی هاتو چۆ ئەکا بەدڵیانا .

﴿ إن تمسکم حسنة تسؤهم ﴾ ئەگەر تووشی ئێوە ببێ و بەئێوە بگا چاکەیە لەجەنگدا و سەربکەون ئەو چاکەیە ئازار بەئەوان ئەدا وئەوپەڕی غەمی پێوە ئەخۆن .

﴿ وإن تصیبکم سیئة یفرحوا بها ﴾ وەئەگەر بگا بەئێوە خراپەیەلەجەنگدا و ئێوە بشکێن دڵخۆش ئەبن بەو خراپەیە ئیتر چ شتێ بێ لەو دوژمنایەتیەیە گەورەتر و خراپتربێ.

﴿ وإن تصبروا أو تتقوا لایضرکم کیدهم شیئاً ﴾ وەئەگەر ئێوەی باوەڕدار ئارام بگرن لەسەر ئازاری بێ باوەڕان وەلەخوا بترسن و خۆتان بپارێزن لەبێ فەرمانی خوا و لەدۆستایەتی ئەوان و پابەندی یاسای قورئان بن زیان بەئێوە ناگەیەنێ فێڵی ئەوان هیچ شتێ و خوا ئەتانپارێزێ لەفێڵی ئەوان .

﴿ إن الله بما یعملون محیط ﴾ بەڕاستی خوا بەشتێ ئەوان بیکەن لەدوژمنایەتی ئێوە و لەکینەی دڵیان ئاگادارە بەهەموویان .

هەتا ئێرە موسوڵمانان لەخەبات و تێکۆشانی دەمیدا بوون بەگفتوگۆ کردن لەگەڵ بێ باوەڕان ، بەهەموو جۆرێ بەڵگەی ڕون و بەهێزیان بۆ بێ باوەڕان ئەهێنایەوە ، هەندێ جار سوودیان لێ وەرئەگرت ، لەمەوپاش موسوڵمانان چاریان نەما و دەستیان بەخەباتی چەکداری و جەنگی ڕاستەوخۆ کە زانیان بێ باوەڕان جەنگ فرۆشن ، بۆ بەرگری کردن لەبیر و باوەڕی خۆیان ، بەجەنگی ئوحود دەستی پێ ئەکا پاش جەنگی بەدر ، خوا فەرمووی :

وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ ٱلْمُؤْمِنِينَ مَقَـٰعِدَ لِلْقِتَالِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٢١﴾

إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٢٢﴾

﴿ وإذا غدوت من أهلك ﴾ وەتۆ موحەمەد بیری ئەو کاتە بکەرەوە تۆ چوو یتە دەرەوەلە هۆدەی خێزانی خۆت عایشە و لەشاری مەدینە بۆ لای ئوحود لەبەرەبەیانی ڕۆژی هەینی و چواردەی مانگی شەوال و لەساڵی سێهەمی کۆچی .

﴿ تبوئ المؤمنين مقاعد للقتال ﴾ تۆ باوەڕدارانت ڕێك ئەخست و ئا مادەت ئەکردن و دات ئەنا هەر تاقمێکیان لەجێگەکانی خۆیان بۆ جەنگ کردن لەگەڵ دوژمنانی خۆیانا ، لەلای ڕاست و لای چەپ و لەناوەڕاستدا . تۆ بیری باوەڕدارانی بخەرەوە چ شتێکی گران هات بەسەریانا و بێ فەرمانی تۆیان کرد و ئارامیان نەگرت و تووشی زیانبوون..

ڕستەی ﴿ من أهلك ﴾ بەڵگەی بێ گومانە کە عایشە یەکێکە لەخێزانەکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەهەموو جۆرێ پاك و داوێن پاکە ، ئەگەر وانەبێ خوا ناوی نابا بەخێزانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەگوێرەی فەرموودەی خوا بەنوحی فەرموو : ﴿ إنه ليس من أهلك ﴾ بەڕاستی ئەو کوڕەی تۆ لەخێزانی تۆ نییە .

﴿ والله سميع عليم ﴾ وەخوا گفتوگۆی ئێوە ئەبیسێ کاتی ئێوە لەمەدینە چوونە دەرەوە بۆ کێوی ئوحود ، ئەزانێ بەشاراوەی دەروونتان کەهەندێکیان ئەتان ووت : بانەچینە دەروەو بەرەنگاری بێ باوەڕان بکەین لەسنووری مەمدینەدا ، هەندێکتان ئەتان ووت : با لەنێو مەدینەدا پاسی خۆمان بکەین ، لەهەمان کاتا خوا ئەیزانی دووڕووەکان چ شتێ لەدڵیانایە.

﴿ إذ همت طائفات منكم ان تفشلا ﴾ خوا زانی کاتێ دوو هۆز لەئێوە خە فەتبار بوون و ترسان کەلاواز بن و سەرنەکەون لەجەنگدا ، ئەو دوو هۆزە بریتی بوون لەبەنو

سەلەمەی سەر بەهۆزی خەزرەج و لەبەنوحاریسەی ســەر بـەهۆزی ئـەوس کـە دووبـالّی لەشکرەکەبوون .

﴿ واللە ولیهما ﴾ وەخوا یاریدەدەری ئەو دووهۆزە بوو بۆ پاراستنی لەپەیڕەوی کردنـی ئەو شتەی هات بەدڵیانا ، دوایی لاواز نەبوون و هەڵنەهاتن لەگۆڕەپانی جەنگدا .

﴿ وعلی اللە فلیتوکل المؤمنون ﴾ وەئەبێ هەر لەسەر خوا باوەڕداران پشــت ببەســتن و بەتەمای کەسی تر نەبن و هەر خوایان بەسبێ .

ئەو ئایەتە و چەند ئایەتێ تر هاتونەتە خـوارەوە لـەبارەی جـەنگی ئوحـودەوە ، ئوحـود کێوێکە زۆرتر لەسێ میل لەمەد ینەوە دوورە ، جەنگی ئوحود لەپاش جەنگی بـەدر ڕووی دا ، لـەجەنگی بــەدردا زۆربـەی پیـاوە گـەورەکانی بـت پەرستـانی عـەرەب بـە دەسـتی موسوڵمانان کوژرابوون ، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لەپاش نوێژی هـەینی چـووە دەرەوە بـۆ کێـوی ئوحود ، سەرۆکی دووڕووەکان عەبدوڵای کوڕی ئوبـەی بەسـی کەسـەوە گەڕانـەوە بـۆ مەدینە و پێغەمەریان بەجێ هێشت . حەوت سەد نەفەر لەگەڵ پێغەمــەر مانـەوە، دوو بـاڵ لەهۆزەکانی خەزرەج و ئەوس ویستیان واز لەپێغەمەر بهێنن . بەڵام خوا میهرەبانی لەگەڵ کردن و لەویستی خۆیان پەشیمان بوونەوە . پێغەمە ر ﴿ﷺ﴾ نەخشەی جەنگی بۆ کێشـان بەم جۆرەیە : تیر هاوێژەکان لەپشت لەشکرەکەوە سەنگەر بگرن و ژمارەیان پـەنجا کـەس بوون ، بەسەرۆکایەتی عەبدوڵای کوڕی جوبەیر ، پێغەمەر فەرمانی پێدان جێگـەی خۆیـان چۆڵ نەکەن ئێمە سەرکەوین یان نە . جەنگ گەرمەی سەند و بـت پەرستـان زۆریـان لێ کوژرا ، موسوڵمانان دەستیان کرد بەکۆکردنەوەی تالآن ، تیر هاویژەکان کە چاویان بـەو ڕووداوە کەوت شوێنەکانی خۆیان چۆڵ کرد بەدژی فەرموودەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ جگە لـە (١٠) کەس هیچ کەسی تر لای سەرۆکەکەیان نەمایـەوە ، لـەو کاتـەدا خـالیدی کـوڕی وەلید بەو کارەی زانی و ڕێگەی پــێ گرتـن و هـەموو تـیر هاوێژەکـانی کوشـت ، بـت پەرستان کەلە کردەوەی خالید ئا گادار بوون ســەر لـەنوێ خۆیانیـان کـۆ کـردەوە و ، پەلاماری موسوڵمانانیان دا و نزیکی پێغەمەر بوونــەوە ، بـەجۆرێ بـەردی بـت پەرسـتان

ددانێکی پیرۆزی پێغەمەریان شکاند دەم و چاوی پێغەمەریان بریندار کرد ، موسوڵمانان هەموویان هەڵهاتن ، پێغەمەریان بەجێ هێشت مەگەر ژمارەیەکی کەمیان ، بت پەرستان (١٢٢) کەسیان لێ کوژرا . موسوڵمانان (٧٠) حەفتا کەسیان لێ کوژرا .

بەڕاستی جەنگی ئوحود تاقی کردنەوەیەکی زۆر گرنگ بوو کە موسوڵمانان جارێ تر لەفەرموودەی پێغەمەر دەرنەچن ، پاش ئەوەی موسوڵمانان لەجەنگی ئوحود شکان خوای مەزن جەنگی بەدریان بیرئەخاتەوە کەلەو جەنگەدا سەرکەوتووبوون هەتا موسوڵمانان بۆیان دەرکەوت هۆیەکانی سەرکەوتن و شکان چین و چ شتێکن ؟ تەمێ خوار بن و خۆیان هەڵنەکێشن و بزانن هەمو شتێ بەدەستی خوایە و ئەفەرموێ :

وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَـٰثَةِ ءَالَـٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ بَلَىٰٓ ۚ إِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَـٰذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ ءَالَـٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ ۗ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١٢٦﴾ لِيَقْطَعَ طَرَفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَوْ يَكْبِتَهُمْ فَيَنقَلِبُوا۟ خَآئِبِينَ ﴿١٢٧﴾

﴿ ولقد نصركم الله ببدرٍ وأنتم أذلة ﴾ وه‌به‌ڕاستی خوایارمـــه‌تی ئێـوه‌ی دا لـه‌جـه‌نگی به‌دردا ، به‌در جێگه‌یه‌كه له‌نێوان مه‌كـه و مه‌دینـه‌دا و نێـو نـراوه بـه‌ناوی بیرێكـه‌وه لـه‌و جێگه‌یه‌دا كه به‌دری كوڕی كه‌لده كه‌ندویه‌تی و ئێوه له‌و كاته‌دا لاواز و بێ هـێز بـوون ، ژماره‌تان كه‌م بوو له‌چاو دوژمنانی خۆتانا ، له‌و كاته‌دا دووررووه‌كان گه‌ڕانه‌وه بۆ مه‌د ینه.

﴿ فأتقوا الله لعلكم تشكرون ﴾ دوایی ئێوه له‌خوا بترسن ، به‌ژماره‌ی زۆری دوژمنان و گه‌ڕانه‌وه‌ی دوڕووان بۆ مه‌دینه مه‌كه‌ونه گومانه‌وه ، ئێوه‌سو پاسی خـوا بكـه‌ن بـۆ ئـه‌وه‌ی كه‌له‌خوا ترسان خوا یارمه‌تیتان بدا و سه‌تان خا به‌سه‌ر بێ باوه‌ڕاندا .

خوای مه‌زن به‌و ئایه‌ته بیری موسوڵمانان ده‌خاته‌وه چۆن یارمه‌تی دان له‌جه‌نگی بـه‌دردا بۆ ئه‌وه‌ی دڵیان به‌هێز تر بێ كه‌له‌و كاته‌دا ژماره‌تان زۆر كه‌م بوو وه‌خاوه‌نی هـێز و چـه‌ك نه‌بوون . چونكه ژماره‌ی موسوڵمانان (٣١٣) كه‌س بـوو ، جگـه له‌یـه‌ك ئه‌سـپ ولاغـی تریان پێ نه‌بوو ، ژماره‌ی بت په‌رستان نزیكه‌ی (٣٠٠٠) كه‌س بـوون و سـه‌د ئه‌سـپ و وولاغی تریان پێ بوو كه‌چی له‌و جه‌نگه‌ی به‌دردا بت په‌رسـتان له‌سـه‌رۆكه‌كانیان (٧٠) كه‌سیان لێ كوژرا و (٧٠) كه‌سیان لێ به‌دیل گیرا ، ئه‌وانی تر ترسان و له‌تر سا هه‌ڵهاتن.

ئه‌و ڕوداوه‌ی به‌در سه‌ركه‌وتنێكی گه‌وره و گرنگ بوو بۆ موسوڵمانان ، نه‌گبـه‌تی زۆر گه‌وره‌یشبوو بۆ بت په‌رستان ، ده‌نگێكی زۆر گه‌وره‌ی دایه‌وه له‌هه‌موو نیشتمانی عه‌ره‌بدا، مه‌به‌ست له‌و ڕووداوه‌ی به‌در ئه‌مه‌یه : خوای مه‌زن بۆیـان ڕوون ئه‌كاتـه‌وه كه‌سـه‌ركه‌وتن له‌جـه‌نگێ له‌جه‌نگـه‌كان به‌سـه‌ركه‌وتنی یـه‌كجاری دانـانرێ ، شـكاندنیش نابێتـه هـۆی شكاندنی یه‌كجاری ، ئـه‌بێ موسـوڵمانان بزانـن سـه‌ركه‌وتن له‌پاشـه‌ڕۆژدا هـه‌ر بـۆ ئـه‌و كه‌سانه‌یه‌خاوه‌نی ئارام و خۆڕاگـری بـن ، ئـه‌و ڕووداوه لـه جـه‌نگدا له‌هـه‌موو كـاتێكدا به‌ڵگه‌ن له‌سه‌ر ئه‌و ڕاستیانه‌ی باسمان كردن ، جارێ ئه‌م لا و جارێ ئه‌و لا سـه‌رئه‌كه‌وێ ، به‌ڵام پاشه‌ڕۆژ هه‌ر بۆ ئارام گرانه .

﴿ إذ تقول للمؤمنين ﴾ یارمه‌تی دانی خوای مه‌زن بۆ ئێوه له‌و كاته‌دا بوو تۆ موحه‌مه‌د ﴿ﷺ﴾ ووتت به‌باوه‌ڕداران بۆ به‌هێز كردنی دڵیان كه‌لاوازی خۆیانیان ده‌بڕی بـۆ جـه‌نگ كردنیان له‌گه‌ڵ بت په‌رستان :

﴿ ان لن یکفیکم أن یمدکم ربکم بثلاثة آلاف من الملائکة منزلین ﴾ ئایا بەس نیە بۆ ئێوە لەنرخی خۆڕاگرتنا لەو کاتە واتان ئەزانی ئێوە لاوازن و سەرناکەون و دوژمنتان بەهێزن و ژمارەیان زۆرە کەپەروەردگاری ئێوە یارمەتیتان بدا لەوکاتە ناسکە و تەنگیەدا ئێوە لەنێویا ئە ژیان بە سێ هەزار سوار لەفریشتەکان بنێرێتە خوارەوە لەئاسمان بەفەرمانی خوا .

بەر لەوەی جەنگ دەست پێ بکا لەبەدردا ، خوا بەڵێنی دا بەموسوڵمانان بۆ پتەو کردنی هورەیان و خۆ ڕاگرتنیان ، خۆیان بەخاوەنی سەرکەوتنی پاشەڕۆژ بزانن بەهۆی یارمەتی خوای مەزنەوە .

﴿ بلی ﴾ بەڵێ بەسە بۆ ئێوە ئەو یارمەتی‌یە بەژمارەی ئەو فریشتانە ، لەپاشا خوا بەڵێن ئەدا بە موسوڵمانان بەیارمەتی دانی زۆر تر لەسەر خوا ترسان و ئارام گرتنیان ، هانیان ئەدا بۆ بەهێزکردنی دڵیان ، دوایی ئەفەرموێ :

﴿ إن تصبروا وتتقوا ویأتوکم ﴾ ئەگەر ئێوە ئارام بگرن لەسەر جەنگ و لەخوا بترسن و بت پەرستان بێنەوە بۆ لای ئێوە و بیانەوێ جەنگتان لەگەڵ بکەن .

بت پەرستان کەبیستیان پێغەمەر﴿ﷺ﴾ و هاوڕێکانی ڕێگەیان بەکاروانەکەیان گرتووە و زیانی زۆریان لێ داون ، بت پەرستان ڕقیان هەڵسا و ویستیان بچنەوە بۆ جەنگ لەگەڵ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ و هاوڕێکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کە ئەو هەواڵەیان بیست ترسان ، خوا فەرمووی :

﴿ من فورهم هذا یمددکم ربکم بخمسة آلاف من الملائکة مسومین ﴾ ئەگەربت پەرستان هاتنەوە بۆ سەر ئێوە کوتو پڕ دوای هاتنەوەیان هەر ئەوکاتە خوا یارمەتی ئێوە ئەدا بەپێنج هەزار لە فریشتەکان نیشانەدار کراون بەجۆرێ دەرئەکەوێ ئامادەکراون بۆ جەنگ .

خوای مەزن بەڵێنی دا بەموسوڵمانان یارمەتیان ئەدەم بەسێ مەرج : خۆتان ڕاگرن ، بترسن لەخوا ، هاتنەوەی بت پەرستان بۆ جەنگ لەگەڵ ئێوە ، ئەوەبوو بت پەرستان نەگەڕانەوە بۆ جەنگ کەواتە موسوڵمانان پێویستیان بەیارمەتی زۆری فریشتەکان نەبوو.

ئەو ئایەتانە بەڵگەی بێ گومانن خوای مەزن یارمەتی موسوڵمانانی داوە لەهەندێ جەنگدا بەفریشتەکان . موسوڵمانان بەجیاوازی لەسەر ئەوەن کە خوا لەجەنگی بەدردا فریشتەکانی نارد بۆ یارمەتی دانی موسوڵمانان ، بەڵام لەیارمەتی دانیان لەجەنگی ئوحوددا بیریان جیاوازە .

بەوجۆرە پێویستبێ ئێمە نازانین ئەو یارمەتی دانەی فریشتەکان چۆن بووەو وبەچ شێوەیە بووە ؟ پێویست نی‌یە لەسەرمان هەڵپەی بۆ بکەین ، بەڵام ئەبێ باوەڕی پتەومان هەبێ بەو یارمەتی‌دانە ، ئیتر بەهەر شێوەیە بێ چونکە ، بەڵگەی بێگومان هەیە لەسەر ئەمە کە فریشتەکان لەسەر شێوە ی ئادەمیزاد خۆیانیان نواندووە ، وێنەی میوانەکانی ئیبراهیم و میوانەکانی لوت و هاتنی جبرەئیل بۆ خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لەوێنەی دوحیەدا ، خۆنیشاندانی جبرەئیل بەمەریەم لەشێوەی مرۆڤێکا ، دروستیشە کەفریشتەکان یارمەتی موسوڵمانان بدەن بەرێگەیە جگەی جەنگ .

پرسیار / خوای مەزن لەئایەتی (٩) ی سورەتی ئەنفالدا ئەفەرموێ ، یارمەتی ئێوە ئەدەم بەهەزار نەفەر لەفریشتەکان کۆمەڵ لەدوای کۆمەڵ ، لەئایەتی (١٣٤) ی ئەم سورەتەی ئالی عیمراندا ئەفەرموێ یارمەتیتان ئەدەم بەسێ هەزار فریشتە لەئاسمانەوە نێردران ، لەئایەتی (١٣٦) دوای ئەو ئائیەتە ئەفەرموێ یارمەتیتان ئەدەم بەپێنج هەزار لەفریشتەی نیشانە کراو ، ئایا یەکەم جار خوا یارمەتی داون بەهەزار ، پاشا بەسێ پاشان بەپێنج ، هەتا هەموویان بکەنە نۆ هەزار ، ئایا ئەوە چۆن بووە ؟

وەڵام / خوای مەزن یەکەم جار یارمەتی موسوڵمانانی دا بەهەزار ، پاشان بەدوو هەزاری تر گەڕان بەسێ هەزار ، لەپاشا دوو هەزاری تر ، هەموویان ئەکەنە پێنج هەزار ، هەندێ لەزانایان ووتویانە بێ باوەڕان لەجەنگی بەدردا هەزار نەفەربوون ، دووایی یارمەتی دان بەهەزار فریشتە ، لەجەنگی ئوحودا بت پەرستان سێ هەزار بوون ، بۆیە خوای مەزن سێ هەزار فریشتەی نارد ، هەتا لەهەردوو جەنگەکەدا هەردوو لا لەبێ باوەڕان و

لەموسوڵمانان ژمارەیان وەك یەکیان لیٚ بیٚ وەئەگەر بیٚ باوەڕان بهاتنایەتەوە بۆ جەنگ خوا یارمەتی موسوڵمانانی ئەدا بەپیٚنج هەزار و کوتوپڕ نەگەڕانەوە بـۆ جـەنگ هـەتا یارمـەتیان بدریٚ بەپیٚنج هەزار .

﴿ وما جعله الله إلاّبشرى لكم ولتطمئن قلوبكم ﴾ وەخوا نەی گیٚڕاوە ئەو بەڵیٚنە و ئەو یارمەتی دانە بەهیچ شتیٚ مەگەر موژدانە بۆ ئیٚوە بەسەرکەوتنی ئیٚوە بەسەر دوژمنانتاندا ، بۆ ئەوە دڵی ئیٚوە ئارام بگریٚ و ئیٚوە نەترسن لەژمارەی زۆری دوژمنانتـان و کـەمی ژمـارەی خۆتان .

﴿ وما النصر إلاّ من عند الله العزيز الحكيم ﴾ وەیارمـەتی دان و سـەرکەوتن پـەیدانابیٚ مەگەر لەلایەن خوای گەورە و بەدەستەڵاتەوە نەبیٚ ، هەموو شتیٚ لەجیٚگەی شیاوی خۆیـا دائەنیٚ لەسەر کەوتنی کەسانیٚ بیەویٚ و شکانی کۆمەڵیٚ ئارەزووی هەبیٚ ، ژمارەی زۆر و چەك لای خوا دەورنابینیٚ .

﴿ وليقطع طرفاً من الذين كفروا أو يكبتهم فتنقلبوا خائبين ﴾ وەبۆ ئـەوە ئـەو یارمـەتی دانە بەو قرەیشتانە لەناو بباو بنەبڕ بکا تاقمیٚ لەو کەسـانەی ئـەوتۆ باوەڕیـان نـەهیٚناوە ، یاسەرنگونیان بکا و ئابڕویان ببا ، دوایی بگەڕیٚنەوە بۆ جیٚگەی خۆیان و بەئاوات نەگـەن ، جاریٚ تر بەتەمای گەڕانەوە نەبن .

موسوڵمانان گومانیان وابوو کە پیٚغەمەر ﴿ﷺ﴾ خاوەنی توانایە و سـەرئەکەویٚ بەسـەر بت پەرستانا ، شکان و زۆریان کوژران و بەدیل کران ، وایشیان ئەزانی پیٚغەمـەر توانـای شکانی بیٚ باوەڕانی هەیە بەتەنها ، خوای مـەزن پـاڵی نـا بەگومانەکەیانـەوە و ئەفـەرمویٚ هەموو کاریٚ بەدەستی خوایە ، قورئانی پیرۆز لـەزۆر جیٚگـەدا ئـەو فەرموودەیـەی بـاس کردووە کە پیٚغەمەر ﴿ﷺ﴾ پیشەی موژدەدان و ترساندنی ئادەمیزادە و بەس ، فەرمانەکانی خوا ڕائەگەیەنیٚ بەوان و ئەفەرمویٚ :

لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٩﴾

﴿ ليس لك من الأمر شيء ﴾ موحەمەد بۆتۆ نیيە هیچ شتێ لە کـارو کـردەوەی بـێ باوەڕان و چارە نوسیان ، سەرکەوتن و لەناو بردن و بنەبڕکردنی ئەوان بەدەستی منە ، تـۆ بەندەی منی و ڕەوانەم کردووی بۆ موژدەدان و ترساندنی ئادەمیزاد و بەس .

﴿ أو يتوب عليهم أو يعذبهم فأنهم ظالمون ﴾ یاخوا بێ باوەڕان بنە بڕ ئەکا یا پە شیمان بوونەوە یان لێ وەرئەگرێ و لەوان ئە بورێ ئەگەر باوەڕ بهێنن ، یاخوا سزایان ئەدا ئەگـەر ئەوان بەردەوام بوون لەسەر بێ باوەڕی ، ئەوانـە هـەموویان پـەیوەندیان بـەتۆوە نیـيە و بەدەستی خوایە ، بۆیە خوا سزایان ئەدا ، چونکە ئەوان شایانی سزان بەهۆی ستەم کردنیان و بێ باوەڕیان .

﴿ ولله ما في السماوات وما في الأرض ﴾ وەبۆ خوایە شتێ لەنێو ئاسمانەکاندایە و شـتێ لەناو زەویدایە و لەسەرێتی ، خوا درو سـت کـەرو خاوەنیانـە ، کـارو فـەرمانیان ئـەو هەڵیان ئەسوڕێنێ .

﴿ يغفر لمن يشاء و يعذب من يشاء والله غفور رحيم ﴾ خوا خۆش ئەبێ لەهەر کەسێ ئارەزوی هەبێ و سزای کەسـێ ئـە دا ئـارەزوی هـەبێ و خـوا لێ خـۆش بوونـی زۆرە و خاوەنی میهرەبانی و بەزەییە بۆ کەسانی پەشیمان ببنەوە .

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو دوو ئایەتەی پێشوو ئەمەیە : لەو کاتەدا پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ و هاورێکانی تووشی ئازار و کوشتن بوونایە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەیویست لەخزمەت خوادا بپارێتەوە کەبی باوەڕان بنەبڕ بکا ، خوای مەزن ئەو دوو ئایەتەی ناردە خوارەوە .

کاتێ کە باسی جەنگ و پاراستنی نیشتمان کرا ، باسی هاندانی ئادەمیزاد کرا بۆ خۆڕاگرتن و ئارام لەجەنگدا ، خوا بەڵێنی پێدان سەرکەوتنی پاشەڕۆژ بۆ موسوڵمانانە ، یارمەتی دانیش لەلایەن خواوە بەگوێرەی و یستی خۆیەتی ، جگەی باوەڕ بەوشتانە سەرلێ شێوان و لەخۆ بایی بوونە ، پاش ئەوانە دووبارە دەست ئەکرێ بەباسکردنی ئەو شتانە بنچینە و ڕیشوون بۆ بەردەوام بوونی ئەو شتانەی ڕابووردن ، ئەوەیش بریتی‌یە لە چاودێری کردنی ئابووری نیشتمان و پەرەپێدانی دارایی ئادەمیزاد بپارێزرێ هەتا بەئاسانی دانیشتوان بیان خەنە گەڕ بۆ پەیدا کردنی بەرهەم و پەرەپێدانی ، بتوانرێ دابنرێ بۆ سوودی گشتی و بۆ سوودی هەژاران و بێ نەوایان ، ئەو داراییە ببێتە هۆی ڕەوشتی بەرز و ئارام گرتن و خواردنەوەی ڕق و کینە و لێ بووردن لەنێوان هەموو ئادەمیزادا بۆ ئەو مەبەستە خوا ئەفەرموێ :

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا الرِّبَا أَضْعَافًا مُّضَاعَفَةً ۖ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٣٠﴾ وَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴿١٣١﴾ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٣٢﴾ ۞ وَسَارِعُوا إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾

﴿ یاأیها الذین آمنوا لا تأكلو ألرّبا أضعافاً مضاعفة ﴾ ئەی كە سانێكی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە ئێوە سود مەخۆن ، یانی سود وە رمەگرن لەهەموو شتێكا بۆ خواردن بێ یا بۆ شتی تر بێ بەهەموو جۆرەكانی سوودەوە ، بەخستنە سەری قازانجی دارایی خۆتان و زۆر كردنی و دووپات كردنەوەی جار بۆ جار ، ئەو فەرمودەی خوایە و لەوەوە هاتووە دانیشتوانی پێش ئیسلام كڕین و فرۆشتنیان لەگەڵ یەكتری بكردایە بەقازانجێكی دیاری كراوو بۆ ماوەیە ، ئەو ماوەیە كۆتایی پێ بهاتایە و قەرزارەكە پارەكەی بۆ هەڵنە سوڕایە ماوەكەیان زۆر ترئەكرد لەگەڵ زۆركردنی قازانجەكە ، بۆنمونە : مرۆڤێك شتێكی بفرۆشتایە بە بیست دینار بەماوەی بیست مانگ ، كاتێ ماوەكە دوایی بهاتایە و نەگونجایە قەرزەكە بدرێتەوە ، خاوەن قەرزەكە ماوەی ئەكرد بەبیست و پێنج مانگ ە پارەكە یشی ئەكرد بە بیست و پێنج د ینار ، هەروەها بۆ چەند جارێ ئەو كارە خراپەیان ئەكرد هەتا وای لێ ئەهات قەرزارەكە بەهیچ كلۆجێ پارەكەی بۆ نەئەدرایەوە ، بەو بۆنەوە دانیشتوان تووشی زیانی بێ ژمارە ئەبوون ، بۆیە خوای مەزن و بەمیهرەبان ئەو كارە نالەبارەی لەنێو موسوڵمانانندا هەڵگرت و قەدەغەی كرد . لەئایەتی (٢٧٥) ی سورەتی ئەلبەقەرە باسی سوود وەرگرتن بەدرێژی و بەهەموو جۆرە قەدەغە كراوەكانی كراو ئەتو انرێ سەرێ لەوێ بدەن .

﴿ وأتقوا الله لعلكم تفلحون ﴾ وەئێوە لەخوا بترسن لەو شتانەی قەدەغە كراون ، بەتایبەتی وەگرتنی سوود و بەكارهێنانی و مامەڵە پێ كردنی ، بۆ ئەوەی ئێوە ڕزگارتان ببێ لەسزای خوا . ئاینی ئیسلام ئەیەوێ كۆمەڵێكی موسوڵمانی پاك و دەروون خاوێن و ڕەوشت پاك پێك بێ و چاودێری ئابووری وڕامیاری بكرێ بەشێوە یەكی شایستە ، كەسانێ لەخوا و لەئاگری دۆزڤەخ بترسن چۆن سوود وەرئەگرتن و ئە یكەن بەپیشەی خۆیان ، تاقمێ سوود بەكار بهێنن چۆن لەجەنگی دوژمنانیانا سەر ئەكەون ؟ ئێوەی موسوڵمان چۆن بەئاواتی خۆتان ئەگەن كە چی ڕێگەی ژیان و یاسای خۆتان ئەناسن و

موسوڵمانان بەگشتی پێك هاتوون لەسەر ئەمەی سوود وەرگرتن کەم بێ یا زۆر قەدەغەیە، بەوێنەی هەموو قەدەغەکراوەکانێ تر بەبێ جیاوازی لەنێوان سوود و گوناهەکانی تردا ، بە لاّم باوەڕ بەخوا و وەرگرتنی سوود و کارکردن بەپەیڕەو پرۆگرامی سوود لەدەرونێکا هەردوو لایان کۆنابنەوە .

بەکارهێنانی سوود یەکێکە لەگوناهە زۆر گەورەکان ، لێرەدا باسێکمان هەیە پێویستە شی بکرێتەوە ئەویش ئەمەیە : ئەگەر کەسێ ناچار بوو بۆ وەرگرتنی سوود لەیەکێ تر و جگەی لای ئەو کەسە بۆی پەیدا نەئەبوو پێویستە خاوەن دارایی بەنرخی خۆی و بەبێ سوود بفرۆشێ بەو مرۆڤە داماوە و ناچارە ، هەژارەکەیش بەگوێرەی توانای خۆی بەزۆرتر لەنرخی خۆی وەری نەگرێ .

ئەو سوودانەی لەبانکەکان و دەزگا و کارگە هاوبەشیەکان وەرئەگیرێ قەدەغەن بۆهەردوولایان و بەشێکن لەمامەڵە بەسوود کەم بێ قازانجەکە یا زۆربێ ، بەلاّم ئەگەر ناچاری زۆری بەهەژارێ هێنا قەرز بکا لەو بانك و دەوزگایانە و بەبێ سوود نەیان ئەدانێ، کاربەدەستانیش بەرگریان لەو سوود خواردنە نەئەکرد ، یا خۆیان لەوانبوون ، ئەو هەژارە بۆی دروستە بەگوێرەی ناچاری خۆی قەرز لەوان بکا ، لەوکاتەدا خراپە و گوناهی ئەو کارە لەسەر ئەوانە بەتایبەتیو لەسەر کاربەدەستانە بەگشتی ، چونکە پێویستە لەسەر کاربەدەستان هەموو پێویستی دانیشتوان جێبەجێ بکەن و هەموو جۆرە ژیانیان بۆ ئاسان بکەن ، ئەوانەیش بەپەیڕەوی یاسای خوا ئەبێ و بەدەستووری پێغەمەر(ﷺ) ، بۆیە خوا ئەفەرموێ :

﴿ وأطیعوا الله والرسو ل لعلکم ترحمون ﴾ وەئێوە فەرمانبەرداری خوابن لەهەموو فەرمانەکانیدا، ئیتر ڕەواکانیان بن یاقەدەغەکراوەکانی ، هەریەکەیان بەگوێرەی یاسای خۆیان ، فەرمانبەرداری پێغەمەر بن ، هەر شتێکی بەئێوەڕاگەیاند فەرموودەی خوان جێبەجێی بکەن ، بۆ ئەوەی میهرەبانیتان لەگەڵ بکرێ .

یاسا و دە ستوری جەنگ کردن لەگەڵ دوژمنان فێر نەبن ؟ زۆر ئاشکرایە ئــەوەیش پێـك نایە بەبێ دارایی و داراییش پەرەناســێنێ بـە بـێ پیشەسازیوکشـتوکاڵ و بازرگـانی و نیشتمان ئاوەدان کردنەوە ، لەهەمان کاتا خاوەن سامان هــەژاران بچەوسـێننەوە بـەهۆی سوودەوە بیان خنکێنن و کەلەبچەیان بکەن و بەو بۆنەوە جوڵانەوەی پیشەسازی و کشت و کاڵ بووەستێ ، دوژمنان بەهەلی بزانن و پەلاماریان بدەن و بیــان کـەن بـەژێر دەسـتەی خۆیان ، ئەو کاتە موسوڵمانان بەتایبەتیو ئـادەمیزاد بەگشـتی نـەزانن چ شـتێکیان بەسـەر هاتووە ، لەبەر ئەوانە و چەند نەگبەتی تر و کۆیلــەیی تووشـی ئـادەمیزاد ئـەبێ بـەهۆی سوودەوە ، بۆیە برِوایان بەیەکتری نامێنێ و کینە و رِق بۆ یەکتر پەیدا ئەکەن ، هـەموویان بۆ دژی یەکتر خۆیانیان مەڵاس داوە و لەناکاودا ئاگری جەنگ پەرە ئەسـێنێ و خۆیـان و بەرهەمو دەستکەوتیان ئەسووتێنێ ، جگە لەداگیر کە ران و خوێن مژان کەسی تر قـازانج ناکا .

خوای مەزن لــەو ئایەتـەدا و لەچـەندین ئایـەتیتردا ئـەو کـارە نادروسـتانەی قەدەغـە کردووە ، بەتایبەتی بەکار هێنانی سوود و فرۆشتنی خواردەمەنی بەنرخی ز ۆرتـر لـەنرخی خۆی ، هەرِەشەی زۆر توندی بۆ ئەو خاوەن پیشانە ئاراستە کردووە .

کاتێ ئەو دە ستورە بەرِێزانەی قورئان کەمتر لەئادەمیزاد ئەیزانن و دوایـی بۆیـان رِوون کرایەوە بەتایبەتی زیانی بەکارهێنانی سوود ، خوای گەورە باسی شـتێکمان بـۆ ئـەکا کـە هەموو ئامیزاد بیزانن و لەخوا بترسن ، ئەفەرموێ :

﴿ وأتقوا النار التي أعدت للكافرين ﴾ وەئێــوە بترسـن و خۆتـان بپـارێزن لـەئاگرێکی ئەوتۆ ئامادەکراوە بۆ بێ باوەرِان بەتایبەتی بۆ گوناهباران و دەست بۆش لەتوێشوی چاکـە بەگشتی ، بۆ بێ باوەرِان بەبەردەوامی و بـۆ گوناهبـاران بـۆ ماوەیـەکی تایبـەتی و تـەمێ کردنیان . بێگومان بەکار هێنانی سوود بەهەموو جۆرەکانیـەوە قەدەغەیـە ، بەتایبـەتی ئـەو بەشەیان بۆ چەند جاری قازانجی قەرزەکان زۆر تر بکرێ وەك لــەو ئایەتـەدا باسـی کـرا ،

ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر دووفەرمانی زۆر گرنگ : (١) بەکارهێنانی مامەڵەی سوود سەرپێچی‌یە لەفەرمانی خوا و پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ . (٢) ئەو کەسەی سەرپێچی لە فەرمانی خوا و پێغەمەر بکا بێ بەشە لەمیهرەبانی و بەزەیی خوا .

پاش ئەوەی خوا فەرمانی دا بەقەدەغەکردنی سوود هەڕەشەی کرد لەئادەمیزاد بەسزادانیان بەئاگر ، داوای لەوان کرد پەیڕەوی فەرموودەکانی خوا و پێغەمەر بکەن ، دوای ئەوانە فەرمان ئەدا بەپەلە کردن بۆ لا ی لێبوردنی پەروەردەکەری خۆیان و بۆلای کردنی چاکە کردن و ئەفەرموێ :

﴿ وسارعوا إلى مغفرة من ربكم ﴾ وەئێوە پەلە بکەن بۆلای هۆی لێ خۆشبوون لە لایەن پەروەردەکەری خۆتان ، بەهۆی باوەڕهێنان بەخوا و پێغەمەر و بەجێ هێنانی پێویست کراوەکان و ، بەتایبەتی پەلەکردنتان بۆلای کردنی نوێژەکانتان بەکۆمەڵ و گەیاندنی خۆتان بەڕیزی یەکەمی نوێژ بەکۆمەڵ .

﴿ وجنة عرضها السماوات والأرض اعدت للمتقين ﴾ وەبەپەلە بکەن بۆلای بەهەشتێ پانایی ئەو بەهەشتە بەئەندازەی تیرەی ئاسمانەکان و زەوی‌یە ، ئەندازەی پانی ئەو بەهەشتە ئەوەندە بێ ئەندازەی درێژی‌یەکەی مەگەر هەر خوا بیزانێ . ئەو بەهەشتە ئامادەکراوە بۆ ئەو کەسانە لەخوا ئەترسن و خۆیان ئەپارێزن لە گوناە گەورەترین چاکەیش بۆ ئادەمیزاد میهرەبانی‌یە لەگەڵ یەکتری بەبەخشینی دارایی بەبێ سوود و بەبێ قازانجی زۆر هەر لەبەر خوا .

خوای مەزن با سی ئەو کەسانە ئەفەرموێ کەخاوەنی پێنج ڕەوشتی زۆر بەرزن کەشایانی ڕێزی ئادەمیزادن لای خودا ، بگرە لای ئەو کەسانەیش باوەڕیان بەپاشەڕۆژ نەبێ ، ئەو ڕەوشتە بەرزانە ئەمانەن خوالەم ئایەتەدا ئەفەرموێ :

ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلْكَٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣٤﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلُوا۟ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَجَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴿١٣٦﴾

﴿ الذين ﴾ کەسانێکی ئەو تۆ لەخوا ئەترسن و خۆیان ئەپارێزن لەبێ فەرمانی ئەو کەسانەن ئەم پێنج ڕەوشتەیان هەبێ :

١- ﴿ ینفقون في السراء والضراء ﴾ داریی خۆاین ئەبەخشن بەهەژاران و بێ نەوایان لەهەرزانی و لەگرانیدا ، لەساماندارێتی و لەهەژاریدا ، لەخۆشی و لەترشیدا ، بەسامانەکانیان لەخۆیان بایی نابن و رژدیان ناکا ، هەژاری ئازاریان نادا و بەبەشی خوا ڕاز ین چۆنیان بۆ جووت ببێ دەستی هەژاران ئەگرن .

٢- ﴿ والكاظمين الغيظ ﴾ وەرق و تووڕەیی خۆیـان ئەخۆنـەوە و قوتـی ئـەدەن لـەكاتی توانادا ، ئەبێ بزانرێ هیچ شتێ بەڵگەدار ترنی‌یە لەسەر بتەوی باوەڕ بەخوا و زۆری ئـەقڵ بۆ ئادەمیزاد لەخواردنەوەی ڕق و تورەیی ، ئەو ڕەوشـتە هەرچـەندە هـەندێ جـار تـاڵ و ناخۆش و گرانە لەسەر شانی ئادەمیزاد . بەڵام زۆر جـاران ئـەیكا لـەزۆرترین ڕووداویـی نالەبار و خراپ .

٣- ﴿ والعـافين عـن النـاس ﴾ وەچـاو پۆشـی ئەكـەن لەهـەندی خراپـەی ئـادەمیزاد و دانیشتوان ، بەتایبەتی لەو كە سانە خراپەیان لەگەڵ كردوون ، چاو پۆشی كردن لەخراپـە زۆر گەورەترە لەخواردنەوەی ڕق و تووڕەیی ، چونكە وائـەبێ ئـادەمیزاد زۆر جـار ڕقـی خۆی ئەخواتەوە لەبەر سوودێكی تایبەتی خۆی و دوور بكەوێتەوە لەپـەیدا بوونـی گـیرو گرفت بۆ خۆی . بەڵام چاو پۆشی لەگوناهی ئادەمیزاد چاكەكردنی ڕووتە بۆیان .

٤- ﴿ والله يحب المحسنين ﴾ وەخوا چاكەكەرانی خۆش ئەوێ و دۆستی ئەوانە ، چاكترین چاكە كردن ئەمەیە لەگەڵ ئەو كەسانە بكرێ خراپەت لەگەڵ بكەن ، چاكـەكردن پـەیدا ئەبێ بەهۆی شتێ سوود بەخشبێ ، ئیتر كەمبێ ئەو شتە یازۆربێ.

٥- ﴿ والذين إذا فعلوا فاحشة أو ظلموا أنفسهم فاستغفروا لذنوبهم ﴾ وەكەسانێكی ئـەو تۆن هەركاتێ خراپ و بێز لێ كراوەیان كردبی لەهەموویان خراپتر بێ بـاوەڕی و دەسـت درێژی بۆ سەر مافی دانیشتوان ، یا ستەمیان لەخۆیان كردبێ بەهۆی بێ فـەرمانی خـواوە لەبەرئەوەی پاداشتی پاشەڕۆژیان لەكیس نەچێ ، دوایی داوای لێ خۆشبوون لەخوا ئەكەن لەبەر ئەو گوناهانە كردوویانە ، ئیتر گوناهەكان گەورە بن یـا بچـووك لێ بووردنیـان بـۆ هەیە بەمەرجێ داوای لێ بـووردن بكـەن و نیازیـان وا بـێ جـارێ تـر نەچنـەوە بـۆ لای گوناهەكان بەدەستیان قەس .

﴿ ومن يغفر الذنوب إلاّ الله ﴾ وەچ كەسێكە خۆش ئـەبێ لەگوناهـەكان مەگـەر هـەر خوا؟ بێگومان ئەو كەسە هەر خوایە بەتەنها .

﴿ ولم يصروا على مافعلوا وهم يعلمون ﴾ بەڕاستی خوا خۆش ئەبێ لەکەسێ واز لەگوناه بهێنێ بەلاّم کەسانێ وازیان نەهێنابێ و بەردەوام بن لەسەر گوناه و ئەوان بزانن بەوە کە گوناهە خوا لێیان خۆش نابێ . بەلاّ م کەسێ گوناهێکی خراپ بکا و نەزانێ خراپە ئەو کەسە خاوەنی بیانووە .

﴿ أولئك جزاؤهم مغفرة من ربهم وجنات تجري من تحتها الأنهار خالدين فيها ونعم أجر العاملين ﴾ ئەو کەسانەکاری خراپیان کردووە یا ستەمیان لەخۆیان کردووە و داوای لێ بووردن ئەکەن بۆ گوناهەکانیان و بەردەوام نابن لەسەریان پاداشتەکانیان لێ خۆش بوونە لای پەروەردەکەری خۆیان وەپاداشتی تریان چەندین بەهەشتە ئەچێ بەژێر درەختەکانیاندا چەندین ڕووباری ئاوی شیرین و بەتام بەردەوام ئەبن لەنێوانیاندا و ، چاکە کرێ و پاداشتی کرێکاران و خواپەرستان .

قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾ هَـٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٨﴾

لەمەوبەر خوای مەزن باسی جەنگی ئوحودی کرد بۆ موسوڵمانان کە لەو جەنگەدا شکان ، چونکە بەفەرمانی پێغەمەر هەڵنەسان و پشتی پێغەمەریان چۆڵ کرد ، ئێستایش باسی بەسەرهاتی گەلانی ڕابووردومان بۆ ئەکا ، کەستەمکار بوون و لەناو چوون ، مێژوویش لاپەڕەی ڕەشی ئەوانی نووسیوە ، پێویستە هاوڕێکان و پەیڕەوانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بۆ جارێ تر بێ فەرمانی پێغەمەر نەکەن ، هەرچۆنێ بێ ئەگەر بێ فەرمانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بکەن پاشە ڕۆژیان وەك گەلانی پێشوو لەناو ئەچن یا ئەشکێن و لاواز ئەبن ، خوا ئەفەرموێ :

﴿ قد خلت من قبلكم سنن ﴾ بەڕاستی ڕابووردووە و ڕۆیشتووە چەندین ڕوداوو دەستوری پەیڕەوکراو بۆنەتەوەکانی پێش ئێوە کە پێغەمەرەکانی خۆیانیان بەدرۆخستەوە و لەناوچوون و چەندین بیروباوەڕی جیاوزیان لەیەکتری پەیدا کردو پارچە پارچە بوون .

﴿ فسيروا في الأرض فأنظروا كيف كان عاقبة المكذبين ﴾ دوایی ئێوە بڕۆن و تەماشای سەرزەویی بکەن ، دوایی چۆن بوە پاشەڕۆ دواهاتی ئەو کەسانە پێغەمەرەکانی خۆیانیان بەدرۆخستەوە ، بێگومان پاشەڕۆژی هەموو بێ باوەڕان وێنەی ئەوکەسانەیە . لێرەدا ئەوەی پێویستبێ بزانرێ ئەمەیە : مەبەست لەگەڕان بەسەر زەویدا ئەمە نیە کەڕاستەوخۆ بگەڕێن بەسەر زەویدا ، بەڵکو مەبەست ئەمەیە : هەواڵی گەلانی ڕابووردوو بزانین و بیان ناسین بەهەر ڕێگە و بەهەر جۆرێ بێ ، هەتا تەمێ خرابین .

بێگومان ئەو شتانە سوود بەخشبی بۆ پیاوانی ژیر و تێگەیشتوو ئەمانەن : لەبەسەرهاتی گەلانی ڕابوردوو ڕووداویان بگەین هەتا بۆمان دەرکەوێ هۆی لاوازی ئەو گەلانە و هێز و سەرکەوتنیان چ شتێ بووە ؟ بۆ ئەوەی کار بکەنە سەر ئەو پیاوە ژیرانە و بەوان تەمێ خوار بن و ڕانموویی وەربگرن بۆ بەدەستهێنانی چاکەو سەرکەوتن بۆ خۆیان ، بۆیە خوا ئەفەرموێ :

﴿ هذا بيان للناس ﴾ ڕووداوی جەنگی ئوحود ، ڕووداوی بەسەرهاتی گەلانی ڕابووردو ڕوونکردنەوەیە بۆ هەموو ئادەمیزاد هەتا بەڵگەبێ لەسەر کەسێ بێفەرمانی خوای کردووە ، ئەو ڕووداوانە فێرمان ئەکەن ئەو کەسە بەشێوەیەکی پاك و بێگومان ئەو ڕووداوانەیان بەسەردا تێپەڕیبێ بوونەتە هۆی سەرکەوتنیان ، ئەو کەسانەیش ستەمکاربوون بەخرابی ئەو ڕووداوانەیان بەسەردا چووبێ تووشی زیان بوون بگرە لەناوی بردوون .

﴿ وهدىً وموعظة للمتقين ﴾ وەئەو ڕووداوانە ڕانموویی کەرن و ، ئامۆژگاری کەرن بۆ ئەو کەسانە لەخوا ئەترسن و هاندانیانە بۆ فەرمانبەرداری خوا و خۆیان بپارێزن لەگوناه هەر لەبەر ترسی خوا .

ئەو دوو ئایەتەی پێشوو بۆمان دەرئەخەن ئەو شتانەی ئەبنە هۆی جیـا بوونـەوەی خـوا پەرستان و یاخی بووان لەفەرمانی خـوا نـاوەڕۆكی ئـەو دووئایەتـەن ، بۆیـە پێویسـتە زۆر بەقوڵی لەڕووداوی گەلانی پێشوو ووردبینەوە .

لـێرەدا چـەند پرسـیار و وەڵامـەكانیان خۆیـان پێویسـت ئەكـەن كەپـەیوەندیان بـەو ڕووداوانەوە هەیە ، پێویستە باسیان بكەین :

پرسیار / باوەڕداران كەئەوپلە بەرێزەیان هەیە لای خوای مەزن ، بۆچـی لـەزۆر تریـن جەنگ و ڕوودا وا تووشی بەڵا و شكست ئە بن لـەگەڵ دوژمنانی خوا و خۆیانا و یارمـە تیان نادرێ ؟

وەڵام / ئـەو یاسـاو دەسـتوورانەی خـوا دای مـەزراندوون كـاری ئادەمیزادیـان پـێ هەڵئەسوڕی ، ئەو یاسایانە ئەممان نیشـان ئـەدەن جیـاوازی لـەنێوان بـاوەڕداران و بـێ باوەڕاندا نیە دەربارەی كارەساتی جیهان كەم جار نەبێ خوا یارمەتی هـەندێ لەپێغەمـەران ئەدا. بۆ نموونە ئەو كە سانە مەلەوانی ئەزانن ئەچنە نێو ئاوی دەریا و ڕوو بارەكان خۆیـان ئەكەن بە قوتاو جۆرەكانی مەلـە كردن بەكاردێنن ، پاش ماوەیە خۆیان ئەگەیەننـە كـەناری ئاسایش، ئیتر باوەڕداربن یا بێ باوەڕ ، بەڵام ئەو كەسانەی مەلەوانی نازانن ئە بنە نیشـانەی لەناو چوون و ئەكەونە ژێر ئاو و ئەخنكێن ، باباوەڕداریش بن و باوەڕیـان بـەتینبی ، ئـەو كەسانە خۆیان ئامادەناكەن و ئەچن بەگژ دوژمنانی خۆیانا بەبێ چەكی پێویست لـەو كاتەدا زۆر جاران بگرە هەموو جارێ ئەشكێن و ئەبن بەژێر دەستەی دوژمنیان و سەر ناكەون بـا ئەو پەڕی خوا پەرست بن ، ئەو كەسانەیش پاشەكشێ بكەن بەرانبـەر دوژمنـانی خۆیـان و خوا تووشی نەگبەتی ئەبن بەمەرجێ لەپێشەوە خۆیان ووریا نەكەنەوە ، بائەو پەڕی دۆسـتی خوا و ڕاست وێژ و كار دروستبێ ، بۆیە خوای مەزن لەئایەتی (٤٦) ی سورەتی ئـەنفالـدا ئەفەرموێ : ئەی موسوڵمانان ناكۆكی مەكەن لەنێو خۆتانا هە تا بەو بۆنەیەوە تووشی دوو دڵی بن و هێز و تواناتان پەرتەواز بێ و لەناو بچـن ، ئـارام بگـرن ، بـەڕا ستی خـوا لەگەڵ ئەو كەسانەیە خاوەنی ئارام بن .

کەواتە جێگەی سەرسوڕمان نی‌یە بێ باوەڕان سەرکەون بەهۆی چەکی زۆرەوە بەسەر باوەڕردارانا کەبێ چەك و پەرتەوازە بن.

پرسیار / لەپرسیار و وەڵامی پێشوودا بۆمان دەرکەوت کەبەڕاستی خوای مەزن بەشوێنی ئەو یاسا و دە ستورەی خۆیا ئەڕوا کەبەڕواڵەت بۆ ئادەمیزادی دیار کردووە لەگەڵ ئەوانەیشدا خوای مەزن بەبێ جیاوازی لەنێوان باوەڕدار و بێ باوەڕدا کارەساتی گران تووشی هەموو لایەکیان ئەبێ ، بۆنمونە شەهید کردنی زە کەریا و یەحیا و چەندین پێغەمەری گەلانی ڕابوردوو ، ئازاری نوح و ئیبراهیم و موسا و عیسا بەهۆی گەلەکەنیانەوە . . .

لەناوبردنی گەلی نوح بەلافاو ، گەلی هود لەناوچون بەبایەکی سەخت و بێ ئەندازە و بەردی وەك باران بەسەردا ڕێژان ، شاری گەلی لوتی ژێراوژوور کرد ، ئەگەر سزادانی ئادەمیزاد لەبەربێ فەرمانی خوابوایە ئەبوایە دانیشتوانی سەرزەوی لەم سەردەمەدا هەموویان بنە بڕبکرانایە ؟

وەڵام / ویستی خوای مەزن بۆ سزادانی ئەو گەلانە لەنێو هەموو ئادەمیزادا هۆیەکی تایبەتی‌یەو خوا ئەیزانێ ئێمە نایزانین ، هەموو شتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ و جێگەی پرسیار نی‌یە ئەو سزایانە دووپات ناکرێنەوە بۆ هەموکات و بۆ هەموو گوناهباران، ئەوەی شایانی باسبێ پێویستە لەسەرمان تووشی گومان و هەڵە نەبین .

پرسیار / لەبەر چ شتێکە ڕاستی و کاری چاك سەرناکەوێ لەهەموو کاتێکا کەچی خوا چاکە و چاکەکەرانی خۆش ئەوێ و داوایشیان لێ ئەکا ، کاری خراپ و خرا پەکەرانی لا پووچە و داوای نەکردنیان ئەکا ؟

وەڵام / ئەگەر ڕاستی لەهەموو کاتێکا سەرکەوتووبێ هەموو ئادەمیزاد دوای ئەکەون، لەو کاتەدا جیاوازی نەئەبوو لەنێوان مرۆڤێکی خراپ کە دوای ڕاستی بکەوێ لەبەر سوودی تایبەتی خۆی و بازرگانی پێوە کردنی و لەنێوان مرۆڤێکی پاك کەدوای بکەوێ

هەر لەبەرئەوەی ڕاستە و لەڕێگەی ڕاستیدا ئازارو سەختی زۆر هەڵگرێ ، بەڵام کاتێ جیا ئەکرێنەوە تووشی شکان و ئازار بن و ئەو کاتە مرۆڤێ پیس و پاك جیا ئەکرێنەوە .

دووبارە ئەگەر خوای مەزن هەموو کاتێ ئازار بدا بەسەر پیاو خراپاندا لەبەرکاری خراپیان ، ئازار و ئێشی لەپیاو چاکان دووربخستایەوە لەبەر چاکەیان ، داواکردنی پەرستنی خواو پاداشت و سزادان پوچ و بێمانا ئەبوو ، چونکە پەیڕەوی کردنی چاکە لەوکاتەدا بەزۆرو تەوەزمی بووە . نەك بەمەبەست سەربەستی خۆی.

بەپوختە یی و کورتی پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانان لەماناکانی قورئان ووردبینەوە ، لەماناکانی قورئان ترازاو بێ وەربگرن بۆ بیرو باوەڕی خۆیان ، سەرکەوتن و ژێرکەوتن و هێز و لاوازی خۆیان بەڕوناکی ئەوترازاوە بکێشن ، بێگومان هەردوو لایان ڕێگەی تایبەتی خۆیانیان بۆ دیاریکراوە ، چاك و خراپیان ناسیوە ، ڕێگەی چاکە بکەن ، بەدەستوور بۆ خۆیان ، ڕێگەی خوار و خێچ واز لێ بهێنن ...

**بەیاریدەی خوا لەم بەرگە بوومەوە ڕۆژی دووشەممە**

**( ٦ / ٩ / ١٩٩٨ ی زاینی )**

## ﴿ پێڕست ﴾

| ٢٧٨ | بۆ سەر شۆڕی دراوە بەسەر جوولەکەکاندا و نەدراوە بەسەر بێ باوەڕانی تردا. |
|---|---|